

٧



# مێژوو

گۆڤارێکی مێژوویی وەرزییە،

کۆمەڵەی رۆشنبیری مێژوویی کوردستان دەریدەکات





ژمارە ١٦
ساڵی چوارەم
پایزی ٢٠١٠

# مێژوو

گۆڤارێکی مێژوویی وەرزییە، کۆمەڵەی رۆشنبیریی مێژوویی کوردستان دەریدەکات

**خاوەنی ئیمتیاز**

پرۆفیسۆر د. ئەرسن موسا رەشید

**سەرنوسەر**

د. محەمەد عەبدوللا کاکەسوور

٤٧٨٠٥٣٨

makakasur@yahoo.com

**سکرتێری نووسین**

م. فارس قادر فەقێ عەبدوللا

**دەستەی نوسەران**

پ.ی.د. دلێر ئەحمەد (زانکۆی سلێمانی)

پ.ی.د. ئەبەز مەجید

پ.ی.د. موسا مستەفا (زانکۆی دهۆک)

پ.ی.د. سەلام حەسەن خۆشناو (زانکۆی سەلاحەددین)

پ.ی.د. ئەحمەد عەبدولعەزیز مەحمود (زانکۆی سەلاحەددین)

پ.ی.د. ئاکۆ برهان محەمەد (زانکۆی کۆیە)

د. حەکیم ئەحمەد مام بەکر(زانکۆی سەلاحەددین)

د. دلێر فرحان ئیسماعیل(زانکۆی سەلاحەددین)

د. فەرسەت مەرعی(زانکۆی دهۆک)

**بەرگ ونەخشەساز**

هیمداد محەمەد ئەرگوشی

ژمارە (١٦) سالی چوارەم پایزی ٢٠١٠






**هەموو ئەو بابەتانەی لە گۆڤاری مێژوو بڵاودەبنەوە نوسەرەكانیان لێیان بەرپرسیارن تەنیا سەروتار نەبێت كە گۆڤاری مێژوو لێی بەرپرسیارە**

♦ گۆڤار : مێژوو
♦ ژمارە : [ ١٦ ]
♦ تیراژ : [ ٥٠٠ ] دانە
♦ چاپخانە : منارە – (٠٧٥٠٤٤٥٦٢٩٧)

**كوردستان / هەولێر - كۆڵانی بەرامبەر بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردەی هولێر**
g.mezhu@yahoo.com
g.mezhu@hotmail.com

# پێرست

سەروتار

مێژوونووسی هونەری

## ◀ توێژینەوە



## ◀ القسم العربي

## ◄ کەشکۆڵی گۆڤار

# مێژوونووسی هونەری

سەرنووسەر

هونەر بەشێکی گرنگە لە مێژووی هەر نەتەوەیەك، بەشێوەیەکی وردتر بەبەشێکی گرنگ لە مێژووی شارستانی دادەنرێت. کوردیش لە ڕووی هونەرەوە لە لقە جۆربەجۆرەکانی هونەر بە تایبەتی گۆرانی، مۆسیقا، شانۆ، دراماو شێوەکاری...تد کەموزۆر بەرهەمی هەبووە. بەڵام بەداخەوە مێژووی هونەری کوردی زۆر نارِوون و تەمومژاوییە، هۆکاری سەرەکی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کەکورد تاکو ئێستا مێژوونووسی هونەری نییە ئەگەر چی ژمارەیەکی بەرچاو مێژوونووسمان هەیە کە پتر لەبواری سیاسی و کەمتر لە هەندێ بواری مێژووی شارستانی کوردییان نووسیوە .

بۆ نموونە تاکو ئێستا مێژووی شانۆی کوردی، گۆرانی و مۆسیقای کوردی، درامای کوردی ئەگەر چی لەلایەن هەندێ خەڵکی دڵسۆزەوە نووسینیان لەسەر هەیە بەڵام پتر لەلایەن هونەرمەندان و هونەردۆستان و ئەدیبەکانەوە نووسراون، نەك لەلایەن مێژوونووسانەوە بۆیە بەشاهێدی خودی نووسەری ئەم نووسینانەش نووسینەکان لە کەموکوڕی بەدەر نین ئەگەر چی دڵسۆزی و ماندووبوونی زۆریان پێوە دیارە .

بۆنموونە گۆرانیبێژێکی ناوداری کوردی وەکو حەسەن زیرەك کە زیاتر لەهەزار گۆرانی تۆمارکراوی هەیە لە هەندێك لە گۆرانیەکانی کوردایەتی دەکات و لە گۆرانی تردا ستایشی (محمد رەزا) شای ئێران دەکات، ئەرکی مێژوونووسی هونەری ئەوەیە کە بارودۆخ و ڕەوشی وتنی هەریەك لەم گۆرانیانە دیار بخات کە ئایا بەباوەڕەوە کوردایەتی کردووە یان لە ژێر فشارەوە

ستایشی شای ئێرانی کردووە، ئەمەی لەسەر حەسەن زیرەك ووترا دەگرێ سەبارەت بەچەندین گۆرانیبێژی تری کورد بوترێ .

مێژوونووسی هونەری دەبێت بەدیاری بخات کە چەندین بیروبارەوەری چەپ راست ئایینی نەتەوەیی کاریگەرییان بەسەر درامای کوردی هەبووە، وێنەی دەرەبەگ کرێکار مامۆستا جووتیار چۆن لە درامای کوردی رەنگی داوەتەوە. لە درامای کوردی چۆن ڕوانراوەتە سەردەمی پاشایەتی و ئینگلیز لە عێراقدا .

مێژوونووسی هونەری لەسەریەتی ڕوونی بکاتەوە کە ئایا چەند هونەر لە واقیعی سیاسی و کۆمەلایەتی و ئابووری و ئایینی کۆمەڵگای کوردی گەیشتووەو بەباشی مامەڵەی لەگەڵدا کردووە و ئایا هونەر تا چەند رەنگ دانەوەی کۆمەڵگای کوردی بووە .

نەبوونی مێژوونووسی هونەری زیانیکی زۆر بەمێژووی کورد بەگشتی و هونەری کوردیش دەگەیەنێ بۆیە هەرچی زووە پێویستە کار بکرێت بۆ پێگەیاندنی مێژوونووسانی هونەری .

# مێژووی هونەری تەلارسازی لە دەوڵەتی عوسمانی

هۆشەنگ ساڵح نەجار

تەوەرەی یەکەم:

کورتەیەکی مێژووی سەرهەڵدان وگەشەکردنی هونەری تەلارسازی عوسمانی:

عوسمانییەکان وەك هەرشارستانیەتێکی دیکە، بایەخیان داوە بە(هونەری تەلارسازی) ،چونکە ئەوان نەك هەرشارستانیەتێکی کارتێکراوو تێکەڵ بەشارستانیەتەکانی دەوروبەری خۆیان بوون، بەڵکو فراوانی سنووری جوگرافیاو وسەرکەوتنە گەورەکانیان کەشانازی دەوڵتێکی گەورەی پێ بەخشین ڕاستەوخۆ هانیدان تاوەکوو هەوڵ بدەن لەم بوارەدا پێشبکەون وکێبرکێی وڵاتانی ڕکابەریان بکەن.

ئەگەرچی ئەوان لەم هەنگاوەیان سوودیان لەلێهاتوویی دەوروبەریان وەرگرتبێ، بەڵام هەوڵیانداوە مۆرکی خۆشیان بەسەر بوارەکەوە دیاربێت، بەنموونە ئەگەر (سوڵتان محمدفاتح ١٤٥١-١٤٨١)وەربگرین دوای گرتنی شاری (قوستەنتینیە)کلێسای (ئەیاسۆفیا)ی گۆڕی بۆمزگەوت (کەبەشێوازی هونەری بێزەنتی )دروست کرابوو، بەڵام ئەم سوڵتانەی عوسمانی هات چوار منارەی بۆمزگەوتەکە دروست کرد.(منارە)هەم هونەرێکی تەلارسازی شارستانی ئیسلامییە هەم عوسمانیەکان کردیانە دروشمێك بۆ سەپاندنی مۆرکی شارستانی خۆیان بەسەر کلێساکە(١).

سەبارەت بەسەرەتاکانی دەرکەوتنی هونەری تەلارسازی لای (عوسمانیەکان)،(خەلیل ئینالجیك)ئاماژە بەوە دەکات کە مێژووی تەلارسازی

لای عوسمانیەکان لەگەڵ گرتنی هەردووشاری (بۆرسە)و(ئەدرنە) دەستپێدەکات(٢) واتە لەسەراتاکانی دەسەلاتی( ئۆرخانی کوری عوسمان) کە هێشتا باوکی مابوو، توانی لەساڵی ١٣٢٦ز ئەو شارە بگرێت ،لەسەردەمی (مورادی یەکەم)ی کوری(ئۆرخان)یشدا (ئەدرنە)گیرا (٣).

کەوایە ئەگەر بەپێی ئەو سەرچاوەیە بێت،دەبێت لەپێش گرتنی (بۆرسە)، (هونەری تەلارسازی)لەناو دەوڵەتی عوسمانیدا بوونی نەبووبێت، ئێمە ئەگەر لەو خستنەرووەی (ئینالجیك)وورد بینەوە کەبووەتە سەرچاوە بۆ دەیەها توێژینەوەی دیکە دەبینین زیاتر مەبەستی ئەوەیە کەلەو ساتەوە ئەم لایەنە هونەریە گەشەی کردووە وبایەخی زیاتری پێدراوە، ئەگەرنالەپێشدا عوسمانیەکان کە میرنشینێکی سەرسنووری بوونە لە ژێر کاریگەری هونەری ئیسلامی سەلجووقی شارەکانیان ئاوەدان بوەو سیمای تەلارسازی پێوە دیار بووە (محمد فوئاد کۆپرلی)لەو بارەیەوە دەڵێ(شارەکانی دەوڵەتی سەلجووقی لەئاسیای بچووك لەسەدەی سێزدەهەم لەپلەیەکی پێشکەوتوو دابوونە)(٤)

پاشان باس لەوە دەکات کە شارەکان (نەخۆشخانەوچێشتخانەوتەکیەو قوتابخانەوشوێنی سەربازی وکۆشکی میرو فەرمانڕەوایەکانی لێبووە)(٥)، ئەمەش هەرهەمووی پێویستی بەتەلارو بینای تایبەت هەبووە بێگومان شێوازی دروستکردنی هەریەك لەم تەلارانەش پەیوەست بووە بە هونەری شارستانی ئیسلامی (سەلجووقیەکان) .ئێمە لێرەدا ناچینە ناو وردەکاری سەرەتای پەیدابوونی (عوسمانیەکان) تا ئاماژە بەسەرەتاکانی کاریگەری سەلجوقیەکان بەسەر (عوسمانیەکان) بکەین، بەلام بلێین ونەڵێین (عوسمانیەکان)یش لەسەرەتادا میرنشینێکی ناو قەڵەمڕەوی (دەوڵەتی سەلجووقی) بوونە شارو ئاوەدانیەکانیان لەناو هەمان قەڵەمڕەوی دابووە(٦)، بێگومان لەسەر ئەو بنەمایە دەکرێ بڵێین شارو ئاوەدانیەکانی (دەوڵەتی عوسمانی)ش لەو خاسڵەتانە بێبەش نەبوونە کەلەناوچەکانی دیکەی ئەنادۆڵدا هەبووە .

(احمد عبدالرحيم مصطفي)لەكتێبەكەی (في اصول التاريخ العثماني)ئاماژە بەوە دەكات كە (عوسمان_دامەزرێنەی دەوڵەتی عوسمانی) پاش گرتنی شاری (ئەسكی شەهر) مزگەوتێك لەو شارە دروست دەكات وزانایان وفەرمانبەرانی بواری شەریعەتی لیَ دادەمەزرێنیَ(٧) ئەمە سەرەڕای دروستكردنی ئەو شوراو قەلأیانەی كە (عوسمان)لە كاتی گرتنی (قەرەحەسار)وشاری(یەنی شەهر_شاری نویَ)دروستی كردن هەمووشیان یەك لەدوای یەك دەبوونە پایتەختی دەوڵەتی عوسمانی(٨).

كەوابوو دەكریَ بلێین ئەم لایەنەهونەریە پێش گرتنی (بۆرسە)لەلایەن عوسمانیەكانەوە هەبووە بەڵام دوای گرتنی(بۆرسە)وەك لایەنێكی ئاواكاری، خاڵی گەشەسەندنی تەلارسازی دەوڵەتی عوسمانی بووە (٩) .

گرنگترین ئەو تەلارانەش كەلەوە بەدوا وەك دیاردەیەك لەدروستكردنی شاردا بەدیار كەوت وەك(مزگەوت ونەخۆشخانەوكۆشك تەلاری میرەكان....)هەروەها شوێنی دیكەش هەبوون وەك (خان وبازاڕوكاروانسەراوگەرماوو ئاش ....)ئەم شوێنانە هەریەك تەلاری تایبەت بەخۆی هەبووە.كەعوسمانیەكان زۆر گرنگیان پێداوە ولەزۆربەی مەڵبەندوئاواییەكانیان ڕەنگی داوەتەوە.كەئەمەش شارستانی عوسمانیەكان لەوانیدیكە جیادەكاتەوە، بەتایبەت لە(ئەنادۆل وبەلقان)، (١٠)دەبیَ ئاماژە بەوەش بكەین كە دروستكردنی زۆربەی ئەو تەلارانە لەناو دەوڵەتی عوسمانی لەسەر بنەمای وەقف وخۆبەخشی دروستكراون.ئەم كاری خۆبەخشیەش كاریگەریەكی ئەرێنی گرنگی لەسەر لایەنی ئاواكاری وئابووری دەوڵەتی عوسمانی ودەوڵەتانی ئیسلامی لەپێش دا بەجێهێشتبوو(١١).

(ئۆرخان)كاتێك (بۆرسە)دەگرێت دەیكات بەپایتەختی نویێ خۆی ولەساڵی ١٣٢٧زبەدواوە جگە لەمزگەوت وقوتابخانە،باڵەخانەی مەڵبەندی بازرگانی وبازاڕی لیَ دروست دەكات .بەجۆرێك كاتێك (ئیبن بەتوتە)ی گەڕیدە، لەساڵی

١٣٣٣ز بەو شارەدا تێدەپەڕێت، ئاوا وەسفی دەکات کە(شارێکی گەورەیە وبازاڕو شەقامی فراوان وڕێك وپێکی تێدایە )(١٢)بۆیە دەتوانین بڵێین ئەم بایەخەی عوسمانیەکان بەلایەنی ئاواکاری ونەخشەی شاردا لێرەوە زیاتر پەرەدەسێنێت ودەبێتە سەرەتای ئەم بایەخپێدانە کاتێك دەوڵەتی عوسمانی بەرەو ناوجەرگەی ئەورووپا هەڵکشا(١٣).

هەروەها سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە(ئۆرخان)دوای گرتنی شاری (فیلۆکران)لە٢ئاداری ١٣٣١ز فەرمان دەدا بەچاکردنەوەی باڵەخانەکان وشوراکانی شارەکەو کەنیسەکانیشی دەکات بەمزگەوت وقوتابخانە ئەمە جگە لەوەی ئۆرخان چەندەها تەکیەوقوتابخانەو مزگەوتی نوێی دروستکرد،هەموو ئەوانە ئاماژەن بەبایەخی ئۆرخان بەلایەنی تەلارسازی وئاواکاری(١٤).

سەردەمی (مورادی یەکەم)کوڕی(ئۆرخان)کەپێگەی عوسمانیەکان بەتەواوی دەچێتە بەشی ئەورپا، زۆر ناوچە لەلایەن عوسمانیەکانەوە لەهەردووبەشی ئاسیای بچوك وئەورووپا دەستیان بەسەردا دەگیرێت. لەهەرهەموویان پرۆسەی ئاواکاری وتەلارسازی دەوڵەتی عوسمانی پلەبەپلەبەرەو گەشەسەندن دەچێت. بەنمونە (مورادی یەکەم)لەساڵی ١٣٦١ز(ئەدرنە)دەگرێت ودەیکات بەپایتەختی نوێی عوسمانیەکان، بەهۆی شوێنی گرنگی جوگراف وستراتیژی شارەکە دەبێتە جێگەی گرنگی وبایەخپێدانی عوسمانیەکان(١٥) لەقۆناغەکانی دواتردا چەندین باڵەخانەی بەمەبەستی قوتابخانەو مزگەوت لێدروست دەکرێت بەتایبەت لەسەردەمی (سوڵتان بایەزیدی یەکەم ومورادی دووەم)کەدەبنە نمونەیەکی باڵای تەلارسازی عوسمانی لەناوچەکە لەوانە مزگەوتی (ئاسکی جامع ومورادیەوئۆتش شرفلی جامع..)(١٦)هەرخودی بایەزیدی یەکەم ومورادی دووەم زۆر بایەخیان بەلایەنی تەلارسازی داوە (بایەزیدی یەکەم)لەنێوان ساڵانی ١٣٩٦-١٣٩٩ز گەورەترین مزگەوت لە بۆرسە بەناوی (ئۆلۆجامع)دروست دەکات کەیەکێکە

لــەجوانترین مزگەوتــەکانی ئەوشــارە (مــورادی دووەم)یــش لەســاڵی ١٤١٤ز لەسەردەســتی تەلارســازێك بــەناوی (حــاجی علاءالــدین)مزگــەوتێکی گــەورە لـە(ئەدرنـە)بـەناوی(ئاسـکی جـامع)دروسـت دەکـات(١٧) ئەمـە سـەرەڕای ئـەوەی سـەردەمی (سـوڵتان محمـدی یەکـەم١٤٠٢-١٤٢١ن)یـش زۆر سـیمای تەلارسـازی بەرچاو دەکەوێ لەوانە مزگەوتی (بایەزیدپاشا)لە(ئەماسیە)(١٨).

سـەردەمی (سـوڵتان محمـد فـاتح) یـش بەسـەردەمی درەوشـانەوەی لایـەنی تەلارسازی دەوڵەتی عوسمانی دادەندرێت نەك لەبەر ئەوەی ئەم هونـەرە گەیشتە ئاستێکی هەرە پێشکەوتوو، بـەڵکو لەبـەر ئـەوەی کـەلێرەوە قۆناغـە گرنگـەکانی هونەری تەلارسازی وبایەخە چڕوپڕەکەی لەسەردەمی(فـاتح)وسـوڵتانەکانی دواتـر دەستیان پێکرد ،بایەخی (سوڵتان محمد فاتح) زۆر فراوانتربوو بەوەی کەلـەبواری هونەریدا تەنها بایەخ بەلایەنی تەلارسازی بـدات.بـەڵکو ئـەوهات لـەزۆر بوارەکـانی دیکەی هونەری دەوڵەتی عوسمـانی بـەرەو پێشەوە بـرد.بۆیـە توێـژەران کـەباس لەلایەنی هونەری دەوڵەتی عوسمانی بەشێوەیەکی گشتی دەکەن ،دابەشی دەکەنە سەر شەش قۆناغ سەرەتا لەسەردەمی (سوڵتان محمد فاتح)ەوە دەست پێدەکەن ناوی دەنێن(ماوەی یەکەم ١٤٥١-١٥٧٤)واتە تـاکوو کۆتـایی دەسـەڵاتی (سـولتان سەلیمی دووەم)(١٩) .ئـەو ماوەیـەش بەهاتنـە سـەرتەختی سـوڵتانە بـەهێزەکانی عوسمانی دەناسرێت وەك (سـەلیمی یەکـەم١٥١٢-١٥٢٠)وسـلێمانی دووەم١٥٢٠-١٥٦٦)(٢٠)، لـەگرنگترین تایبەتمەندیـەکانی هونـەری تەلارسـازی عوسمـانی دوای گـرتنی (قوسـتەنتینیە)کاریگـەری هونـەری(بێـزەنتی)بـوو، کەبەئاشـکرا ڕەنگـی دەدایــەوە(٢١) بــەڵام بەتێکــەڵ بــوون لەگــەڵ مۆرکــە ئیــسلامیەکە چــونکە عوسمانیـەکان خۆیـان هـەڵگری ئـەو مۆرکـە بـوون بۆیـە لەقۆناغـەکانی دواتـردا ئەوانیش کاریگەریان بەسەر ئەم لایەنە هونەریە بەتایبەت لەبەلقان جێهێشت.

(سولتان محمدفاتح)پاش ئەوەی ساڵی ١٤٥٣ز(قوستەنتینەیە)ی گرت کلێسای

گەورەی شارەکەی (ئەیاسۆفیا)کە(کلێسای ڕۆژهەلاتی –ئەرسەدۆکسی)بوو گۆڕی بۆ مزگەوت سەرەڕای گۆڕینی سیمای کلێساکە بۆ شێوازی سەلجووقی کە عوسمانیەکان پێشتر پێی کاریگەر بوون(٢٢).

ئەمە جگە لەدروستکردنی باڵەخانەیەکی گەورە لە(قوستەنتینەیە _کەدواتر ناوەکەی بووە ئەستەنبۆڵ)کە نزیکەی (١١٨)دوکان وکۆگایەکی گەورەی لەخۆوە دەگرت کە ناسرابوو بە(بزستان)(٢٣)،کە دواتر لەزۆربەی شارەکانی دیکەش دروستکرا کەوەکوو مەرجێکی لێهاتبوو دەبوایە هەموو شارێکی عوسمانی مزگەوت وئەم بزستانەی تێدا بوایە یەکێك لەکارەکانی دیکەی (محمد فاتح)ئەوەبوو داوای لەپیاوانی دەوڵەت کرد کە هەر یەك لەشوێنێکی ئەستەنبۆڵ تەلارێك دروست بکات بەمەبەستی زیاتر جوانکردنی شارەکە ئەمە جگە لەدروستکردنی دەیەها تەلاری دیکە بۆ نەخۆشخانە وقوتابخانە وگەرماووئاش وبەدەیەها مزگەوت وشوێنی ئاینی دیکە(٢٤) ،هەموو ئەوانە ڕۆڵی (سوڵتان محمد فاتح)لەلایەنی ئاواکاری وتەلارسازی لەمێژووی دەوڵەتی عوسمانی بەرزدەکەنەوە.

دوای (سوڵتان محمد فاتح)یش (بایەزیدی دووەم)دێت ئەمیش جێگا دەستی بەسەر هونەری تەلارسازی مێژووی دەوڵەتی عوسمانی دیارە یەکەم مزگەوت کە لەژێر کاریگەری مزگەوتی (ئەیاسۆفیا)دروست کرابێ مزگەوتەکەی (سوڵتان بایەزیدی دووەم)ە.ئەم مزگەوتە دەکەوێتە(ئەستانبۆڵ)لەنێوان ساڵانی (١٥٠١– ١٥٠٧) دروستکراوە یەکێکە لەشاکارە ئەندازەییەکانی سەردەمی (سوڵتان بایەزیدی دووەم)(٢٥).

(سوڵتان سەلیمی یەکەم ١٥١٢–١٥٢٠)فتوحاتەکانی دەوڵەتی عوسمانی بەرەو خۆرهەلات گواستەوەونازناوی(خەلیفە)ی هەلگرت(٢٦).لێرە بەدواوە کاریگەری (هونەری سەفەوی ومەمالیکی) بەسەر هونەری عوسمانی دیاردەکەویّ بۆیە لەدروستکردنی کۆشك وتەلارەکانی سەردەمی(سوڵتان سەلیم) سوود لەئەندازەی

(ئێرانی ومیسری) وەرگیراوە(٢٧).

سەردەمی (سوڵتان سلێمانی قانونی)یش بەسەردەمی زێرینی تەلارسازی دەوڵەتی عوسمانی دادەندرێ.یەکێك لەشاکارە هونەریە ئەندازەییەکانی سەردەمی (سوڵتان سلێمان)کە ناوبانگێکی گەورەی هەم بۆ سەردەمی خۆی وهەم بۆمێژووش تۆمارکرد، مزگەوتی (سلێمانی)یە ئەم مزگەوتە لەژێر سەرپەرشتی ئەندازیارێك بەناوی (سینان ئاغا)دروستکراوە، مزگەوتەکە بەشێکە لەو کۆمەڵگایەی کەلەساڵی ١٥٥٠دەست بەدروستکردنی کراوە وحەوت ساڵی خایاندووە تاتەواو بووە، (٣٥٠٠)کرێکار لەدروستکردنیدا بەشداربوونە سەرچاوەکان دەڵێن دوای تەواوبوونیشی، (سوڵتان سلێمان) خۆی داوای لەسینان کردووە تابۆ یەکەم جار بیکاتەوە کاتێك (سینان)دەیکاتەوە سوڵتان زۆر سەرسام دەبێ وهاوار دەکا:(یافتاح یاربی..)ئەم مزگەوتە لەهۆڵێکی گەورەو چەندین گومەزی گەورەوڕازاوە وچەندین بەشی دیکەپێك دێت ئەمە جگە لەونەخشە کاریە سەرسورهێنەرەی بۆی کراوە ،لەگەڵ ئەو ئەستوونگە نایابانەی کە بنمیچی مزگەوتەکەیان ڕاگرتوە.کتێبخانەی (سولەیمانیە)کەوتۆتە بەشی باشووری مزگەوتەکە کەبەگەورەترین کتێبخانەی ولاتی تورکیا دادەندرێ.سەرەڕای تەلارەکانی وەك چێشتخانەوگەرماوو..)(٢٨).

هەروەهالەسەردەمی (سوڵتان سەلیمی دووەم)یش هەمان ئەو ئەندازیارە (سینان)سەرپەرشتی دروستکردنی مزگەوتی (سەلیمیە)ی کردووە لە(ئەدرنە).ئەم مزگەوتە گومەزێکی گەورەی بەقەدەر گومەزی (ئەیاسۆفیا)ی هەیە، جگە لەچەندین پەنجەرەی گەورە کە ڕوناکیەکی گەورە دەخەنە سەر حەرەمی مزگەوتەکە کەنموونەی ئەندازەگەریەکی داهێنەرانەیە(٢٩).

ئەم شێوە کارکردنەی (سینان) لەدوای مردنیشی لەساڵی ١٥٨٨ز ،هەربەباوی مایەوە بەنموونە مزگەوتی(سوڵتان ئەحمەدی یەکەم)کەلەساڵی ١٦١٧لەلایەن

ئەندازیار(محمد ئاغا)وە لە (قوستەنتینەیە _ئەستانبۆڵ) دروستکراوە، هەمان شێوەی کارکردنی (سینان)ی هەیە لەدەوروبەری مزگەوتەکە شورایەکی بەرز هەیە سێ ڕێگای چوونە ژوورەوەی هەیە بەڵام ئەوەی ئەم مزگەوتەی سوڵتان ئەحمەد جیادەکاتەوە ئەوەیە کە شەش منارەی بەرزی هەیە کەبەڕەنگی شین بۆیە کراون(٣٠).

ئەم چەشنە هونەرکاریەی عوسمانیەکان لەبواری تەلارسازی لەسەرتاسەری جیهانی ئیسلامی بلاوبۆوە.بۆنموونە مزگەوتی (سینان پاشا)مان هەیە لە(بۆلاق)کەلەساڵی ١٥٧١ز دروستکراوە، هەروەها (مزگەوتی محمد عەلی پاشا)لە(قاهیرە)ی پایتەختی (میسر)، بەهەمان تایبەتمەندی هونەری عوسمانی کاریگەرە(٣١)، هەروەها لە(سوریا)ش هەریەك لە(تەکیەی سولەیمانیە ودەروێشیەوکۆشکی گەورەی خان ئەسعەدپاشالەدیمەشق وخەسرەیەوخانەکانی حەلەب ومەعدە )لەسەرشێوازی هونەری تەلارسازی عوسمانی دروستکراون(٣٢).

تەوەرەی دووەم

سەرچاوەکانی هونەری تەلارسازی عوسمانی :

هونەری تەلارسازی عوسمانی وەك زۆربەی هونەری دەوڵەتانی دیکەی مێژوو،لەخۆیەوە بەبێ کاریگەری هونەری شارستانیەتەکانی دیکەی دەوروبەری دروست نەبووە، بەڵکو ئەویش هەرلەسەرەتاوە کاریگەر بووە بەهونەری شارستانیەتەکانی دیکە. بەنمونە ئێمە باسمان لەسەلجوقیەکان کرد کەچەند کاریگەریان بەسەر هونەری تەلارسازی عوسمانیەکان هەبووە، بەتایبەت لەسەرەتادا ئەمەش راماندەکێشێتە ناوتەوەرەیەکی تایبەت بە ناسینی سەرچاوەکانی تەلارسازی دەوڵەتی عوسمانی کەبریتیە لە :

یەکەم:هونەری تەلارسازی ئیسلامی:

هونەری تەلارسازی ئیسلامی دابەش دەبێتە سەر چەند قۆناغێك

لەهەرقۆناغێکی مێژووی خۆیدا قەوارەیەك یان دەوڵەتێك رابەرایەتیان کردووە، بەنموونە ئەمەویەکان وعەباسیەکان نموونەی دووقۆناغی جیاواری ئەم چەشنە هونەرەی شارستانی ئیسلامین هەریەکەیان تایبەتمەندی خۆی لەم بوارەدا هەبووە، بەڵام هەندێ تایبەتمەندی بنچینەیی هەبووە وەك خۆی ماوەتەوە بەنمونە مزگەوت کە شوێنی نوێژکردن وخواپەرستی وبۆنە ئاینیەکان بووە، تەلارێکی تایبەتی بۆدروستکراوە، لەهەموو جیهانی ئیسلامی ئێستاشی لەگەڵ دابێت رەگەزەکانی مزگەوت بریتین لە(منا رە،گومەز،حەرەم)بەڵام شێوازو رخساریان لەیەك جیاوازە هەرقۆناغێك لەژێر کاریگەری لایەنێکی دیکە پەرەی بەهونەرەکە داوە، گرنگترین تەلاری ئیسلامیش جگە لەمزگەوت بریتیبوون لە:

١-مەزارگە(الضریح):شوێنی مردوو ناشتن بەتایبەت ئەوانەی خاوەن رێزوپایەی ئاینی وکۆمەڵایەتی بوونە ،(مەزارگە) لەقۆناغەکانی دواتری شارستانی ئیسلامی دا بایەخی پێدراوە زۆربەی جار لەشێوەی گومەزێك دروستکراوە کە بنمیچێکی کەوانەیی هەبووە زۆرجار وەك پاشکۆی مزگەوتەکان دروستدەکرا عوسمانیەکان بایەخیان پێداوە(٣٣) ،وەك( ئارامگەکەی بایەزیدی یەکەم_یەڵدرم)لە(ئەستەنبوڵ)(٣٤).

٢-قوتابخانە:شوێنی خوێندنی زانستە ئاینی وزانستەکانی دیکەش بووە، پێك هاتبوو لەژوورەکانی وانە وتنەوەو ژووری حەوانەوەی وانەبێژان وقوتابیان زۆر جاروەك پاشکۆی مزگەوتەکان دروستکراون زۆرجاریش سەرەبەخۆبوونە وەك قوتابخانەی (نیزامیە)لەبەغدا (٣٥).یەکەم تەلاری قوتابخانەی عوسمانی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی (سوڵتان محمد فاتح)لە(ئەستەنبوڵ)(٣٦).

٣-تەکیەخانەقا:ئەوشوێنەیەکەلەلایەن شێخ ورێبەرانی تەریقەت وموریدەکانیان بەکارهاتووە بۆ شوێنی خواپەرستی وزیکروئیرشاد بەکارهاتووە.

٤-خان وکاروانسەراوبازارەکان: زیاتر لەشاروشارۆچکەکان هەبوونە (خان)

تەلارێکی تایبەت بووە بەمیوان وئەوکاروانانەی ڕوویان لەشارەکان دەکرد هەروەها وەك بازارێکیش بووە بۆساغکردنەوەی کەل وپەلەکانیان.بەمەبەستی بازرگانی ،هەروەها لەرێگاوبانەکانیش کاروانسەراهەبووە بۆ پشوودان وحەسانەوەی کاروانەکان(٣٧) ، عوسمانیەکانیش بایەخیان بەوچەشنە (خان)انە،داوە (بزستان)ەکان کەلەشارەکان دروستدەکران نمونەیەکی نزیك بەوخانانەن (٣٨).

٥-گەرماوەکان:لەزۆربەی شارەکان هەبووە شوێنی تایبەتی خۆشوشتن بووە بەدیزاینێکی تایبەتی دروستدەکرا لەجیهانی ئیسلامی وعوسمانیەکانیش بایەخیان پێداوە(٣٩) .

٦-ئەمە سەرەرای کۆشك وتەلارەکانی کاربەدەست وفەرمانڕەواکان کەبەشێوازێکی بایەخپێدراو دروست دەکراولەچەندین یەکە پێك دەهات .

هەموو ئەوانە جگە لەوەی لەناو دەوڵەتی عوسمانی بوونیان هەبووە کاریگەری هونەری ئیسلامیشیان بەسەرەوە بووە .ئەمەش بەڵگەیە لەسەر کاریگەری ڕاستەوخۆی هونەری ئیسلامی بەسەر هونەری تەلارسازی عوسمانی.

بەشێوەیەکی گشتی ئەوڕەگەزانەی ناو شارستانی ئیسلامیش کە لەڕووی هونەری تەلارسازیەوە کاریگەریان بەسەر عوسمانیەکانەوە هەبووە بریتین لە:

١- کاریگەری هونەری تەلارسازی عەرەبی ئیسلامی

هەرلەسەردەمی پێغەمبەری ئیسلامەوە (محمد(د.خ)تادەگاتە خەلیفەکانی راشیدین وئەمەوی وعەباسی ئەم چەشنە هونەرە درێژەی دەبێ کە گرنگترین رەگەزەکانی بریتیە لەمزگەوت وگرنگترین رەگەزەکانی مزگەوتیش بریتیە لە:

ا-منارە:لەگرنگترین رەگەزەکانی دروستکردنی مزگەوتە کەمۆرکێکی تایبەت بەم چەشنە هونەرە دەبەخشێت لەگرنگترین ئەومنارانەش هەمان منارەی (مەلویە لەسامەرا)ومنارەی (چوارگۆشەیی مزگەوتی ئەمەوی لەدیمەشق) ومنارەکانی (مزگەوتی موستەنسریە لەبەغدا)و(ئەزهەرلەمیسر)و(موزەفەریە لەهەولێرو..)

منارە لەدەوڵەتی عوسمانیش بووەتە یەکێك لەخاسڵەتە گرنگەکانی هونەری تەلارسازی عوسمانی زۆرینەی مزگەوتەکانیان (منارە)ی هەبووە بەڵام بەشێوازومۆرکی تایبەت وجیاواز وەك منارەی مزگەوتەکانی (بایەزیدوسەلیمیەوسولەیمانیەوئەحمەدیە..)ڕاستەخۆ ئەم هونەرەشیان لەسەلجوقیەکان وەرگرتووە(٤٠).

ب-گومەز(القباب):دیسانەوە یەکێکە لەمۆرکەکانی ئەم چەشنە هونەرە، ئەمەویەکان بایەخیان پێداوە لەکۆنترین گومەزەکانی هونەری تەلارسازی ئیسلامی بریتین لە (گومەزی نەسر)لە(دیمەشق) وگومەزی (قبەصخرە)لە(قودس)کەنمونەی گومەزە ناودارەکانی مێژووی هونەری ئیسلامین ،بەڵام لەسەردەمی مەمالیکەکان لە(میسر)گومەزی شێوە(نیوهێلکەیی-نصف بیضوي)پەیدابوو ، لەئێرانیش شێوەی (هێلکەیی تەواو- بیضوي)لەسەردەمی عوسمانیەکانیش هەمان نیو بازنەیی بوو بەڵام پەنجەرەی هەبووە(٤١).

ج-شێوەی کەوانەیی:زۆربەی ڕەگەزەکانی هونەری یەئیسلامی لە گومەزومنارەوە بگرە تادەگاتە دەرگاوپەنجەرەوئەستونگەوتەنانەت نەخشی سەر دیواروبنمیچەکانیش لەتەلارەکانی دیکەی جگە لەمزگەوتیش شێوەیەکی نیو کەوانەیی وهەندێ جار کەوانەیی وەردەگرن، ئەم خاسڵەتە وەنەبێ تەنها لەهونەری ئیسلامیدا هەبێت بەڵام دەبێتە یەکێك لەمۆرکە بنچینەییەکانی هونەری ئیسلامی تا ئێستاشی لەگەڵ دابێت هەرباوە.لەهونەری تەلارسازی عوسمانیش هەمان خاسڵەت بەزەقی بەرچاو دەکەوێ.

د-خۆشنووسی وزەخرەفە:ڕازاندنەوەی دەرگاودیواروبنمیچ وگومەزومنارەکان بەهونەری زەخرەفەوخۆشنووسی دەڕازێندرایەوە کە دەقەکانی قورئانی پیرۆزوفەرموودەو وتەی پیاوچاکان وهەندێجار شیعری ستایشی شاعیرانیش دەنووسرایەوە.عوسمانیەکان زۆربایەخیان بەم لایەنە دەدا مزگەوتە کانیان

بەهونەری خۆشنووسی و وزەخرەفە دەرازاندەوە(٤٢).

٢- کاریگەری هونەری تەلارسازی سەلجووقی:

سەلجووقیەکان کەدەوڵەتێکی ناوشارستانی ئیسلامی بوونە وهەرلەسەدەی یازدەهەمی زاینیەوە دەسەڵاتیان بەسەر ناوچەیەکی فراوانی جیهانی ئیسلامی داگرتبوو لەسەرەتادا لەهونەری تەلارسازی کاریگەری عەباسیەکانیان بەسەرەوەبووە.پاشان باڵەخانەی تایبەت بەشێوازی خۆیان دروست کردووە، وەك مزگەوت وقوتابخانە کەپێك هاتبوون لەهۆڵ وهەیوانی تایبەت بەشێوازی خۆیان .پاشان مزگەوت وقوتابخانەی چوارهۆڵیان دروست کرد وەکوو(مزگەوتی ئەسفەهان)منارەکانیشیان بازنەیی بوون .لەتەنك مزگەوتەکانیان مەزارگەیان دروست دەکرد کەپێکهاتبوو لەهۆڵێکی چوارگۆشە گومەزێکی لەسەربووە.عوسمانیەکان بەشێوەیەك کاریگەری سەلجووقیەکانیان بەسەرەوەبووە(٤٣)، مێژووی هونەریان بەگشتی وهونەری تەلارسازیان بۆدووقۆناغ دابەش دەکرێت:

-قۆناغی شێوازی سەلجووقی.

- قۆناغی شێوازی دوای گرتنی قوستەنتینیە وەکوو(شێوازی بێزەنتی)(٤٤).

٣- کاریگەری هونەری تەلارسازی مەمالیك:

لەسەدەی سێزدەهەمی زاینی (مەمالیکەچەرکەسیەکان)لەمیسر دەردەکەون زۆر بایەخ بەلایەنی تەلارسازی دەدەن گرنگترین سیمای تەلارسازیشیان بریتیە لە:

١-بایەخدانی زۆر بەلایەنی دەرەوەی مزگەوتەکان.

٢-گەشەکردنی لایەنی خشتکاری-بەشێوازی تایبەتی (پێشکەوتنی کەرەستەی بیناسازی).

٣-ووردەکاری زۆر لەلایەنی دارتاشی وکانزاکاری ،لەدەرگاوپەنجەرەو شوێنە تایبەتیەکانی تەلارەکان.گرنگترین مزگەوتەکانیش وەك (سوڵتان بیبەرس وقلاون

وقوتابخانەکانی ئەوسەردەمە(٤٥).

سەرچاوەکان ئاماژەبەوەدەدەن، کاتێك کە (سولّتان سەلیم) لەساڵی ١٥١٧زبەسەر مەمالیکەکان زاڵ دەبێت و (قاهیرە)دەگرێت ژمارەیەکی زۆر لەتەلارسازان وبیناسازان لەگەڵ خۆی دەباتە (ئەستەنبۆڵ)تاسود لەدەسترەنگینی وکارامەییان وەربگرێت بۆکاری تەلارسازی ئەمەش بەڵگەیە لەسەر کاریگەری مەمالیك بەسەر هونەری عوسمانی(٤٦)، ئەمەسەرەڕای ئەوەی سولتان سەلیم بەرەی فراوانخوازی گواستەوە (رۆژهەلات)ڕاستەوخۆ لەوناوچانە لەهونەری (ئێرانی ومەمالیك) سوودمەندبووە(٤٧).

د- کاریگەری هونەری تەلارسازی ئێرانی(سەفەوی)(٤٨):

لەگەڵ هاتنی سەفەویەکان بۆئێران هونەری تەلارسازی بایەخی تایبەتی پێدەدرێ بەتایبەت لەسەردەمی (شاعەباسی گەورە)بەلام لەسەرەتادا جۆرێك لەکاریگەری ئاینی بەسەرەوەبووە، شێوازێکی تایبەت لەباڵەخانەی ئاینی دروست بووە، لەوانە مەزارگەی (شێخ سەفیەدین)لە(ئەردەبیل) کەنمونەی شێوەیەکی جوانی بیناکاریە(٤٩) عوسمانیەکان لەسەردەمی (سولّتان سەلیمی یەکەم)کاتێك بەسەر سەفەویەکان زاڵ بوون، هونەری تەلارسازی ئێرانی کاریگەری ڕاستەوخۆی کردە سەریان، سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە سەردەمی(سولّتان سەلیم)سەردەمی کاریگەری هونەری ئێرانی بووە بەسەر عوسمانیەکان بەتایبەت هەردوو قوتابخانەی (شیرازوتەورێز)ئەم کاریگەریە بەڕوونی بەلایەنی نەخشە سازی وتەلارسازی وڕستن وچنینی دەولەتی عوسمانی دەردەکەوێ بەتایبەت لەنیوەی یەکەی سەدەی شازدەهەم(٥٠).

هـ-کاریگەری هونەری تەلارسازی بێزەنتی :

هونەری تەلارسازی بێزەنتی لەوکاتەوە دەست پێدەکات کە(کۆستانتین)ئیمپراتۆری ڕۆم پایتەختی گواستەوە بۆ

(قوستەنتینیە)لەسالّی٣٣٠پ.ز لەوساتەوە بەردەوام دەبێ تاکوو سالّی ١٤٥٣ز کەلەوسالّە ئەوشارە لەلایەن (سولّتان محمد فاتح) دەستی بەسەر داگیرا.شارستانی بێزەنتی هەندێ جاربەشارستەنیەتێکی رۆژهەلاّتی دادەندرێ.کاریگەری زۆری هەبووە بەسەر شارستانیەتی ئیسلامی وبەپێچەوانەوەش ئەمەش بەهۆی نزیکی سنوورەکەی وهەم بەهۆی ئەوەی کەدواتر ناوچەکەبووە بەشێك لەقەلّەمڕەوی جیهانی ئیسلامی ,ئەم پرۆسەیەش هەرلەسەردەمی خەلیفەکانی ڕاشیدینەوە بگرە بەردەوام بووە تا دەگاتە سەلجووقیەکان ودواتریش عوسمانیەکان ،گرنگترین تایبەتمەندیەکانی هونەری بێزەنتی بریتیە لە:

١-کلێساکانیان گومەزی لەسەر بووە

٢-لەرێبازی هونەری خۆرهەلاّتی نزیك بووە

٣-کەمتر ئەستوونگە بەکارهاتووە ئەندازەی کەوانەیی بنمیچی تەلارەکان وگومەزەکانی ڕاگرتوون(٥١).

(هونەری تەلارسازی بێزەنتی)کاریگەریەکی ڕوون وڕاستەوخۆی بەسەر هونەری تەلارسازی عوسمانی هەبووە(٥٢)، ئەم کاریگەریەش بەدووقۆناغ بووە قۆناغی پێش گرتنی( قوستەتنیە )وقۆناغی دوای گرتنی( قوستەتنیە) لەسالّی ١٤٥٣ز.

سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کەپێش گرتنی (قوستەنتینیە)شوێنەواری تەلارسازی(بێزەنتیەکان)لەناوچەکانی (ئەنادولّ)وباکووری ئەفەریقیاوسوریا،بوونی هەبووە(٥٣)، بێگومان پاش سەرکەوتنی سەلجووقیەکان لەشەڕی (مەلازگرد)بەسەر (بێزەنتیەکان)دەسەلاّتی سەلجوقیەکان گەیشتە(ئاسیای بچووك)ئەمەش سەرەتایەك بوو بۆ دروست بوونی میرنشینەکانی (ئاسیای بچووك)کە عوسمانیەکان یش بەشێك بوون لەو میرنشینانە(٥٤).

پـــاش فراوانخـــوازی ئـــەم دەوڵەتـــە لەســـەر حیـــسابی دەوڵـــەتی بێزەنتـــە هەرشاروئاواییەکیان بگرتبایە سوودیان لەشوێنەوارەکانی وەردەگرت بۆدام ودەزگا ئاینی وکارگێڕیەکانی خۆیان ئەمە جگە لەوەی کە خۆشیان لەشێوە ئەندازەییەکـە سوودمەند دەبوون وکەڵکیان لێوەردەگرت بـۆبرەودان بەلایـەنی ئاواکـاری خۆیـان بۆنمونە لە(بۆرسە)چەند(خان)ێك لەتەنیشت مزگەوتی گـەورەی ئەوشـارە هـەبووە بەناوەکانی (فیدان خان)و(قۆزان خـان)کـە شـێوەکەیان چوارگۆشـە بـووە لەسـەر شـێوەی بازاڕەکـانی (بێزەتنـــە) دروســـتکراون(٥٥) .هـــەروەها گـــەرماوەکانی (بۆرســـە)ش کەلەســـەردەمی (ســـوڵتان مـــورادی یەکـــەم )لەســـەدەی چـــواردەهەم دروســـتکراون لەســـەر هـــەمان شـــێوەی گـــەرماوەکانی بێزەنتـــە کەدەگەڕێنـــەوە بۆسەردەمی (جونستیان)دروستکراون(٥٦).

ئەمە سەرەڕای زۆر تەلاری دیکـەش کەلـەژێر هـەمان کاریگـەری ئـەو قۆناغـە دروستکراون .بەڵام لەگـەڵ گـرتنی (قوسـتنەنیە)لەسـاڵی ١٤٥٣زلەلایـەن (سـولتان محمد فاتح)ەوە قۆنـاغێکی نـوێ لـەو کاریگەریـە دەسـت پێـدەکات کـە بـەقۆناغی کاریگەری (هونەری بێزەنتی)دەناسرێت(٥٧).

گۆرینی (کلێسای ئەیاسـۆفیا) بۆمزگـەوت مـاکی کاریگـەری راسـتەوخۆی ئـەم هونەرە دەگەیـەنێت (٥٨) ،ئەمـە جگـە لـەوەی کـە (سـولتان محمـد فـاتح) لـەزۆر بابەتی دیکەش سوودی لەهونەری بێزەنتی وەرگرتووە لەنەخشەی شارو بازارەکان وهەندێ بابەتی یاسایی وئیداری(٥٩) .

تەنانەت هونەری تەلارسازی بێزەنتی لەکارە ئەندازەییەکانی (سینان ئاغا)شـدا ڕەنگ دەداتەوە.

و–کاریگەری هونەری تەلارسازی ئەورووپی: .

هونەری تەلارسازی ئەورووپی لەسەدەی هەڤدەهەمەوە بەو لاوە کاریگەری هەبوو بەتایبەت دوای ئەوەی لاوە ئەورووپیەکان سەردانی (قوستەنتینیە)یان دەکرد(٦٠).

ئەم بایەخە تەنها لەڕووی هونەری تەلارسازی کاریگەری نەبووە بەڵکو لەهەموو لەبەشەکانی دیکەی هونەر ڕۆڵی هەبووە هەروەها گەیشتنی هێزی عوسمانیەکان بەناوچەی بەلقان وتاوەکوو نزیك ڤیەننا بەشێك بوون لەهۆکاری کاردانەوەی ئەو کاریگەریە بەسەر هونەری عوسمانی، سەرچاوەکان ئاماژە بەوەدەکەن کەسەردەمی (سوڵتان ئەحمەدی سێیەم) سەردەمی گەشانەوەی هونەری عوسمانی بوو، لەژێر کاریگەری هونەری ئەورووپی لەهەموو لایەنەکانیەوە ئەمە سەرەڕای بایەخدان بەهونەری شێوەکاری لەسەر دیواری کۆشکەکان .

لەنیوەی دووەمی سەدەی هەژدەهەم پاش هەنگاوەکانی چاکسازی کاریگەری هونەری (ڕۆکۆکۆ) ی ئەورووپی(٦١)، بەسەر هونەری عوسمانی دیارکەوت بەتایبەت پاش ئەوەی هونەرمەندوئەندازیارە ئەورپیەکان بەلێشاو بەشداریان لەسازاندنی کۆشکەکانی دەوڵەتی عوسمانی کرد(٦٢).لەکۆتاییشدا کاریگەری ئەوهونەرکارە ئەورووپیانە نەك هەریەتەواوی لەناودەوڵەی عوسمانی بڵاوبۆوە بەڵکو کاریگەری کردە سەر(هونەری عوسمانی ڕەسەن)یش(٦٣)، بەتایبەت ئەوچاکسازیانەی کەلەژێر کاریگەری پێشکەوتنەکانی ڕۆژئاوا لەناو دەوڵەتی عوسمانی ئەنجام دران، کەلەسەردەمی (سوڵتان سەلیمی سێیەم ١٧٨٩-١٨٠٧ز )دەست پێدەکات وبەردەوام دەبێت(٦٤).گرنگترین نموونەی ئەوشاکارە ئەندازەییانەش کە کاریگەری ئەندازەی ئەورووپی بەئاشکرا بەسەردا ڕەنگ دەداتەوە (کۆشکی دۆڵمە باخچە)یە کەلەسەردەمی سوڵتان عبالمجیدی یەکەم لە(ئەستەنبۆڵ)دروستکراوە .

**تەوەری سێیەم**

**تایبەتمەندیەکانی هونەری تەلارسازی دەوڵەتی عوسمانی:**

فراوانبوونی دەوڵەتی عوسمانی لەسەر حیسابی (میرنشینە کانی ئاسیای بچووك) و(بێزەنتیەکان)، سوڵتانەکانی عوسمانی گەیاندە گەورەترین پلەوپایە بۆ سەلماندنی گەورەیی پلەوپایەکەشیان، هەریەکەیان کەدەسەڵاتی وەردەگرت هەوڵیدەدا تەلارێك دروست بکات ،تالەرێگەی ئەوشاکارەوە ناوێکی چاکتر بۆخۆی لەمێژوودا تۆماربکات.

ئەم تەلارانەش یان (مزگەوت) بوون، یان (کۆشکێکی گەورە)یان( کۆمەڵگە خزمەتگوزاریەکان) بوون، مزگەوتەکان هەمیشە بەمنارە(رم ئاساوگومەزە گەورەکانی )جیا دەکرانەوە.

گومەزوشێوەکانی گومەزلەرەگەزە دیارو بەرچاوەکانی هونەری تەلارسازی عوسمانی بوون.ئەمەش نەك هەرلەمزگەوت، بەڵکولەجۆرەکانی دیکەشی تەلاری عوسمانی رەنگی دەدایەوە، وەك ئەوەی لە کۆشکەکانی (تۆپ کاپی–تۆپ قاپی)دیاردەکەوێ. ئەم گومەزانە شێوەیان پان وبە تابلۆی (رەنگ بۆر_رصاصی) دادەپۆشران، جار وابووە رووبەری هەریەکەیان (١٥بۆ٣١)مەتر بووە (وەك مزگەوتەکەی گومەزی سەلیمیە)لە(ئەدرنە)،هەروەها تەنهابەرزی مزگەوتی (سولەیمانیە) لە(ئەستەنبوڵ)، (٥٣)مەترە.ئەم گومەزە کەوتۆتە سەر ئەندازەیەکی شێوە قووچەکی، کەژمارەیەك پەنجەرە لەخۆ دەگرێت ئەمەجگەلەوەی لەناوەوەی بایەخ دراوە بەلایەنی زەخرەفە لەشێوەی نەخشەی (سێگۆشەیی)،بۆبەرزکردنەوەی ئەم قوچەکانەش هێزێکی زۆر گەورە بەکارهێندراوە(٦٥).

ئەستوونگەکانی ئەم مزگەوتە (سولەیمانیە)،بەبەرزیەوە هەڵچوونەتە ئاسمان ونەخشێندراون، ئەمە سەرەڕای نەخشەی سەر دەرگاکان وبۆیە کردنی شوشەی

پەنجەرەکان ورازاندنەوەی بەشێوەی خۆشنووسی ، کەلەلایەن خۆشنووسە ناودارەکانی ئەوکاتەی دەولەتی عوسمانی، وەك (ئەحمەد قەرەحەساری) و(شێخ حەمدیلای ئەماسی) و(حافیزعوسمان)نەخشێندراون .یەکێك لەرەگەزە بەرچاوەکانی دیکەی هونەری تەلارسازی عوسمانی ئەوتابلۆگلێنەییانەن (الالواح الخزفیە)کەناسراون بە(قاشانی)،زۆربەی تەلاری شارەکانی (ئەزنیك)و(کۆتاهیا)بەم تابلۆیانە نەخشێندراون، وەك وێنەی گول ودرەختی ئەفسانەیی کەبەرەنگی جۆراوجۆر بۆیە کراون لەگرنگترین تەلارەکانی کەبەم شێوازە رازاوەتەوە کۆشکەکانی (تۆپ کاپی)یە ئەم شێوازە هونەریە دواتر بۆ سەرتاسەری دەولەتی عوسمانی گواسترایەوە لەوانە(ویلایەتە عەرەبیەکان)(٦٦).

تەلارسازی دەولەتی عوسمانی لەسەرەتادا ئەلقەیەکی گواستنەوە بوولەنێوان شێوازی سەلجووقی لە(ئەنادۆل) بۆ شێوازی تایبەتی عوسمانی لە(ئەستەنبۆل)،کەدواتر لەوێوە بۆناوچەکانی دیکە گواسترایەوە.ئەم سەرەتایەش لەگەل ئەو تەلارانە دەست پێدەکات کەلەسەدەی چواردەیەمی زایینی لە(بۆرسە)دروەستکراون، وەك مزگەوتی(ئۆلۆ)(٦٧) ،کەگرنگترین تایبەتمەندیەکانی بریتیە لەوەی کە گومەزەکانیان بچووك بوون وپێك هاتبوون لەهۆلێکی گەورەر بنمیچی هۆلەکەش لەگومەزەکان پێك دەهات ،کەتیشکی خۆر لەرێگەی پەنجەرەکانی گومەزەکانەوە، دەگەیشتە ناو هۆلەکە.بەلام تەلارە گەورەکانی دوای مزگەوتی (ئەیاسۆفیا) گۆرانکاری گەورە بەسەر شێوازی گومەزەکانیان دادێت.لەرووی قەبارەورەنگ وشێوەی منارەکان(٦٨)، ئەمەش وایکرد هونەری تەلارسازی دەولەتی عوسمانی چەندتایبەتمەندی یەك وەربگرێت.وەك:

١-هەولدان بۆرزگاربوون لەوقۆلانەی کەگومەزی مزگەوتەکەیان رادەگرت لەمزگەوتەکانی(بۆرسە)دەست پێدەکات لەمزگەوتی (سولەیمانیە)کۆتایی

پێدێت.(سینان)وەك ئەندازیارێکی لێهاتوو هات گومەزێکی گەورەی وەك گومەزی (سولەیمانیە)ی دروست کرد، بێ ئەوەی ژمارەیەکی زۆر لەو قۆلانە رایگرتبێت.کەپێشتر پێی رادەگیران بۆ ئەمەش لەرێگەی شێوازی (نیوگومەزەیی)ئەم کارەی ئەنجامدا واتە لەرێگەی نیو گومەزی بچوکترەوە گومەزە گەورەکەی راگرت(٦٩).

٢-بوونی پەنجەرەی گەورە کەتیشکی خۆر بتوانێت بەهۆیانەوە تەواوی ناو حەرەمی مزگەوتەکە رووناك بکاتەوە . ئەمەش لەبەربەستی دیوارەکانی مزگەوتەکەی کەمتر دەکردەوە(٧٠).

٣-تایبەتمەندی منارەکان کەلەژێر کاریگەری شێوازی سەلجووقی دروستدەکران بەرزوباریك، کە دەوری گومەزەکانیان دەدا(٧١).

٤-بایەخدان بەهونەری گلێنەیی (الخزف)وکاری گەچکاری بەتایبەت وێنەی گوڵ وداورەدرەخت وهونەری زەخرەفەوکەبەهەموو رەنگەکان بۆیە دەکران کە کاریگەری هونەری ئێرانیشی بەسەرەوە دیاربوو(٧٢).

٥-ئەگەرچی لەقۆناغی (بۆرسە)و(ئەدرنە)هیچ کۆشکێکی ئەوتۆی سوڵتانەکان نابیندرێت بەڵام لەئەستەنبوڵ جوانترین ئەو کۆشکانە بەرچاو دەکەون لەوانە کۆشکی (گینیلی کیوسك) (٧٣)، کەلەساڵی ١٤٧٨لەلایەن ئەندازیاری فارسی (کەمالەدین)دروست کراوە.کەیەکێکە لەکۆشکە نایابەکانی (تۆب کابی)ولەسێ هۆڵ پێك هاتووە ،چەند(بەلەکۆنە)یەکی تێدابوو،هەندێکیان کراوەو هەندێك داخراوبوون.نمونەیەکی دیکەی لایەنی ئەندازیاری عوسمانیەکانە(٧٤).

٦-رازاندنەوەی کۆشك وتەلارەکانی عوسمانی بەهونەری خۆشنووسی لەم هونەرەش دا زیاتر خەتی عەرەبیان بەکارهێناوە، لەگرنگترین خۆشنووسەکانی عوسمانیش (حەمدیلای ئەماسی)بووە کەبایەخی داوە بەخەتەکانی(نوسخ وثولث ورووقع وریحاني) زۆر خۆشنووسی دیکەش هەبوون وەك (ئیسماعیلی حەقی

وئەحمەد قەرەحەساری)لەسەدەی هەڤدەی زاینی وسەرەتاکانی سەدەی هەژدەم ،بایەخدان بەخەت لەدەوڵەتی عوسمانی زیاتربوو بەتایبەت پاش ئەوەی لەسەردەمی (سوڵتان ئەحمەدی سێیەم )بەخەتی (روقع وموحەقیق)قورئانی پیرۆز نووسرایەوە (٧٥)،ئەمە سەرەرای ئەوەی هەرلەسەرەتاوە ئایاتەکانی قورئانی پیرۆز لەسەر دیواری مزگەوتەکان دەنووسرانەوە.

٧-بایەخدانی زۆر بە(هونەری زەخرەفە) وشێوەکاری رووی دەرەوەی تەلارەکان،یەکێك لەمۆرکەکانی دیکەی هونەری تەلارسازی عوسمانی بووە، ئەم جۆرە جوانکاریەش هەر لەسەردەمی سەلجوقیەکانەوە برەوی هەبووە.گرنگترین شێوە نەخشەکاریەکانیش وەك (ئەستێرەیی وچوارگۆشەیی ولاکێشەیی..)بوون، وەك لە(مزگەوتی سەون)لە(بۆرسە) بەرچاودەکەوێ، هەروەها نەخشە کاریەکانی تەلارەکانی شاری(ئەزنیك)لەسەردەمی (سوڵتان سەلیمی یەکەم )کە هەمان چەشنە نەخشەکاری لەناو حەرەمی مزگەوتەکانیش دروستکراوە، ئەمە جگە لەوەی لەکۆشکەکان وتەلارەکانی دیکەش هەمان چەشنە نەخشەکاری بەکارهاتووە، .ئەمەش بووە شێوازێکی باوی لایەنی تەلارسازی ناو دەوڵەتی عوسمانی، بەنموونە ئەم چەشنە نەخشەکاریە لەیەکێك لەهۆڵی کۆشکەکانی شاری (حەلەب) بەکارهاتووە کەدەگەرێتەوە بۆسالی ١٦٠٠-١٦٠٣ز(٧٦).

تەوەری چوارەم

نمونەی ئەندازیاروتەلارە ناودارەکانی دەوڵەتی عوسمانی:

یەکەم: نمونەی ئەندازیارە ناودارەکانی دەوڵەتی عوسمانی:

کەباس لەمێژووی تەلارسازی دەوڵەتی عوسمانی دەکرێت ناکرێ ناوی گرنگترین ئەو کەسانە لەیادبکرێ کەرۆڵیان لەنەخشەرێژی ئەو لایەنە هەبووە،

ئەگەرچی سوڵتان وفەرمانڕەوایانی عوسمانی بایەخیان بەو لایەنە دابێت، بەڵام ئەوان نەهاتوون ووردوبـاریکی نەخـشەی تـەلارەکان بدەنـە بیناکاروئەنـدازیارەکان تائەوانیش جێبەجێی بکەن ئـەوان تـەنها داوایـان کـردووە کـەکارێکی مـەزنیان بـۆ ئەنجامبدەن.

ئێمە لێرەدا تەنها ئاماژە بەناوی ئەوانە دەدەین کەچ لەسەردەمی خۆیان چ بۆ قۆنـاغێکی دواتـری مێـژوو، بوونەتـە نمونەیـەکی هـەرە بـەرزی بـواری ئەنـدازیاری وتەلارسازی

یەکەم:ئەندازیار سینان (٧٧)

سەردەمی(سوڵتان سلێمانی قانونی) بەسەردەمی زێڕینی دەوڵـەتی عوسمـانی دادەنـدرێ، لەهـەموو بوارەکانـەوە بـواری تەلارسـازیش لەنێویانـدا پـشکی شـێری بەرکەوتووە یەکێك لەگرنگترین سیماکانی ئەوسـەردەمە دەرکـەوتنی ئەنـدازیارێکی بەتوانایە کەناوی(سینان)بووە، بەشێوازە نوێیەکەی لەبواری تەلارسازی دا ناودارە کەتا ئەمڕۆش لاسایی ئەم شێوە ئەندازەیەی سینان دەکرێتەوە(٧٨).

(سـینان ئاغـا) سـاڵی ١٤٨٨زلەگونـدی (ئاغـەرناس)ی نزیك(قەیسەریە)(٧٩)،لەدایك بـووە، سەرچـاوەکان ئامـاژە بـەوە دەکـەن کـەتورك نـەبووە(٨٠)و بەشـداری ڕژێمـی (دۆفـشرمە)ێ کـردووە وبووەتـە سـەرباز لەسوپای(ئینکشاری) و بەشداری کـردووە لەزۆربـەی هێرشـەکانی سـوڵتان سـەلیم بۆسەر (ئێران وشام وعێراق ومیسر)،هـەروەها بەشـداری کـردووە لـەو هێرشـانەی کەلەساڵی ١٥٢٦زلە سەردەمی(سوڵتان سلێمانی قانونی) بۆگرتنی(بەلگراد)ئـەنجام دراون ،پـاش ئـەوە (سـینان) بەشـداریکردووە، لەدروسـتکردنی هـەردوو پـردی (ڕووباری برۆن) لەهێرشی (مۆلدافیا)وپردێك لەسـەر (ڕووبـاری دانـووب) .لێـرەوە (سـینان) ناوبـانگ پەیـدادەکات ودەبێتـە گـەورەی ئەنـدازیارەکانی (دەوڵـەتی عوسمانی)، کاتێك تەمەنی دەگاتە پەنجا ساڵی ژمارەی ئـەو تەلارانـەی دروسـتی

کردوون خۆی دەدەا لەنزیکەی (٣٦٤)تەلاری ئەندازیاری، ئەمەش ژمارەیەکی پێوانەیی بووە کە(سینان) لەو سەردەمە تۆماری کردووە(٨١).

(سینان) لەئەنجامی ئەو گەشت و گەڕانە زۆرەی ئەنجامی داوە، توانیویەتی لەزۆرترین شێوازەکانی هونەری تەلارسازی سوودمەندبێت تاوەکوو توانیویەتی سیستەمێکی جیاواز بۆ ئەندازیاری عوسمانی بێنێتە کایەوە(٨٢).

وەك ئەو شێوە جیاوازانەی کەلەگومەزی مزگەوتەکاندا کردی،ئەمە لەکارە گرنگەکانی (سینان)ە.یەکەم کاری ئەو ئەندازیارە لە(ئەستەنبۆڵ)دروستکردنی کۆمەڵگەی (خاسکی)یە، پاشان کۆمەڵە کارێکی دیکەی ئەنجام داوە لەوانە(مزگەوتی سینان پاشای میری دەریا ومزگەوتی ئۆتش شەرەفەلی وڕۆستەم پاشاومحمد سوکلی پاشا).

سەردەمی زێڕینی هونەری تەلارسازی عوسمانی لەسەردەستی (سینان) لەسەدەی شازدەهەمەوە دەست پێدەکات، قۆناغەکانی کاری ئەم ئەندازیارە بەپێی سێ لەمزگەوتە ناودارەکان پۆلین دەکرێت.ئەوانیش مزگەوتی(شاهزادە وسوڵتان سلێمان لەئەستەنبۆڵ ومزگەوتی سەلیمیە لەئەدرنە..)

لە(مزگەوتی شاهزادە)(٨٣) ،(سینان)کەوتۆتە ژێرکاریگەری ئەندازەی مزگەوتی (ئەیاسۆفیا)بەتایبەت لەدروستکردنی گومەزەکان بەڵام لەمزگەوتی (سوڵتان سلێمان)کەوتۆتە ژێرکاریگەری هەردوو مزگەوتی (ئەیاسۆفیاومزگەوتی سوڵتان بایەزید)،مزگەوتی (سوڵتان سلێمان) حەوشەی گەورەی هەیە کەباخچەی تێدایە وشورایەکی گەورە دەورەی دایە لەشێوەی کۆمەڵگەیەکیشە قوتابخانەوچێشتخانەوکتێبخانەی تێدایەوبەگومەزەگەورەکەی وئەو گومەزە بچووکانەی دەورەیانداوە جیادەکرێتەوە(٨٤)، ئەمە سەرەڕای ئەو ئەندازە جوانەی لەمزگەوتی (سوڵتان سەلیم) لە(ئەدرنە) بەکاریهێناوە(٨٥) .

(سینان) ساڵی ١٥٥٠ز دەستی بەمزگەوتی (سوڵتان سلێمان )کردووە،بەحەوت

ساڵ کارکردن تەواوی کردووە.ئەم ئەندازیارە داهێنەرە، هاوسەردەمی پێنج سوڵتانی عوسمانی بووە، ئەوانیش (بایەزیدی دووەم وسەلیمی یەکەم وسلێمانی قانونی وسەلیمی دووەم ومورادی سێیەم) ن، (٨٦)، تاکوو خۆشی لەساڵی ١٥٨٨ز لەتەمەنی (١٠٠)ساڵیدا، کۆچی دوایی کردووە ولەمەزارگەیەکی نزیك مزگەوتەکە نێژراوە(٨٧) .

دووەم:حاجی مووسا

یەکێکە لەئەندزیارە بەراییەکانی دەوڵەتی عوسمانی وهاوسەردەمی هەردوو سوڵتان (ئۆرخان کوڕی عوسمان ومورادی یەکەم)بووە، کاریگەری هونەری تەلارسازی سەلجووقی بەسەرەوەبووە، لەگرنگترین شاکارەکانی ئەو ئەندازیارە مزگەوتی (سەوز-یشیل)ە، کەلەساڵی ١٣٧٨زلە(ئەزنیك)لەسەردەمی (سوڵتان مورادی یەکەم) دروستی کردووە، ئەم مزگەوتە گومەزێکی نیو بازنەیی لەخۆی دەگرێت، کە قەبارەکەی (١١م)دەبێت لەڕووی وێنەو نەخشەکاریەوە بەتەواوی شێوازی سەلجووقی بەسەر زاڵ بووە بۆ یە پێی گوتراوە( مزگەوتی سەوز)چونکە ڕەنگی گومەزەکەی سەوز بووە(٨٨) .

سێیەم:حاجی عەلائەدین

ئەمیش یەکێك بووە لەئەندازیارەکانی دەوڵەتی عوسمانی وخەڵکی (کۆنیە)بووە، هاوسەردەمی(سوڵتان محمد چەلەبی)و(سوڵتان مورادی دووەم)بووە.یەکێك لەشاکارەکانی دروستکردنی مزگەوتی (ئاسکی جامع)بووەلە(ئەدرنە)،ئەوەی ئەم مزگەوتە جیا دەکاتەوە ئەوەیە کە نووسینی زۆر لەسەر دیوارو ئەستوونگەکانی بەرچاو دەکەوێ وەك پەندوئامۆژگاری وناوی خەلیفەکان وئایاتەکانی قورئانی پیرۆز(٨٩).

چوارەم:ئیواز کوڕی بایەزید

مامۆستایەکی لێهاتوو ئەندازیارێکی دەسترەنگین بووە، کەجێگەی شانازی

ئەندازیارانی سەردەمی خۆی بووە.خەڵکی (بۆرسە) بووە بە(حاجی ئیوان)یش دەناسرێت زۆر لەشێوازەکانی ئەندازەگەری وتەلارسازی ناسیوە ڕۆلێکی بەرچاوی هەبووە لە پێشخستنتی شێوازی گومەزی ناوەندی لەگرنگترین کارەکانی دروستکردنی (سوڵتان محمد چەلەبی یە) کەئەویش بەمزگەوتی (سەوز)ناسراوە، کەلەساڵی ١٤٢٤ز دروستی کردووە (حاجی ئیوان)بەهۆی لێهاتوویی لەکارەکەی نازناوی (پاشا)ی وەرگرتووە.لە(بۆرسە)نێژراوە(٩٠).

پێنجەم:محمدئاغا

ئەندازیارێکی گەورەی هاوسەردەمی (سولتان ئەحمەدی یەکەم ١٦٠٣_ ١٦١٧)بووە، کاریگەری (ئەندازیار سینان)ی بەسەرەوەبووە ئەمە جگە لەوەی کە زۆر شێوازی دیکەشی تایبەت بەخۆی هەبووە ،لەگرنگترین شاکارەکانی ئەم ئەندازیارە (مزگەوتی سولتان ئەحمەدی یەکەم)ە لە(ئەستانبۆڵ)کەلەساڵی ١٦١٦ز، دروستکراوەلەم مزگەوتەدا (محمد ئاغا)وێڕای سوود وەرگرتنی لە(شێوازی سینان) کاریگەری ئەندازەی (قووچەکی-هرمی) بەسەرەوەبووە بەتایبەت لەڕووکاری دەرەوەی مزگەوتی(سولتان ئەحمەدی یەکەم)ئەم شێوازە تێبینی دەکرێت .کارەکەشی لەزۆر شت لاسایی سینانی تێدایە بەتایبەت ئەوبەشانەی کەلەمزگەوتی (شاهزادە)ی وەرگرتووە(٩١).

شەشەم:خەیرەدین ئاغا

یەکێك بووە لەئەندازیارە لێهاتوەکانی تەلارسازی دەوڵەتی عوسمانی هاوسەردەمی (سولتان بایەزیدی دووەم و سەلیمی یەکەم )بووە،یەکێك لەکارە گرنگەکانی (خەیرەدین ئاغا) (مزگەوتی سولتان بایەزیدی دووەم) ە.ئەم مزگەوتە لە(ئەستەنبۆڵ( لەساڵی ١٥٠٦زلەلایەن (خیرالدین)بەڕاسپاردەی (سولتان بایەزید) دروستکراوە، بەوە جیا دەکرێتەوە کەگومەزەکانی بەشێوازی نیوگەمەزەیی بچووکتر بەگومەزە سەرەکیەکە بەستراونەتەوە کاریگەری مزگەوتی (ئەیاسۆفیا)ی

لەسەر بووە،بەڵام مۆرکی پێشکەوتنی قۆناغەکەی خۆی پێوە دیارە(٩٢).

حەوتەم:زۆر تەلارسازی دیکەش لەمێژووی عوسمانیدا خاوەن ناوداری بێ وێنەی بواری تەلارسازین، کەشاکارەکانیان لەمێژوودا ناوی داوەتەوە، ئەمە وێڕای بەخشینی مۆرکی تایبەتمەندی بەهونەری تەلارسازی دەوڵەتی عوسمانی، کەبەهۆی ئەوانە ئەم مۆرکە جیا دەکرێتەوە، لەوانە(داودئاغا)ئەندازیاری مزگەوتی گەورەی (ئەستەنبۆڵ) کەنەك هەرکارەکەی بەکارێکی نمونەیی دادەنرێت، بەڵکو بووەتە جێگەی سەرنجی ئەندازیارێکی گەورەی وەك (محمد ئاغا) کەلەبەشێکی کارە تەلارسازیەکەی مزگەوتی (سوڵتان ئەحمەد) سوودی لێوەرگرتووە(٩٣).هەروەها (حاجی ئەمین ئاغا)کە بە دیزاینەر و دروستکەری سەرەکی کۆشکی (دۆڵمە باخچە)ی ناودار دادەندرێت، لە(ئەستەنبۆڵ) کەلەساڵی ١٨٣٩ز لەسەردەمی (سوڵتان عبدالمجیدی یەکەم )دروستکراوە(٩٤).

دووەم:نمونەی تەلارە ناودارەکانی دەوڵەتی عوسمانی:

یەکەم:کۆشکەکانی تۆب کابی(٩٥):

ئەم کۆشکە کۆمەڵە تەلارێك لەخۆ دەگرێت کەدەگەڕێنەوە بۆ سەردەمە مێژووییە جیاوازەکانی دەوڵەتی عوسمانی، جگە لەچەندین باخچەو ڕێڕەوەی فراوان کەبەسەر گەرووی بسفۆر بەفراوانی(٧٠٠٠م)دووجا درێژ دەبێتەوە وبەشورایەك دەورە دراوە، کە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی (بێزەنتیەکان) تەلارەکانی (کۆشکی تۆب کابی) بۆچەند کۆمەڵەیەك دابەش بوونە کەبەچەند دەرگایەك بەیەکەوە بەستراونەتەوە، دەرگای یەکەمیان پێی دەگووترێت(دەرگای هومایۆنی) کەدەکەوێتە بەرامبەر مزگەوتی (ئەیاسۆفیا)هەروەها دەرگای (ئۆرتا کابی–ناوەوە)کەلەناوەڕاستیەتی، لەگرنگترین دەرگاکانیەتی زۆربەی بەشەکانی کۆشکەکە لەڕێگای ئەم دەرگایەوە بەیەك دەگەن وەکوو چێشتخانەوشوێنی

پاسەوانەکان وهەروەها چەندین کۆشکی تێدایە وەکوو کۆشکەکەی (سولْتان محمد فاتح وکۆشکی بەغدادوکۆشکی ریفان ومەجیدیەوحەرمەلەك..)(٩٦).

(سولتان محمد فاتح) یەکەم کۆشکی لەساڵی ١٤٧٨ز تێدا دروست کرد لەپاشان سولْتانەکانی دیکە لاسایيان کردەوە .کۆشکەکان وەك یەك نین هەریەکەیان لەسەردەمێك وبەشێوازێك دروست کراوە، بەلاّم لەهەموان گرنگتر کۆشکی (کینیلی کیوسك)ە کەلەلایەن (سولتان محمد فاتح) دروست کراوە، .هەروەها کۆشکێکی دیکەی تێدایە بەنێوی (کیوسك بەغداد)کەلەسەردەمی (سولْتان مورادی چوارەم) بەبۆنەی گرتنەوەی (بەغدا)لەساڵی ١٦٣٣ز دروست کراوە ،هەروەها زۆر کۆشکی دیکەی تێدایە وەك (یەنی سەرای وکۆشکی تۆب کابی),کۆشکی بەغدا گومەزێکی گەورەی لەسەر دروستکراوە کەبەکەرەستەی گرانبەها بنیاتنراوە، ئەمە سەرەڕای بەکارهێنانی هونەری زەخرەفەوشێوەکاری هەروەها لەنێو ئەم کۆشکەدا(کتێبخانەی سولْتان ئەحمەدی سێیەم )بەرچاودەکەوێ، کەناسراوە بە (کوتوبخانەسی)کەتەلارێکی بچوکی دوونهۆمیەوگومەزدارەودەستنووسی بەهاداری تێدایەوبالْیکیشی تەرخان کراوە بۆ مۆزەخانە کەشمشێری کۆن وقورئانی دەگمەنی تێدا هەلْگیراوە دوادەرگای شی دەچێتەوە ناو باخی گشتی کۆشکەکە ،(تۆب کابی) نمونەی شاکارە سەرنجڕاکێشەکانی مێژووی دەولْەتی عوسمانیە(٩٧) .

دووەم:کۆشکی دۆلْمە باخچە

لەسەردەمی (سولْتان عبدالمجیدی یەکەم )دروستکراوە لەساڵی ١٨٣٩ز هەندێ سەرچاوە (حاجی ئەمین پاشا)بەدیزاینەروئەندازیاری سەرەکی کۆشکەکە دادەنێن لەتەك ئەویش دا (سەرکیس بالیان)بەیاریدەدەری دادەنێن(٩٨).بەلاّم سەرچاوەی دیکە (یالیان)بەئەندازیاری سەرەکی کۆشکەکە دادەنێت ،(نۆیل باربەر)لەمبارەیەوە دەلْێت(سولْتان عبد المجید میعمارێکی ئەرمەنی بەنێوی

(بالیان)ڕادەسپێرێ بۆ دروستکردنی ئەم کۆشکە بەومەرجەی لەکۆشکی هەموو پاشایەکی سەرزەوی مەزنتر بێت) ئەم کۆشکە لەشوێنێك دروستکراوە کەلەپێشدا لە(سەردەمی سولتان سلێمانی قانونی) لەلایەن (خیرالدین باربارۆسا)ی سەرکردەی دەریاوانیە وە کرابووە شوێنی کۆیلەکانی کشتوکاڵی کەلەم(٩٩).

تارمەی مەرمەڕی ئەم کۆشکە بەدرێژایی(٦٠٠)مەتر لەسەر ڕووباری (بسفۆڕ)درێژەی هەیە لەسەر شێوازی هونەری (بارۆکی)ئەوروپی دروستکراوە، بەڵام کەمتر ووردەکاری وناسکی پێوە دیارە هۆڵ وژوورەکانی ئەم کۆشکە بەزێر ڕازاونەتەوە تەنها درێژایی تەختی سولتان سێ مەترە،بوونی ئاوێنەوکریستاڵی زۆر بەدیوارەکانیەوە کۆشکەکەیان زیاتر ڕازاندۆتەوە ،دەڵێن دوای ئەوەی سولتان کۆشکەکەی تەواوکردووە سەرکردەکانی وڵاتانی ئەوروپی هەریەیەکەیان دیاری بەنرخی بۆ کۆشکەکە ڕەوان کردووە(١٠٠).

پەراوێزەکان:

(١) امال حليم الصراف:موجزفي التاريخ الفن،ط٢،عمان_الاردن،٢٠٠٩،ص٧٠.

(٢)خليل اينالجيك:تاريخ الدولة العثمانية(من النشوءالي انحدار)،ت:م.الارناووط،ط١،بيروت_لبنان،٢٠٠٢،ص٢٢٠.

(٣)محمدسوهەيل تەقوش:عوسمانیەکان(لەدامەزراندنی دەوڵەت تاکودەتا) چ١،و:نەریمان خۆشناو،مستەفا سەیدمینە،هەولێر،٢٠٠٩،ل٣٤.

(٤)محمد فؤاد كوبريلي:قيام الدولة العثمانية، ت:احمد سعيد سليمان، مصر ،١٩٦٧ ، ص١٠٢ .

(٥) محمد فؤادكوبريلي:قيام الدولة العثمانية،م.س،ص١٠٥.

(٦) وديع ابوزيدون:تاريخ الامبراطورية العثمانية(من التاسيس الي السقوط)،ط١،عمان_الاردن،٢٠٠٣،ص٢٢.

(٧)احمدعبدالرحيم مصطفي:في اصول التاريخ العثماني،ط٣،مصر،٢٠٠٣،ص٣٦.

(٨) محمدسوهەیل تەقوش:عوسمانیەکان(لەدامەزراندنی دەوڵەت تاکودەتا) س.پ،ل٣٢_٣٣.

(٩)(بۆرسە) یان( بروسیا) (brousse):شارێکە دەکەوێتە رۆژئاوای (ئەنادۆڵ)،لەپێش دا سەربە(بێزەنتیەکان) بووە، ساڵی ١٣٢٦ز لەلایەن (عوسمانیەکان)ەوە لەسەردەستی (ئۆرخانی کوڕی عوسمان) دەگیرێت ،تاگرتنی (قوستونتینیە)دەبێتە پایتەختی عوسمانیەکان،بەناوی کانزایی وپیشەسازی ئاوریشم بەناوبانگە،بڕوانە (المطبعة الكاثوليكية:المنجد(في اللغةوالاعلام)،ط٢٧،بيروت_١٩٨٦،ص١٤٩قسم الاعلام)

(١٠) خليل اينالجيك:تاريخ الدولة العثمانية(من النشوءالي انحدار)،م.س،ص٢٢٠.

(١١)بۆزیاتر زانیاری دەربارەی ئەوبابەتە بڕوانە: خليل اينالجيك:تاريخ الدولة العثمانية(من النشوءالي انحدار)،م.س،ص٢٢١_٢٢٠.

(١٢) وديع ابوزيدون:تاريخ الامبراطوريةالعثمانية(من التاسيس الي السقوط)، م.س،ص٢٨

(١٣) نعمت اسماعيل علام:فنون الشرق الاوسط في العصور الاسلامية،ط١،مصر،١٩٧٤،ص٢٢٥

(١٤) محمدسوهەیل تەقوش:عوسمانیەکان(لەدامەزراندنی دەوڵەت تاکودەتا)،س.پ،ل٥٠

(١٥) ودیع ابوزیدون:تاریخ الامبراطوریةالعثمانیة(من التاسیس الی السقوط)، م.س،ص٣٨.

(١٦)ئەم کارە تەلارسازیانە تەنها مزگەوت نەبووە زۆر نمونەی دیکەش هەن .بۆزیاتر زانیاری بڕوانە:عفیف البهنسی:موسوعه التراپ المعماری،گ١،دمشق_٢٠٠٤.

(١٧) عفیف البهنسي:موسوعة التراث المعماري،م.س،ص٣٧.

(١٨) عفیف البهنسي:موسوعة التراث المعماري، م.س ،ص٦٤.

(١٩)سعادماهرمحمد:کتاب الفنون الاسلامیة،ط١،مصر،١٩٨٦،ص٢٥٣.

(٢٠)هاملتون جیب وهارولدبوین:المجتمع الاسلامي والغرب،ط١،ت:عبدالمجیدالقیسي،ج١،دارالمدی،١٩٩٧،ص٧٥.

(٢١) نعمت اسماعیل علام:فنون الشرق الاوسط في العصور الاسلامیة، م.س ،ص٢٢٦.

(٢٢) نعمت اسماعیل علام:فنون الشرق الاوسط في العصور الاسلامیة، م.س ،ص٢٢٧.

(٢٣)بزستان:بەبازاڕێکی گەورە دەگووترێت کە شتی گرانبەها بفرۆشێت،بە(دار البز)یش ناوبراوە،(بز)یش لەعەرەبیدا بەمانای (قوماش _کوتاڵ)دێت.(بزان)یش ئەوکەسەیە قوماش دەفرۆشێت،دەشێت (بزستان)هەر لەوەوە هاتبێت. بڕوانە(المطبعة الکاثولیکیة:المنجد(في اللغةوالاعلام)، م.س.ص٣٦ قسم اللغة).

(٢٤)بۆزیاتر زانیاری دەربارەی کارە تەلارسازیەکانی (سولتان محمد فاتح)بڕوانە: خلیل اینالجیك:تاریخ الدولة العثمانیة(من النشوءالي انحدار)،م.س،ص٢٢٢_٢٢٣.

(٢٥) نعمت اسماعیل علام:فنون الشرق الاوسط في العصور الاسلامیة، م.س ،ص٢٢٧.

(٢٦) خلیل اینالجیك:تاریخ الدولة العثمانیة(من النشوءالي انحدار)،م.س،ص٦٢.

(٢٧) سعادماهرمحمد:كتاب الفنون الاسلامية، م.س ،ص٩٢.

(٢٨)خالدعزب:تراث العمارة الاسلامية،ط١،القاهرة_مصر،٢٠٠٣،ص٨٨_٨٩.

(٢٩) عفيف البهنسي:موسوعة التراث المعماري، م.س ،ص٢٨٦.

(٣٠) نعمت اسماعيل علام:فنون الشرق الاوسط في العصور الاسلامية، م.س ،ص٢٢٨.

(٣١) نعمت اسماعيل علام:فنون الشرق الاوسط في العصور الاسلامية، م.س ،ص٢٢٨.

(٣٢) عفيف البهنسي:موسوعة التراث المعماري، م.س ،ص٢٨٧.

(٣٣) عفيف البهنسي: تاريخ الفن والعمارة،ط١،دمشق_٢٠٠٣، ص٢٨٣.

(٣٤) عفيف البهنسي:موسوعة التراث المعماري، م.س ،ص٩٦.

(٣٥)قوتابخانەی نیزامیە :لەلایەن سەلجوقیەکانەوە لەهەردوو شاری(نیسابور)و(بەغدا)لەساڵی ١٠٥٦ز دروستکراوە،ئاماژەیە بۆناوی (نیزامولمولك)ی وەزیری سەردەمی (مەلیكشا)ی سەلجووقی،کە چاکەی قوتابخانەکە بۆ ئەم دەگەڕێتەوە ،بڕوانە(المطبعة الكاثوليكية:المنجد(في اللغةوالاعلام)، م.س.ص٧١٠ قسم اعلام).

(٣٦) خليل اينالجيك:تاريخ الدولة العثمانية(من النشوءالي انحدار)،م.س،ص٢٢٠.

(٣٧) عفيف البهنسي:تاريخ الفن والعمارة، م.س.ص٢٨٤.

(٣٨) خليل اينالجيك:تاريخ الدولة العثمانية(من النشوءالي انحدار)،م.س،ص٢٢٠.

(٣٩) امال حليم الصراف:موجزفي التاريخ الفن، م.س.ص٨١.

(٤٠) امال حليم الصراف:موجزفي التاريخ الفن، م.س.ص٨٣.

(٤١) عفيف البهنسي:تاريخ الفن والعمارة، م.س.ص٢٨٣.

(٤٢) امال حليم الصراف:موجزفي التاريخ الفن، م.س.ص٨٤.

(٤٣) عفيف البهنسي:تاريخ الفن والعمارة، م.س.ص٢٢٩_٣٠٠.

(٤٤) نعمت اسماعيل علام:فنون الشرق الاوسط في العصور الاسلامية، م.س.ص٢٢٦.

(٤٥) امال حليم الصراف:موجزفي التاريخ الفن، م.س.ص٨٩.

(٤٦)عاصم محمدرزق:الفنون العربية الاسلامية،ط١،مصر،٢٠٠٦،ص٤٠١.

(٤٧) سعادماهرمحمد:كتاب الفنون الاسلامية، م.س.ص٢٥٤.

(٤٨)هونەری سەفەوی لەسەر داروپەردووی قۆناغەکانی پێش خۆی دامەزراوە کەبەشێوەیەکی گشتی (هونەری ئێرانی) پێ دەگووترێت، بەلام ئەمە مانای وانیە کە (سەفەویەکان)بایەخیان پێنەدابێت تەنانەت خودی (شائیسماعیل)کەبەدامەزرێنەری (دەوڵەتی سەفەوی)دادەنرێت بایەخی تایبەتی لایەنی بەهونەری شێوەکاری وخۆشنووسی داوە ،بەڵگەش بۆ ئەمە (بەهزاد)ی گەورە شێوەکاری لە(هیرات)ەوە هێنایە(تەورێز)کەبەدامەزرێنەری قوتابخانەی (تەورێز)ی هونەری دادەنرێت .هەروەها (شا تۆهماسپ)ی جێگرەوەی (شائیسماعیل)یش، دەستێکی باڵای لەبواری هونەریدا هەبووە ئەمیش خودی خۆی شێوەکار وخۆشنووس بووە. ،بڕوانە:راجرسێڤری:ئێرانی سەردەمی سەفەوی ،و:سەلاحەدین ئاشتی ،چ١،سلێمانی،٢٠٠٧،ل٢٠٦.هەروەها بڕوانە:اوليغ ضرابر:المنمنمات(مدخل الى الفن التصوير الفارسي،ت:عبدالاله الملاح،دمشق،٢٠٠٧،ص١٢٨.

(٤٩) امال حليم الصراف:موجزفي التاريخ الفن، م.س.ص٨٩.

(٥٠) سعادماهرمحمد:كتاب الفنون الاسلامية، م.س.ص٢٥٥.

(٥١) امال حليم الصراف:موجزفي التاريخ الفن، م.س.ص٧٠.

(٥٢) امال حليم الصراف:موجزفي التاريخ الفن، م.س.ص٩٠.

(٥٣) عفيف البهنسي:تاريخ الفن والعمارة، م.س.ص٢٥٤

(٥٤) محمد فؤادكوبريلي:قيام الدولة العثمانية،م.س،ص١٧.

(٥٥) عفيف البهنسي:موسوعة التراث المعماري، م.س.ص١١١.

(٥٦) عفيف البهنسي:موسوعة التراث المعماري، م.س.ص١١١.

(٥٧) نعمت اسماعيل علام:فنون الشرق الاوسط في العصور الاسلامية، م.س.ص٢٢٦.

(٥٨)(کلێسای ئەیا سۆفیا )لەسەردەمی (جنستیان)ئیمپراتۆری بێزەنتی دروستکراوە، (سوڵتان محمد فاتح )کەگۆڕی بۆ (مزگەوت)دەسکاریەکی ئەوتۆی نەکرد، جگە لەدروستکردنی منارەکان نەبێت، کەلەسەر شێوازی هونەری ئیسلامی دروستکراون)بڕوانە: امال حليم الصراف:موجزفي التاريخ الفن، م.س.ص٩٠.

(٥٩) احمدعبدالرحيم مصطفي:في اصول التاريخ العثماني، م.س.ص٦٦_٦٧.

(٦٠) امال حليم الصراف:موجزفي التاريخ الفن، م.س.ص٩٠.

(٦١)رۆکۆکۆ:وشەیەکی فەرەنسیە بەواتای بایەخدان بەجوانکاری ناوەوە دێت(امال حليم الصراف:موجزفي التاريخ الفن، م.س.ص٩٠).

(٦٢) سعادماهرمحمد:كتاب الفنون الاسلامية، م.س.ص٢٦٠_٢٦١.

(٦٣) سعادماهرمحمد:كتاب الفنون الاسلامية، م.س.ص٢٦٠.

(٦٤)ئەگەرچی لەپێش ئەویشدا چاکسازی هەبووە بەڵام چاکسازی تەواووگەورە لەسەردەمی (سوڵتان سەلیمی سێیەم ١٧٨٩-١٨٠٧ن) دەست پێدەکات.بڕوانە(محمودعلي عامر:الدولة العثمانية(تاريخ ووثائق)،ط١،دمشق_سوريا،٢٠٠١م،ص١٨٦.)

(٦٥) عفيف البهنسي:موسوعة التراث المعماري، م.س.ص٣٦٥.

(٦٦) عفيف البهنسي:موسوعة التراث المعماري، م.س.ص٣٦٥.

(٦٧) العمارة الاسلاميةفي بورصة _الاميراسماعيل محمد.بڕوانە:
W W W.ISLAMICHISTORY.NET/FORUM/ARCHIVE...

(٦٨) عفيف البهنسي:موسوعة التراث المعماري، م.س.ص٣٦٥_٣٦٦.

(٦٩) نعمت اسماعيل علام:فنون الشرق الاوسط في العصور الاسلامية، م.س.ص٢٢٧.

(٧٠) نعمت اسماعيل علام:فنون الشرق الاوسط في العصور الاسلامية، م.س.ص٢٢٨.

(٧١)عاصم محمدرزق:معجم مصطلحات والفنون الاسلامية،ط١،مصر_٢٠٠٠،ص٣١١.

(٧٢) نعمت اسماعيل علام:فنون الشرق الاوسط في العصور الاسلامية، م.س.ص٢٣١.

(٧٣)لەهەندێ سەرچاوە بە(گينيلى كشك)ناوى هاتووە.

(٧٤) نعمت اسماعيل علام:فنون الشرق الاوسط في العصور الاسلامية، م.س.ص٢٢٩

(٧٥)بلقيس محسن هادي:تاريخ الفن العربي الاسلامي،ط١،بغداد_١٩٩٠،ص٢٣١.

(٧٦) نعمت اسماعيل علام:فنون الشرق الاوسط في العصور الاسلامية، م.س.ص٢٣٠.

(٧٧)لەهەندێ شوێن بە(سينان ئاغا)ش ناوى هاتووە،جياوازە لەگەڵ( على سينان پاشا)كەپايەى (سەدرى ئەعزەم)ى هەبووە.بڕوانە(محمودعلي عامر:الدولة العثمانية(تاريخ ووثائق)،م.س.ص٧٠)

(٧٨) خالدعزب:تراث العمارة الاسلامية، م.س.ص٨٧.

(٧٩)قەيسەريە(قيساريە):شارێكە لەبەشى ئاسياى وڵاتى توركيا شارێكى ئاينى ئەسقوفنشين بووە ،موسڵمانەكان وبێزەنتيەكان بەبەردەوامى شەڕيان لەسەر كردووە ،تاكوو لەساڵى ١٠٨٢ز (سەلجوقيەكان)دەستيان بەسەرداگرتووە،بڕوانە(المطبعة الكاثوليكية:المنجد(في اللغةوالاعلام)، م.س.ص ٥٦٠قسم اعلام).

(٨٠) ئينكشاريەكان:لە ووشەى (يەنى چەرى)توركى كەبەماناى (سوپاى تازە)دێت

هـاتووە، بەسـوپای نیزامـی عوسمانیـەکان دەگـووترا ،سـەربازەکان لەومندالـە ناموسـلمان ومەسـیحیانە پێکهاتبوون،کەبـەپێی یاسـایەکی سـەربازی تایبـەت پـەروەردەدەکران ودەخرانــە خزمــەتی ســەربازی بــۆ دەولــەتی عوسمــانی، ئینکــشاریەکان رۆلــی کاریگــەریان لەمێــژووی دەولــەتی عوسمــانی هەبووە،بڕوانــە(هــاملتون جیــب وهارولــدبوین:المجتمــع الاســلامی والغرب،م.س،ص١٠٣).هەروەها بڕوانـە (محمـودعلي عـامر:الدولـة العثمانيـة(تـاريخ ووثائق)، م.س.ص٣٨).

(٨١) نعمــت اسماعيــل عــلام:فنــون الــشرق الاوســط في العــصور الاســلامية، م.س.ص٢٢٧.

(٨٢) خالدعزب:تراث العمارة الاسلامية، م.س.ص٨٧.

(٨٣) عفيف البهنسي:موسوعة التراث المعماري، م.س.ص٢٩٠.

(٨٤) مزگــەوتی شــاهزادە: دەکەوێتــە (ئەســتەنبۆل) لەســالی ١٥٤٤زلەسەردەمی(سولتان سلێمانی قانونی)دروستکراوە .لەکۆمەلگایەك پێك دێت کەمزگــەوت وتەکیەوقوتابخانــەی تێدایــە بەیــەکێك لەشـاکارەکانی(سـینان)دەژمێـردرێ.بڕوانـە: عفيـف البهنـسي:موسـوعة الـتراث المعماري، م.س.ص٣١٢.

(٨٥) خالدعزب:تراث العمارة الاسلامية، م.س.ص٩٠_٩١.

(٨٦) عفيف البهنسي:موسوعة التراث المعماري، م.س.ص٣١٢.

(٨٧) خالدعزب:تراث العمارة الاسلامية، م.س.ص٨٧.

(٨٨) عفيف البهنسي:موسوعة التراث المعماري، م.س.ص٣٧.

(٨٩) عفيف البهنسي:موسوعة التراث المعماري، م.س.ص٣٧.

(٩٠) عفيف البهنسي:موسوعة التراث المعماري، م.س.ص٨٤.

(٩١) نعمــت اسماعيــل عــلام:فنــون الــشرق الاوســط في العــصور الاســلامية،

م.س.ص٢٢٨.

(٩٢) عفيف البهنسي:موسوعة التراث المعماري، م.س.ص٩٦.

(٩٣) عفيف البهنسي:موسوعة التراث المعماري، م.س.ص٢٢.

(٩٤)دۆلمە باخچە:وشەیەکی لێکدراوی تورکیە بەمانای (باخی پڕکراوە)دێت،بڕوانە:نۆیل باربەر:فەرمانڕەوایانی قۆچی زێڕین،و:ڕێبوارکەریم،هەولێر،٢٠٠١،ل١٢٥.

(٩٥) عفيف البهنسي:موسوعة التراث المعماري، م.س.ص١٢٨

(٩٦)سەبارەت بە کاروبارەکانی ناو کۆشکی (تۆب کابی)بڕوانە: (محمودعلي عامر:الدولة العثمانية(تاريخ ووثائق)، م.س.ص٩٧.)

(٩٧)عفيف البهنسي:موسوعة التراث المعماري، م.س.ص١٢٨.

(٩٨) عفيف البهنسي:موسوعة التراث المعماري، م.س.ص٢٣٠.

(٩٩) نۆیل باربەر:فەرمانڕەوایانی قۆچی زێڕین،س،پ،ل١٢٥.

(١٠٠) نۆیل باربەر:فەرمانڕەوایانی قۆچی زێڕین،س.پ،ل١٢٥_١٢

لیستی سەرچاوەکان:

یەکەم:سەرچاوەکان بەزمانی عەرەبی

(١)احمدعبدالرحيم مصطفى:في اصول التاريخ العثماني،ط٣،مصر،٢٠٠٣.

(٢) امال حليم الصراف:موجزفي التاريخ الفن،ط٢،عمان_الاردن،٢٠٠٩.

(٣)اوليغ ضرابر:المنمنمات(مدخل الى الفن التصوير الفارسي،ت:عبدالاله الملاح،دمشق،٢٠٠٧

(٤)بلقيس محسن هادي:تاريخ الفن العربي الاسلامي،ط١،بغداد،١٩٩٠.

(٥)خالدعزب:تراث العمارة الاسلامية،ط١،القاهرة_مصر،٢٠٠٣

(٦)خليل اينالجيك:تاريخ الدولة العثمانية(من النشوءالي انحدار)،ت:م.الارناووط،ط١،بيروت_لبنان،٢٠٠٢.

(٧)سعادماهرمحمد:كتاب الفنون الاسلامية،ط١،مصر،١٩٨٦.

(٨)عاصم محمدرزق:معجم مصطلحات والفنون الاسلامية،ط١،مصر،٢٠٠٠.

(٩)عاصم محمدرزق:الفنون العربية الاسلامية،ط١،مصر،٢٠٠٦.

(١٠)عفيف البهنسي: تاريخ الفن والعمارة،ط١،دمشق_٢٠٠٣.

( ١١)عفيف البهنسي:موسوعة التراث المعماري،ط١،ج١_ج٢،دمشق_٢٠٠٤.

(١٢)محمد فؤادكوبريلي:قيام الدولةالعثمانية،ت:احمدسعيدسليمان،مصر،١٩٦٧.

(١٣)محمودعلي عامر:الدولة العثمانية(تاريخ ووثائق)،ط١،دمشق_سوريا،٢٠٠١ .

(١٤) نعمت اسماعيل علام:فنون الشرق الاوسط في العصور الاسلامية،ط١،مصر،١٩٧٤.

(١٥)وديع ابوزيدون:تاريخ الامبراطوريةالعثمانية(من التاسيس الى السقوط)،ط١،عمان_الاردن،٢٠٠٣.

(١٦) هاملتون جيب وهارولدبوين:المجتمع الاسلامي والغرب،ط١،ت:عبدالمجيدالقيسي،ج١،دارالمدى،١٩٩٧

دووەم:سەرچاوەكان بەزمانی كوردی:

(١٧) راجرسێڤری:ئێرانی سەردەمی سەفەوی ،و:سەلاحەدین ئاشتی ،چ١،سلێمانی،٢٠٠٧.

(١٨) محمدسوهەیل تەقوش:عوسمانیەكان(لەدامەزراندنی دەوڵەت تاكودەتا) چ١،و:نەریمان خۆشناو،مستەفا سەیدمینە،هەولێر،٢٠٠٩.

(١٩)نۆیل باربەر:فەرمانڕەوایانی قۆچی زێڕین،و:ڕێبواركەریم،هەولێر،٢٠٠١.

سێیەم:فەرهەنگ

(٢٠)المطبعة الكاثوليكية:المنجد(في اللغةوالاعلام)،ط٢٧،بيروت_١٩٨٦.

چوارەم:سەرچاوەی ئەلیكترۆنی:

(٢١)العمارة الاسلاميةفي بورصة _ الاميراسماعيل محمد.بروانە:
W W W.ISLAMICHISTORY.NET/FORUM/ARCHIVE...

# پەیوەندی بنەماڵەی زەند و میرنشینی ئەردەڵان

ئاکام جمال محمد

## پێشەکی

گەلێك توێژینەوەی فراوان و بە پێز کراوە, لەسەر میرنشین و دەسەلاتە کوردییەکانی سەدەکانی رابردوو, بەلام بەشێکی زۆری ئەم توێژینەوانە ئامانجیان دیاریکردنی سەرهەڵدان و هۆکارەکانی لەناوچونیان خستۆتە ڕوو, بەلام لایەنی پەیوەندی سیاسی و سەربازی و کۆمەلایەتی ...هتد, ئەم میرنشین و دەسەلاتە کوردییانە, نەخراونەتە بەر توێژینەوە, بۆیە ئێمەش هەوڵماندا ئەم توێژینەوەیە, تایبەت کەین بە پەیوەندی نێوان میرنشینی ئەردەلان و بنەماڵەی زەندییەکان.

ئامانجی ئەم توێژینەوەیە بریتی یە لە دەرخستنی پەیوەندی سیاسی و سەربازی و کۆمەلایەتی و ئابورییەکان لە نێوان میرنشینی ئەردەلان و بنەماڵەی زەندییەکان, هەروەها دیاریکردنی ئەو هۆکارانەی کە پالنەربوون لە خراپی پەیوەندی نێوان ئەم دوو دەسەلاتەدا, بۆ ئەم توێژینەوەیە ڕێبازی مێژوویمان بە بنەما وەرگرتووە و تێیدا دەقەکانمان کۆکردۆتەوە و پاشان شیمانکردونەتەوە, هەروەها لەچەند ڕوویەکەوە بەراوردکاریمان کردووە.

لە ڕووی پێکهاتەشەوە ئەم توێژینەوەیە لە سێ بەشی سەرەکی پێکهاتووە:

**بەشی یەکەم: کورتەیەکی مێژووی بنەماڵەی زەند و میرنشینی ئەردەلان :**

**لە باسی یەکەمی** ئەم بەشەدا, کورتەیەکی مێژووی بنەماڵەی زەندییەکانمان خستۆتە ڕوو, لەسەرەتای دەرکەوتنیان لە ئێران, هەروەها هاتنەسەر دەسەلاتی

کەریم خان و جێگرەوەکانی ، هەروەها پێشتر باسی کورتەیەکی مێژووی ئەفشاری و ئەفغانییەکانمان خستۆتە ڕوو کە لەپێش بنەماڵەی زەندەکان لە ناوچەکانی ئێراندا لە ململانێیەکی بەهێزبوون بۆ گرتنە دەستی کورسی دەسەڵات.

**لە باسی دووەمدا:** کورتەیەکی مێژووی میرنشینی ئەردەڵانمان خستۆتە ڕوو لەسەرەتای دەرکەوتنیان و دەست نیشانکردنی ساڵی دەرکەوتنیان و ناوچە جوگرافییەکانی ژێردەسەڵاتیان.

**بەشی دووەم: پەیوەندییە سیاسی و سەربازییەکان :**

لەم بەشەدا باسی سەرەتای دەرکەوتنی پەیوەندییە سیاسی و سەربازییەکانی نێوان میرنشینی ئەردەڵان و بنەماڵەی زەندییەکان کراوە, لە دوو قۆناغدا, یاخود لەدوو باسدا:

**باسی یەکەم:** پەیوەندییە سیاسی و سەربازییەکان لەسەردەمی کەریم خاندا .

**باسی دووەم:** پەیوەندییە سیاسی و سەربازییەکان لەسەردەمی جێگرەوەکانیدا .

**بەشی سێیەم: پەیوەندییەئابوری و کۆمەڵایەتییەکان**

لەم بەشەدا, ئەوهۆکارانە خراونەتە ڕوو کە بوونەتە بەربەست و هۆکار لەبەردەم نەبوونی, یاخود نە ڕەخساندنی پەیوەندی ئابووری و کۆمەڵایەتی لەنێوان بنەماڵەی زەند و میرنشیتی ئەردەڵان, ئەم بەشەش لە دوو باس پێکهاتووە:

**باسی یەکەم :** پەیوەندیە ئابورییەکان .

**باسی دووەم :** پەیوەندییە کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیرییەکان .

لەم توێژینەوەیەدا گەلێك کێشەو بەربەست هاتوونەتەڕێگەمان, لەوانە کەمی سەرچاوە بەزمانی کوردی لەسەر بنەماڵەی زەندییەکان, بە تایبەت لەسەر لایەنی ئابوری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیرییان, هەمان کێشەش لەسەر میرنشینی ئەردەڵان هاتە ڕێگەمان, چونکە بەشێکی زۆری سەرچاوەکا ن بەزمانی فارسین,

ئەگەرچی ئێمە بەهۆی یارمەتیدانی هەندێك لە هاوڕێیانمان, توانیومانە سوود لە دوو سێ سەرچاوەی فارسی وەربگرین, بە وەرگێڕانی بۆ سەرزمانی کوردی, بەڵام نەبوونی کات, ڕێگەی پێنەداین کە هەموو ئەو سەرچاوانە وەرگێڕینە سەر زمانی کوردی و سوودی لێوەرگرین, کەواتە نەزانینی زمان, کۆسپێکی سەرەکی یە لە ڕێگەی ئەم توێژینەوەیە, بەتایبەت زمانی فارسی , لە کاتێکدا کتێبخانەی فارسی ئەرشیفێکی دەوڵەمەندی لەسەر فەرمانڕەوایەتی یەکانی ئێران هەیە, بەتایبەت لەسەر بنەماڵەی زەندییەکان.

ئەوسەرچاوانەی کەڵکمان لێوەرگرتوون بەشێکی زۆریان بەزمانی کوردی نوسراون, یاخود وەرگێڕدراونەتە سەرزمانی کوردی, کەڵکمان لە سەرچاوە عەرەبی یەکانیش وەرگرتووە, هەروەها سێ سەرچاوەی فارسیش, هەروەها بۆ ئەوەی توێژینەوەکە ڕەهەندی دیکەش بگرێتەوە, کەڵکمان لە سەرچاوەی ئەلکترۆنیش وەرگرتووە.

لەم توێژینەوەیەدا پشتمان بە چوار سەرچاوەی سەرەکی بەستووە, یاخود دەتوانین بڵێین چوارسەرچاوەی سەرەکی هەن, کە زۆر سوودمان لێبینیوە, ئەوانیش:

١- نەوشیروان مستەفا : کوردو عەجەم .

٢- جان ڕ.پێری : کەریم خانی زەند.

٣- مەستورەی کوردستانی: مێژووی ئەردەڵان .

٤- ی. ئـی. ڤاسیلیا: کوردستانی خـواروی ڕۆژهـەڵات لەسەدەی حەڤدەوە تا سەدەی نۆزدە .

لە کۆتایدا هیوادارین توانیبێتمان کەلێنێك لە بۆشایی کتێبخانەی کوردی پڕبکەینەوە, بەوکارەی ئەنجامانداوە.

بەندی یەکەم

کورتەیەکی مێژوویی لەسەر میرنشینی ئەردەڵان و بنەماڵەی زەند .

بەشی یەکەم /

تەوەرەی یەکەم : کورتەیەکی مێژووی لەسەر ئەفشاری و ئەفغانییەکان .

تەوەرەی دووەم: کورتەیەکی مێژووی لەسەر بنەماڵەی زەندییەکان .

بەشی دووەم /

کورتەیەکی مێژووی لەسەر میرنشینی ئەردەڵان .

بەندی یەکەم

کورتەیەکی مێژووی لەسەر میرنشینی ئەردەڵان و بنەماڵەی زەند .

بەشی یەکەم / تەوەرەی یەکەم: کورتەیەکی مێژووی لەسەر ئەفشاری وئەفغانییەکان

گەربڕوانینە مێژووی وڵاتی ئێران, لەدوای جەنگی چاڵدێرانەوە و شکستی "شائیسماعیلی سەفەوی", دەبینین سنووری ئەو ناوچەیە بۆتە جێگای ململانێ و شەڕ و کوشتار لەپێناو دەسەڵاتگرتنە دەست و داگیرکردنی ناوچەکە.ئەفشارییەکان یەکێکن لەو خێڵانەی کە هەمیشە لەململانێدا بوون, ئەفشارییەکان بەلقێکی خێڵی " ئوغوز"ی تورکمانی دادەنرێن, لەسەدەی دوانزەیەمی زایینەوە هاتونەتە خاکی ئێران و حوکمی مەڵبەندە جۆراو جۆرەکانی ئێرانیان بەدەستەوە بووە لەوانە ئووشلوو, قۆرقلوو, گوندوزلوو (١) .

خێڵی ئەفشار پشتاوپشت دەچنەوە سەر ئەوشاری کوڕی بۆڵدووزخان کوڕی قەرەخان و ئێلخانی خواپەرست..., ئەم خێڵانە لە هەرێمەکانی خۆراسان, فارس, ئازربیجان نیشتەجێ بوون(٢).

نادرشای ئەفشاری یەکێکە لەو ئەفشارییانەی کە لە ئێراندا دەسەلاتی گرتۆتەدەست, نادرشا پاش ئەوەی توانی خەلکێکی زۆر لەخۆی کۆبکاتەوە و یەکێك لە شاخەکانی خۆراسانی هەلبژارد و کردییە پەناگەو بنکەی خۆی, لەوێشەوە دەستی کرد بەفراوانکردنی دەسەلاتی خۆی لەو ناوچانەدا, بۆیە هێرشی کردەسەر(ئینسابور)و دەستی گرت بەسەریا, دوای ئەوەش چووە خزمەت شا (طهماسب ی دووەم) دژی ئەفغانیە داگیرکەرەکان, رۆلێکی بالای بینی لەدەرکردنی ئەفغانییەکان, بەدەست هێنانەوەی ئەو ناوچانەش کەداگیریان کردبوو, ئەو ناوچانەش کە روسەکان و عوسمانیەکان دەستیان بەسەراگرتبوو, دوای ئەوەش دەستی گرت بەسەرکورسی دەسەلات لە ئێراندا لە سالی (١٧٣٩ز) تا سالی (١٧٤٧ز), نادرشا بە شەرەنگێزی و فراوانخوازی ناسرابوو, ئەمەش بووە بارگرانی بۆ سەر ژیانی ئێرانییەکان, چونکە بەرێوبردنی ئەو هێرشانەی کە نادرشا ئەنجامی ئەدا لەسەر شانی ئەو خەلکە بوو(٣) .

نادرشا لەپێناو فراوانکردنی دەسەلاتەکەی گەلێك سیاسەتی توندوتیژ و شەرو کوشتاری دژ بە کوردەکان بەکارهێنا, لەمانگی شوباتی (١١٤٣ك/١٧٣٧ز)دا کوشتارێکی گەورەی لە کوردەکانی بەختیاری وفەیلی ئەنجامدا و گەلێکی بەدیل گرتن, چەندین هەزار مالی لەو خێلانە لەناوچەی خۆیانەوە گواستەوە بۆ ناوچەکانی خۆراسان, ئەمەش بووە هۆی نارەزایی کەریم خانی زەند, بۆیە لەگەل هاو عەشیرەتەکانی کەوتە لەشکری نادر شاوە (٤) .

ئەفغانییەکانیش وەك ئەفشارییەکان دەستێکی زۆریان هەبووە, لەو ململانێ و شەرانەی لە خاکی ئێراندا کراوە لەسەر کورسی دەسەلات, لەدیارترین ئەو سەرکردەیەی کە جلەوی دەسەلاتی لەخاکی ئێراندا گرتە دەست ئەحمەد خانی ئەبدالی بوو, پاش ئەوەی بەخۆی و سوپایەکەوە گەیشتە قەندەهار, کە لەو شارەدا کاروانی گواستنەوەی ئەو زێرو جەواهیراتەی لەهیندەوە بەرەو ئۆردوگای

نادر بەڕێوەبوو , توانی دەست بگرێت بەسەریدا و لە ئۆکتۆبەری (١٧٤٧ز) وەك پاشای ئەفغانستان لەسەر تەختی پاشایەتی لێی دانیشت و بناغەی فەرمانڕەوایەتی دەورانی و ئەفغانستانی تازەی ڕۆنا(٥) .

کەواتە پێش ئەوەی کەریم خانی زەند بێتە سەر کورسی دەسەڵات, ناوچەکە لە ژێر ململانێ و کاریگەری ئەفشاری و ئەفغانییەکان دابووە، دەسەڵاتی ئەو سای دەوڵەتی عوسمانیش لەو لاوە یەکێك بووە لەهۆکارەکانی نەبوونی ئارامی و ئاسایشی ناوچەکە .

تەوەرەی دووەم: کورتەیەکی مێژووی بنەماڵەی زەندییەکان

زەند, هۆزێکی کوردی ڕۆژهەڵاتی کوردستانە, لە (١٧٥١ز – ١٧٩٤ز)حوکمی ڕۆژئاوای ئێرانیان کردووە, زەند لەبنەماڵەی (لەکن), "نادرشا" لەساڵی (١٧٣٢ز)دا, ئەوانی لەزێدی باپیرانیان لە چەقی کێوەکانی زاگرۆسەوە, بۆخۆراسان ڕاگویزاوە, بەڵام پاشان کە "نادر شا" کوژرا, زەندەکان بەسەرکردایەتی "کەریم خانی زەند", بەشەڕ توانییان ڕێی خۆیان پاك بکەنەوە و بۆ زێدی خۆیان بگەڕێنەوە(٦). یەکێك لەنەریتەکانی زەند بریتی بووە لەوەی کە ژنەکانیان لەکاتی شەڕو هێرشدا بەشداری بکەن و یارمەتی مێردەکانیان بدەن(٧).

ناوبانگی بنەماڵەی زەندییەکان بەناوی "کەریم خانەوە" بەندە, کەریم خان توانیی لەشکرێکی گەورە لە عەشایری زاگرۆس پێك بێنێ و هاوپەیمانی لەگەڵ بیورۆکرات و گەورە کەسایەتییەکانی شارە گرینگەکانی ڕۆژئاوای وڵاتی ئێران دابمەزرێنێ, ئەو هاوپەیمانییە شارەکانی ئیسفەهان و شیراز و تەورێز و کرمانی لەخۆگرتبوو(٨).

لەساڵی (١٧٤٦ز) کاتێك "نادر شای ئەفشاری" کوژرا(٩). ئومەراکانی خاکی ئێران دەستیانکرد بە تەقەلای سەربەخۆیی پێکهێنانی حکومەت بەناوی خانەدانی خۆیانەوە, لەناو ئەمانەدا سەردارانی کورد لەهەموویان زیاتر بۆ ئەم

مەبەستە هەوڵیانداوە, یەکێك لەوانە "کەریم خان" بووە, هەرچەندە خاوەن سەردار و عەشرەت نەبووە, بەڵام متمانەی بەخۆی هەبووە کە حکومەتێکی سەربەخۆ پێکەوە بنێت(١٠),دواجار توانی حکومەتی زەند لەساڵی (١٧٥٣ن) لەهەرێمی فارسدا دابمەزرێنێت(١١),وە توانی لەباشوری فارسدا جێگیربێت و(شیراز)بکاتە پایتەختی فەرمانڕەوایەتییەکەی (١٢). "کەریم خانی زەند" جێگەی شانازی ئێرانییەکانبووە و شانازی یەکی زۆریان پێوەکردووە, چونکە یەکەم ڕەگەزی ئێرانییە, کە فەرمانڕەوایی بەسەر خاکی ئێراندا کردووە(١٣). بۆزیاتر ئاشنابوون بەکەسایەتی کەریم خانی زەند بڕوانە وێنەی ژمارە (شەش وحەوت) .

هەرکە "کەریم خان" بوو بە پاشای ئێران,لەلایەن سوڵتانی عوسمانی " عەبدول حەمید"ەوە, کاغەزێکی بۆنێردراو بەپاشای ئێرانی ناسی و ئەو عەهد و پەیمانەی کە لە کاتی "نادر شادا" کرابوو, بۆی تازەکردەوە,بۆ میری میرانی سنوری نووسی کە ئەو پەیمانە ڕابگرن وچاودێری دراوسێیەتی بکەن(١٤).

"کەریم خان" شاری شیرازی کردە پایتەخت و لەسەرتادا ناوی (وکیلالدولە)ی لەخۆی نا, دواتر(وکیل رعیە), جارجاریش(وکیل خلائق), "کریم خان" نەی دەویست کە پیێ ی بوترێت شا لەسەر بنەمای ئەوەی کە "شا ئیسماعیلی سێیەم" شابووە و ئەم جێگری بووە, دوای مردنیشی نەیویستوە کە نازناوی شا هەڵگرێت(١٥).

سەردەمی حکومەتی "کەریم خانی زەند" , بەسەردەمی زێڕین و سەقامگیری داد و ئاشتی و ئاسایش لە ئێراندا دادەنرێت, کە توانی سەرجەم ناوچەکانی ( گەیلان و ئازەربیجان و کوردستان و عەرەبستان و بلوچستان) بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە, تەنانەت لەساڵی (١٧٧٦ن)دا شاری بەسرەی گرت و خستیە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە (١٦) .

هەروەها, کونسوڵی فەرەنسا لەبەغداد, لەنامەیەکدا کە ساڵی (١٧٦٣ز) بۆ پاریسی ناردووە, لەبارەی کەریم خانەوە دەنووسێ: " لەژێر ڕابەرایەتی کەریم خاندا کە خاوەنی نفووزێکی شەخسی و ئاکارێکی زانایانەیە, وادیارە وڵات کەوتۆتە گەشەکردن و گەیشتۆتە هێمنایەتی و دامەزراوی, ئاسایش و هێمنی جێگای ئاژاوە و شەڕو هەرای گرتۆتەوە"(١٧). بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە نەخشەی ژمارە (١) .

"کەریم خانی زەند" لەسەردەمی دەسەڵاتداریدا گەلێك هێرشی ئەنجامداوە, بۆنمونە لەساڵی (١١٨٩ھ/ ١٧٨٣ز) بڕیاری دا کە لە سێ لاوە لەشکر بنێرێتە سەر خاکی عێراق و شارەزوور و بەسرا, چونکە لەبەر چەند شتێك دڵی لەوالی بەغداد ڕەنجابوو(١٨).

دواجار"کەریم خانی زەند" , لە ساڵی (١٧٧٩ز) , لەتەمەنی هەشتا ساڵید کۆچی دوای کرد(١٩) .

مردنی "کەریم خان", تێکچوونی مەبدەئی حکومەتی زەند و پەشێوی مەملەکەتی ئێران بوو(٢٠). لەدوای مردنی کەریم خان, کەسایەتی یە ناودارەکانی ناو بنەماڵەی زەند, بۆ گەیشتن بە دەسەڵات, کەوتنە ململانێ و شەڕکردن دژی یەکتر, هەر بەم هۆیەوە بوو کە تا چەند ڕۆژێ لاشەی مردووی کەریم خان بەخاك نەسپێردرا, هەروەها ژمارەیەك لە کەسایەتی یە ناودارەکانی زەند کوژران(٢١). ئەم دوژمنایەتی و ململانێ یەی کە لەناو حکومەتی زەندا پەیدابوو, بووە هۆکار و ڕێ خۆشکەر بۆ هەندێ لەحاکم و والیەکانی دەرەوەی خانەوادەکانی زەند, بۆخیانەت کردنی جۆراو جۆر لەوانە "حاجی ابراهیمی کلانتر" کە حاکمی شیراز بوو(٢٢).

کەسایەتی یەکی وەکو "زەکی خان" کە زڕ برای کەریم خانی زەند بوو, هەرلەدوای مردنی کەریم خانەوە, حکومەتی هێنایە ژێر دەستی خۆی, دواتر

گەلێك کەسی تر هاتنە سەر دەسەڵاتی حکومەتی زەند, بەڵام دواجار بەکوشتنی "لطف علی خان" حکومەتی زەند کۆتایی پێهات لەساڵی (١٧٩٤ز)(٢٣).

پاش ڕووخاندنی ئەم حکومەتە کە بۆ ماوەی چل و یەك ساڵ فەرمانڕەوایی تەختی ئێرانیان کرد, ئاغا "محمد خانی قاجار"(٢٤). لەتۆڵەی کوشتنی "کەریم خان" و "لطف علی خاندا" , کوشتارێکی زۆری بەرامبەر بەکوردەکان و ڕابەرانی زەند کردووە, زۆربەی هۆزەکانی بۆ چەند جێگایەکی دووری ئێران ڕاگواستووە, وە هۆزی تورکمانی خستۆتە جێگایان (٢٥) . بۆ زیاتر ئاشنابوون بەکەسایەتی ئاغا محمد خان قاجار, بڕوانە وێنەی ژمارە (٩) .

بەشی دووەم / کورتەیەکی مێژووی میرنشینی ئەردەڵان

لەدوای بڕانەوەی سەڵتەنەتی جەنگیزخان لەخانەوادەی ( ئەتابکانی لوڕ ), خانەوادەی ئەردەڵانی پێگەیشت, ئەوەڵ حاکمیان ناوی "بابە ئەردەڵان " بوو, بەڵام ناوی خۆی نابوو بە " قوباد بەگی کوڕی فەیرۆزی ساسانی" (٢٦). بابە ئەردەلان بەدامەزرێنەری میرنشینی ئەردەڵان دادەنرێت لەناوچەی شارەزوور, ئەم میرنشینە میرنشینی (شارەزوور)یشی پێدەڵێن (٢٧). سەبارەت بەساڵی دامەزراندنی ئەم میرنشینە گەلێك ڕاو بۆچوونی جیاواز هەیە لەنێو مێژوو نووساندا, محەمەد ئەمین زەکی بەگ دەڵێت: ( بابە ئەردەلان لەکۆتایی سەدەی یانزەی زایندا گەیشتۆتە شارەزوور پاشان چۆتە لای گۆرانەکان و ماوەیەك لەگەڵیاندا کۆچڕەویی کردووە, دوایی لەکاتی هێرشی جەنگیزخاندا بۆ سەر ئێران پشتگیری هێزەکانی مەنگۆلیای کردووەو لەپاداشتی ئەوەداکراوە بەفەرمانڕەوایی شارەزوور)(٢٨).

هەروەها بۆچوونێکی تر سەرەتای حوکمی ئەردەڵانی بۆ دەوری دەسەڵاتدارێتی تەیمور(١٣٠٥ز-١٣٧٠ز)دەباتەوە, دەڵێت: ( ئەمانە بۆ ناوچەی

بالانکـان هـاتن, ماوەیـەك لـەوێ لـەناو گۆڕانەکانـدا مانـەوە, تـەیموری گورگـان شارەزووری بەبابە ئەردەڵان بەخشی و ئەم ماوەیەك تادوایی ژیانی ئەم ناوچەیە و شارەزووری حوکم کرد) (٢٩).

بەهـەرحاڵ مێـژووی دەسـەڵاتی ئەردەڵانییـەکان لـەنێوان کۆتـایی سـەدەی یـانزە و ناوەراسـتی سـەدەی چـواردەدا دەسـت پێـدەکات, واتـا لـەقۆناغێکی دواکەوتووی پەیوەندی خێڵایەتی کۆمەڵگای کوردیداو لەبارودۆخێکدا کەسیماکانی نەتەوە لەکوردستاندا تەنیا لەروانگەی زمان و نەژادەوە بـوونی هـەبووە, تەنانـەت لەو مێژووەدا ئەگـەری ئـەوەش لەئارادانـەبووە کـە دەسـەڵاتی خێڵایـەتی کـوردی سیـستمێکی یـەکگرتووی بـەڕێوەبردن دروسـت بکـات و جۆرێـك لەفیدراسـیۆنی خێڵایەتی پێك بهێنێت و بنەمای دەوڵەتێکی خێڵایەتی دابنرێت (٣٠).

شـەرفخانی بەدلیـسی لەشـەرفنامەدا, بـەم شـێوەیە دێتـە سەرباسـی بابەئـەردەڵان و دەبێـژێت: بابـە ئـەردەڵان لـەوخاوەن زۆرانـە بـوو کـە زۆریـان نەبردووە و بەربەستی فـەرمانرەوایی مەڵبەنـدی شـارەزووری کـردووە و پیـاوێکی وورد و کـارزان و بەدەسـت و بـرد بـووە و لەماوەیـەکی کەمـدا زۆری پـەل هاویشتووە و برەوی بەقەڵمڕەوی خۆی داوە و زۆر پان و پۆر کردۆتەوە ...., کاتێ بابا ئەردەڵان سەرزەمینی جێ هێشتووە, " کلۆڵی" کوڕی لەجێگەی دانیشتووە و ئەویش پاش ماوەیەك لە حکومداری مردووە (٣١).

پاشـان نـاوی ئـەو کەسـانەمان بـۆ تۆماردەکـات کەیـەك لـەدوای یـەك فەرمانرەوایی ئەردەڵانیان کردووە, کەبەشی زۆریان لەدوای مردنیان, کوڕەکانیـان جێگەی گرتوونەتەوە, شەرەفخان دەبێژێت: نـەوە و نەوەچـرەکانی, کـە بەشـوێن یەکـدا شـوێنی بـاب و کاڵیـان رەچـاوکردووە, ئەمانـەن: خـدری کـوری کلـۆڵ – ئەلیاسی کوری خدر– خدری کوری ئەلیاس – حەسەن کوری خـدر– بـابلۆ کـوری حەسەن – مونزیر کوری بابلۆ (٣٢).

هەروەها شاعیری چەوساوەکانی کوردستان,(قانع) توانیویّتی بەشیعرێك, پێناسی فەرمانڕەوایانی ئەردەلانمان بۆ تۆماربکات, بەناوی ئاردەلانییەکان:

باسی بابا ئەردەلانت, بۆبکەم! چۆن پیاوێ بوو؟ / ساکنی گوڵ عەنبەرو یەك حاکمێکی کامیاب

تایەفەی گۆرانە ئەسڵی, خەڵکی خاکی شارەزوور / پایتەختی شاری زەڵمە, شاهیدی قەولم کیتاب

یادگاری پاشی خۆی ناوێ کلۆڵە, بێ درۆ / پاشی ئەو ئەلیاس و خدرو بابلۆی خاوەن عیتاب

مونزیرێك و، دووحەسەن, خدرێکی تر, ئەلیاس دوو / مستەفاخان و, عەزیزو ئەحمەدی عاشق ڕووباب

ئینقرازی ئاردەلانی,هیچ نەبوو ئیلا غروور / قەهری هیچ و پووچی زۆرو, کیبری بێحەدوحیساب(٣٣).

بەتێپەڕبوونی ڕۆژگار و لەئەنجامی ئەوەدا کەهەڵکەوتی جیۆپۆلەتیکی ناوچەکەیان, یارمەتی پاراستن و پێکەوەنانی قەوارەیەکی سەربەخۆی پێنەداون و تێکەڵ شەڕ و ململانێی خوێناوی کردوون, بۆیە لەماوەی نزیکەی (١٥٠) ساڵێکدا ناچاربوون چوار جار مەڵبەندی دەسەلات و پایتەختیان لەشوێنێکەوە بۆشوێنێکی ترجێگۆڕکێ پێبکەن...بەم جۆرەناوەندی دەسەلاتیان لە( قەلای زەڵم )ەوە بۆ قەلای (مەریوان) گواستۆتەوە, لەساڵی (٩٦٩ ك/ ١٥٦٣ز) دواتریش لە قەلای مەریوانەوە بۆ قەلای (پلنگان)و دوای ئەویش بۆ (حەسەن ئاوا)و دواین جاریش لەساڵی (١٦٣٦ز)دا, شاری (سنە)ی ئێستایان دروستکرد و بەیەکجاریی و تاتێکچونی میرنشینەکەیان, واتا تا سەرەتای نیوەی سەدەی نۆزدە, کردیانە پایتەخت و هەرلەوێدا مانەوە (٣٤).

ئەم میرنشینە بەردەوام لە پەشێوی و ئاژاوەو ناسەقامگیری دا ژیاوە,

ئەویش لەژێرکاریگەری دووفاکتەردایە, کەیەکەمیان دەرکی بووەو کاریگەرییەکی خراپی هەبووە ئەویش دەوری خراپی عوسمانی یەکان و فارسەکان بووە, هەم لەهێرشکردنیاندا بۆ سەر ئەم میرنشینە و هەم لەهەوڵیاندا بۆ لاوازکردنی دەسەڵات ونفوزی میرنشن و دروستکردنی ناکۆکی و ئاژاوەی ناوخۆ لەسنووری ئەم دەسەڵاتەدا. دووەمیان هۆکاری ناوخۆیە, کەبریتی بووە لەناکۆکی و نارێکی ناو بنەماڵەی میران لەلایەك و لەلایەکی تریشەوە ناکۆکیان لەگەڵ خێڵ و عەشیرەت و میرنشینەکانی تری کورددا بەتایبەتی میرنشیتی بابان (٣٥).

هەرچی دانانی میرەکان و دروستبوونی کێشەش لەسەری لەلایەن دەسەڵاتی دەوڵەتی ئێرانەوە یەکلای دەکرایەوە.. میرانی ئەردەڵان بەرەزامەندی شاهەکانی ئێران دادەنران و لادەبران (٣٦).

میرنشینی ئەردەڵان لەرووی هونەر و وێژەوە گەلێك بایەخیان بە زانست و هونەر و وێژەداوە , هەروەها گەلێك زانستگای ئاینیان دامەزراندووە,(٣٧) لەنێو ئەم میرنشینەدا کەسایەتی یەکی گەورەی وەکو " ماه شەرف خانم"(٣٨) دەرکەوتووە کە دەورێکی گەورەی بینیوە لەروانگەی ئەدەب و هونەر لەنێو میرنشینی ئەردەلاندا, " ماه شرف خانم" ناسراوە بە " مەستوورەی کوردستانی" هاوسەری " خوسرەوخانی" میری میرنشینی ئەردەڵان بووە, مەستوورە کتێبی (مێژووی ئەردەڵان)ی نووسیوە و دووهەزار دێر شیعری هەبووە(٣٩). بۆزیاتر ئاشنابوون بەکەسایەتی مەستوورە بروانەی وێنەی ژمارە (٥).

نوسەری رووسی (یڤگێنی ئیلینچنا ڤاسیلێیڤا), دەربارەی مەستورەی کوردستانی بەم شێوە یە باسیدەکات: (ئەوەندەی ئێمە بزانین, لەهەموو رۆژهەڵاتی ناوەراست و نزیکدا, تاکۆتایی سەدەی نۆزدەیەم, مەستوورە تاقە ئافرەتێکی مێژوونووس بووە) (٤٠) .

دواجار میرنشینی ئەردەڵان لەساڵی (١٨٦٨ن) دەسەڵاتی خۆی لەدەست ئەدات و بەرەو نەمان ئەچێت (٤١).

بەندی دووەم

پەیوەندییە سیاسی و سەربازییەکان .

بەشی یەکەم /

پەیوەندییە سیاسی و سەربازییەکان لەسەردەمی کەریم خاندا .

بەشی دووەم /

پەیوەندییە سیاسی و سەربازییەکان لەسەردەمی جێگرەوەکانی کەریم خاندا.

بەندی دووەم

پەیوەندییە سیاسی و سەربازییەکان

بەشی یەکەم / پەیوەندی سیاسی و سەربازی لەسەردەمی کەریم خانی زەندا:-

سەرەتای دەرکەوتنی ناکۆکی لەنێوان میرنشینی ئەردەڵان و بنەماڵەی زەندییەکان, بەتایبەتی لەسەردەمی" کەریم خانی" زەندا ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوکاتەی کە "حەسەن عەلی خان" والی کوردستان(سنە)بوو, لەسەرداوای "میهر عەلی خان" چووە بۆ سەرکوتکردنی "کەریم خانی زەند" و لەشکری(زەند) بۆ ناوچەی (هەمەدان) و لەدوایشدا دوایان کەوتووە بۆناوچەی (پەری و کەمازان), کە مەڵبەندی ژیانی خێڵی زەند بووە, لەوێ ماوەتەوە تا "سەلیم پاشای" بابان هێرشی کردۆتە سەر میرنشینی ئەردەڵان ئەوساکە گەڕاوەتەوە (٤٢).

ئەمەش بووە هۆی دوژمنایەتی لەنێوان" کەریم خانی زەند" و "حەسەن عەلی خان", بۆیە "کەریم خانی زەند" بڕیاری دا کوردستان وێران بکات, ئەمەش بەهۆی قسەی کۆمەڵێك لەکەسی خراپ کە لەناو لەشکرەکەیدابوون, "کەریم خان" کەوتە ژێر کاریگەری قسەی ئەم کۆمەڵە کەسەوە, لەم کاتەدا "کەریم خانی زەند" لەسەرەتای دەسەڵاتی دا بووە, بەتەواوەتی دەستی بەسەر لەشکرەکەی نەدەڕۆیشت, بۆیە لەشکرەکەی هەرچی یەکیان ئەکرد ڕێگەی لێ نەدەگرتن, لەو

چەند ڕۆژەدا زیانێکی زۆریان بەسنەو ناوچەکانی دەوروبەری گەیاند (٤٣).

١-/ کەریم خانی زەند و شەڕی حەسەن عەلی خانی ئەردەلان:

"حەسەن عەلی خان"، وەکو بەڵێنی دابو، لەشکرەکەی لە کرماشانەوە بەڕێ بخات وبچێ بۆ یارمەتیدانی "میهر عەلی خان"، کە هێشتا لەقەڵای(ولاشجر)دا لەلایەن لەشکری زەندەوە گەمارۆ درابو(٤٤).

"حەسەن عەلی خان" سوپایەکی لەئەردەلانییەکان و تیرە و هۆزی ئۆزبەگ و ئەفغان کۆکردەوە(٤٥). پاشان بەرەو هەمەدان بەڕێ کەوت. لەشکری زەند کە بەهاتنی حەسەن عەلی خانیان زانی، دەوری قەڵاکەیان بەرداو کشانەوە بۆ ناوچەی پەری و کەمازان، کە مەڵبەندی خۆیان بوو(٤٦).

"حەسەن عەلی خان" لەنزیك هەمەدان لەناوچەی (زاغە) خێوەتگای دامەزراند، "میهر عەلی خان" بۆ پێشوازی لە"حەسەن عەلی خان" لەقەڵا دابەزی، پاشان داوای لە "حەسەن عەلی خان" کرد کە بچێ بۆ سەرکوتکردنی "کەریم خانی زەند"، "حەسەن عەلی خان" بە لەشکرەکەیەوە بەرەو پەری و کەمازان کشا، "کەریم خانی زەند" بەخۆی دا رانەپەرمو شەڕی ڕوبەڕویان لەگەڵ بکات، ژن و منداڵەکانی ناردە جێگایەکی ئەمین و خۆی و هێزەکەی دەستیان کرد بەشەڕی پارتیزانی، هەموو شەوێك پەلاماری ئەردەلانیان ئەدا و خەڵکیان لێ ئەکوشتن و وڵاخ و کەلوپەلیان لێ ئەگرتن، "حەسەن عەلی خان" چەند هەوڵی دا کە زەندییەکان لەشوێنێکا بەگیربێنێت ، بەڵام نەیتوانی بۆ ماوەی چل و پێنج ڕۆژ بارودۆخەکە بەو جۆرە مایەوە، هەتا ئەو کاتەی هەواڵ گەیشتە "حەسەن عەلی خان"، کە "سەلیم پاشای" بابان، بەهاندانی گەورەو ڕیش سپییەکانی ناوچەکە، بەلەشکرێکی هەژدە هەزار کەسییەوە هاتۆتە ناوچەی ئەردەلان، بەو مەبەستەی (سنە) بگرێت.ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە "حەسەن عەلی خان" واز لەڕاونانی زەندییەکان بهێنێت و بەپەلە بەخۆی و لەشکرەکەیەوە بگەڕێتەوە بەرەو

کوردستان (٤٧).

ئـەم ڕووداوانـەش, یـاخود ئـەم شـەڕە لـە( پەریـە(٤٨)) (٤٩). لەسـاڵی (١١٦٢ك\١٧٥٦ز ) ڕوویـداوە لـەنێوان "حەسـەن عـەلی خـان" و "کـەریم حـانی زەندا"(٥٠).

کاتێك کـە لەشکری ئەردەڵانییـەکان کشانەوە بـەرەو ناوچـەکانی خۆیـان, تاوەکو دژی میرنشینی بابانی یەکان بۆستنەوە, ئینجا "کەریم خـانی زەنـد" وازی لە ئەردەڵانییەکان نەهێناو بەدرێـژایی ڕێگـای گەڕانـەوەی ئەردەڵانییـەکان دوایـان کەوتو, پەلاماری هێزی ئەردەڵانییـەکانی دا و لێ کوشـتن, هەنـدێك جاریش وڵاخ و کـەل و پـەلی لێ گـل ئەدانـەوە, "کـەریم خـان" بـەم شـێوەیە دوای لەشـکری ئەردەڵانییەکان کەوت, تا ئەو کاتەی "کەریم خان" بـەهێزێکی حـەفتا کەسییەوە بۆسەیەکی بۆدانان, لە نزیك تویسرەکان, لەدەربەنـدێکا, کـە دەبـوو لەشـکرەکەی "حەسەن عەلی خان" بەو شوێنەدا تێپەڕێت, لـەناکاو هـەڵی کوتایـە نـاو جەرگـەی لەشـکرەکەوە و پـشێویەکی زۆری تێخـستن وهەنـدێکی لێ کوشـتن, وەتـوانی دەسـتبگرێت بەسـەر گەنجینەیـەکی "حەسـەن عـەلی خانـدا", کـە دوو ئێـستر بارەکانیان زێڕی سپی و یەك ئێستر کەبارەکەی ئەشرەفی بـوو, لەگـەڵ چـەند بـار کوتاڵ و شتی گرانبەها و چەند سەرئەسپی بـەتاڵان لێ بـردن و بەسـەلامەتی خـۆی ڕزگار کرد (٥١).

پـاش تێپـەڕبونی ماوەیـەك, دوای ئـەوەی کەسـوڵتانە عوسمانییـەکان, "سلێمان پاشای" بابان لەسەر کار لادەبەن و "سەلیم پاشا" دەخەنە شوێنەکەی, "سلێمان پاشا" پەنا دەباتە بەر "حەسەن عەلی خان" و داوای یارمـەتی لێدەکات کە دالّدەی بدات, ئەم دالّدەدانەی "سلێمان پاشا" لەلایەن "حەسەن عەلی خـانی" ئەردەلانی یەوە , دەبێتە هۆی نیگەرانی عوسمانییەکان, تـا لـە دواجـاردا لەلایـەن والی بەغـدادەو ئاگـادار دەکرێتـەوە, کـە یارمەتیـدانی "سـلێمان پاشـای" بابـان,

دەبێتە مایەی تێکچونیان لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی و ناچار ئەبن لەشکری سوپای بنێرنە سەر ناوچەی ئەردەلانییەکان (٥٢).

مەستورەی کوردستانی لە باسی ئەم شەڕەدا, دەڵێت : (( پاش ئەوەی سەلیم پاشا, ڕووی کردە مەریوان, حەسەن عەلی خانیش ڕووی کردە مەیدانی جەنگ, پاش بەرپابوونی جەنگ لە نێوان هەردوولا و کوشت و بڕێکی زۆر لەهەردوولا, دواجار ئاڵا و توانا و دەسەڵاتی ئەردەلانییەکان کەچ بوو, سلێمان پاشاش, کە مایەی ئەم چەرمەسەرییە بوو, لەگەڵ چەند دەست و پێوەندێکیدا بۆی دەرچوو )) (٥٣).

پاش گەڕانەوەی پاشا, بۆ شاری سنە, حەسەن عەلی خانیش گەڕایەوە بۆ شاری سنە, بە کۆمەکی خوسرەو بەگ و میهر عەلی سوڵتان و نەجەف قولی بەگ, کە گەورەپیاوانی کوردستان بوون کەوتنە بیری ئاوەدانکردنەوەی وڵات (٥٤).

کاتێ حەسەن عەلی خان لەگەڵ لەشکری بابان و ڕۆمدا لەگەورمەی شەڕدابوو, ابراهیم بەگی وەکیلی پشتی تێکرد و لەدژی وەستا, ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە لەشکرەکەی "حەسەن عەلی خان" توشی شکان بکات. ئالەم کاتەدا, "حەسەن عەلی خان" تووشی گەورەترین ڕووخانی سەربازی و سیاسی ببوو, چونکە ئەمە دووەم شکانی بوو لەو ماوەیەدا کەتووشی بوو. بۆیە جارێکی تر, کەریم خانی زەند لەگەڵ شێخ عەلی خانی زەند, دەرفەتیان هێناو لەگەڵ تیرەو هۆزەکانی خۆیان و عەشایەری کرماشان و زەنگەنەدا کە بیست هەزار کەسێ دەبوون بەنیازی تۆڵەسەندن, ڕوویان کردە ئەردەڵان و بڕیاریاندا داری بەسەر بەردی یەوە نەهێڵن (٥٥).

کاتێك "حەسەن عەلی خان" ئەم هەواڵەی بیست, زۆر دڵگران بوو, چونکە توانای بەربەرەکانی ئەوانی نەمابوو, بەڵام لەدوایدا مەلا مستەفای شێخ ئیسلام لەگەڵ نەجەف قولی بەگدا چوونە لای لەشکرەکەی کەریم خان, تاوەکو بارودۆخی

پەرێشانی کوردستانیان پێبڵێن کەبەدەست بابانی و ڕۆمەکانەوە خراپی بەسەردا هاتووە, وویستیان پەیوەندی نێوانیان ئاسایی بکەنەوە و دۆستایەتی یەکایان تازەبکەنەوە لەگەڵ کەریم خانی زەندا, ئەوەش لەڕێگەی پێدانی خوشکی حەسەن عەلی خانەوە بۆ کەریم خانی زەند, بەڵام هەموو ئەم هەوڵانە بێ چارەبوون, بۆیە کەریم خانی زەند هەرگیز بەمە ڕازینەبوو, ئەم هەواڵەشیان گەیاندەوە "حەسەن عەلی خان", ئەویش ڕووی کردە قەڵای قەرەتوورە کە قەڵایەکی سەخت و قایم و دژوار بوو (٥٦).

کاتێك "کەریم خان" گەیشتە شاری سنە, دەستکرا بە تاڵانکردنی سەروەت و سامانی ئەو مسوڵمان و جوولەکەو گاورانەی لەناو شاردا مابونەوە, "سلێمان پاشای" بابانیش کە لە لەشکری "سەلیم پاشای بابان" و تورکەکان هەڵاتبوو, لەچیاکان سەرلێشێواو و سەرگەردان دەگەڕا, کە هەواڵی بیستنی ڕۆیشتنی "کەریم خانی" بیستبوو بۆ شاری سنە , یەکسەر چووە سنەو خۆی گەیاندە لەشکرەکەی, کەریم خان, "شێخ عەلی خانی" لەتەك لەشکرێکی گەورەو بەهێز بۆ داگیرکردنی قەڵای قەرەتوورە بەڕێ خست, بەڵام لەبەرئەوە قەڵاکە زۆر بەهێزبوو, قەڵاکە ئازووخەی چاکی پێ دەگەیشت و حەسەن عەلی خان لەگەڵ سێ سەد کەس لەپیاو ماقوڵان لەناو قەڵاکە خۆیان حەشاردابوو ئامادەی شەڕبوون, تۆپ و تفەنگی لەشکری "کەریم خان" هیچ کارێکی تێ نەکردن, لەئاکامدا بێ ئەوەی هیچ سەرکەوتنێك بەدەست بهێنن, ناچار بەرەو پاش گەڕانەوە, ئەو هێزەش کە گرتنی ناوچەی هەورامان و شێخ وەسیم و خەڵکی سنەی لەئەستۆ خرابوو, بێ هیچ سەرکەوتنێك هەڵات و بۆ شوێنی خۆیان گەڕانەوە. بەبیستنی ئەم هەواڵە "کەریم خانی زەند" ئاگری تووڕەیی بڵێسەی سەند و زۆربەی خانووبەرەو کۆشك و تەلار و مزگەوت و فێرگەکان بەرشاڵاوی ئاگری ئەو تووڕەییە کەوتن و لەگەڵ زەویدا تەخت بوون (٥٧). بۆزانیاری زیاتر بڕوانە نەخشەی ژمارە یەك.

## ٢-/ کەریم خانی زەند وخوسرەو خانی ئەردەلان

بەپێی قسەکانی "ماه شەرەف خانم" خوسرەو خانی ئەردەلان لەساڵی (١١٧٠ ک/١٧٦٤ز) دا بووە بەفەرمانڕەوای ئەردەلان(٥٨). هەروەها بەپێی نووسراوەکانی (تحفەی ناصری) و (حدیقەی ناصری)(٥٩) خانی قاجار(٦٠) خوسرەو خانی داناوە بەوالی ئەردەلان (٦١).

بەڵام دوای کوژرانی خانی قاجار, "خوسرەو خان" ترسی لێ دەنیشێت, کە "کەریم خان" تۆڵەی لێ بکاتەوە, چونکە "خوسرەوخان" بەیارمەتی خانی قاجار, کە دوژمنی" کەریم خان" بوو, کاروباری ئەردەلانی گرتبوە دەست , لەبەر ئەوە "خوسرەوخان", کەوتە قایمکردنی قەڵاو, سازدانی لەشکر, بەڵام "کەریم خانی زەند" کە بەمەی زانی, بۆئەوەی ترسی "خوسرەوخان" بڕەوێنێتەوە, فەرمانی ولایەت وخەڵاتی بۆ نارد . بۆیە کاتێك "کەریم خان" لەتارانەوە گەیشتە سوڵتانیە, "خوسرەوخان" بۆ دەربڕینی گوێڕایەڵی و فەرمانبەری, خان ئەحمەد خانی کوڕی بەدیارییەوە ناردە لای. ئەویش ڕێزی لێ ناو, دڵنەوایی کرد, بەخەڵات و بەراتەوە ڕەوانەی کوردستانی کردەوە (٦٢) .

بەڵام لەساڵی (١١٧٦ک/١٧٧٠ز)دا کاتێك "سلێمان پاشای" بابان بەنیازی داگیرکردنی کوردستان بەسوپایەکی فراوانەوە بەرەو مەریوان ڕۆیشت, لەسەر دەستی "خوسرەو خان" تووشی شکست بوو, ئەمە وای لە "سلێمان پاشا" کرد, بۆ تۆڵەسەندنەوە بچێتە لای "کەریم خانی زەند" و خۆی وەك لایەنگری" کەریم خان" دەربخات, بۆیە هەوڵی دا "خوسرەوخان" تاوانباربکات لەلای" کەریم خان" بەهەر تۆمەتێك بێت, تاوەکو "کەریم خان" هانبدات دژی "خوسرەوخان", هەربۆئەم مەبەستەش, بری (٣)هەزار تمەن زێڕی نەختینەی پێشکەش بە"کەریم خان" کرد, هەموو ئەم فێڵانەی" سلێمان پاشا", بووە هۆی ئەوەی کینەی

دێرینی "کەریم خان" بوروژێنێت, تا لە ئەنجامدا "کەریم خان", "خوسرەوخانی" بانگ کرد بۆ شیراز, بەگەیشتنی "خوسرەوخان", "کەریم خان" بڕیاری دەست لەکارکێشانەوەی "خوسرەوخانی" ڕاگەیاند, وە لەبری ئەو "سلێمان پاشای" کرد بەحاکم و ڕەوانەی سنەی کرد (٦٣) .

"خوسرەوخان" خۆی بۆماوەی یەك ساڵ لە شیراز نیشتە جێ بوو(٦٤). بەڵام "سلێمان پاشا" پاش یەك ساڵ بەدەستی فەقێ برایم ناوێك کوژرا, لەم کاتەدا "کەریم خان", "محمد پاشای" برای "سلێمان پاشا"ی کردە حاکمی کوردستان, بەڵام دوای تێپەڕینی دوو ساڵ, نائارامیەکی زۆر کەوتە کوردستانەوە, بۆیە "کەریم خان" لە بڕیارو کردەوەکانی خۆی پەشیمان بۆوە, بەفەرمانی خۆی دووبارە "خوسرەوخان", بوو بەوالی ویلایەتی کوردستان و, بە فەرمانەوە گەرایەوە کوردستان و لەوپەڕی سەربەخۆیدا کەوتە فەرمانڕەوایی, هەوڵ و کۆششێکی زۆری کرد بۆ ئاوەدانکرنەوەو چاکردنەوەی شاری سنەو قەڵای حکومەت (٦٥).

هەروەها کاتێك "خوسرەوخان", لەزرێباری مەریوان, دژی هێرشی "محمد پاشای" بابان وەستا, تووشی شکانێکی گران هات, نزیکەی هەزار کەسی لێ کوژرا و بەشێکی زۆری هێزەکەشی بەدیل گیرا, بەڵام "محمد پاشا" لەمەریوان تێنەپەڕیبوو کە دیلەکانی ئازاد کرد و گەرایەوە قەڵا چوالان, کاتێك "کەریم خان", ئەم هەواڵەی بیست, بۆ تێ هێنانەوەی ئەو شکەستە, هێزێکی گەورەتری ناردە سەرمولکی بابانی یەکان, لەم کاتەدا "محمد پاشا" داوای یارمەتی لەوالی ی بەغداد کرد, بەڵام بەدەم داواکارییەکەیەوە نەهات, لەبەر ئەوە کشایەوە کۆیە, لەم کاتەدا لەشکری زەند بە بێ بەرگری هاتە ناو کوردستانەوە, کەوتنە کوشتن و گرتن و تاڵانکردن و سوتاندن (٦٦).

هەرچی پەیوەندی سیاسی یە, لەسەردەمی "خوسرەوخان" , جۆرێك

لەهەڵکشان و داکشانی پێوەدیاربوو لەگەڵ "کەریم خانی" زەندا, چونکە گاهێك "کەریم خان" دیاری بۆ ناردووە و گاهێك لەسەرداوای "سلێمان پاشای" بابان لە دەسەڵاتی خستووە,هەروەها دواتر دژی بابانی یەکان وەستاوە لەبەرامبەر هێرشکردنیان بۆسەر "خوسرەوخان", دیارە ئەمەش جۆرێك لەپەرتەوازەیی و غیابی عەقڵی سیاسی دەرئەخات لەلایەن" کەریم خان" و دەست و پێوەندەکەی, ئەمەش دوا پەیوەندی سیاسی و سەربازی "کەریم خان" بووە بەرامبەر بە میرنشینی ئەردەڵان, چونکە دوو ساڵێك دوای ئەم ڕووداو و گۆڕانکارییانە دەمرێت, واتا لەساڵی (١٧٧٩ن) (٦٧) .

بەشی دووەم / پەیوەندییە سیاسی و سەربازییەکان لەسەردەمی جێگرەوەکانی .

١-/ جەعفەرخانی زەند و خوسرەوخانی ئەردەڵان:-

هەروەك لەباسی یەکەمی بەشی یەکەمدا(کورتەیەك لەمێژووی زەند)دا, ئەوەمان خستە ڕوو کە لەدوای مردنی کەریم خانی زەند, گەلێك ململانێ و کوشتار ڕوویدا لەنێو بنەماڵەی زەندییەکان, لەسەر گرتنە دەستی دەسەڵات. یەکێك لەو کەسانەی لەبنەماڵەی زەند دوای مردنی "کەریم خان" هاتە ناو ململانێی دەسەڵات لەو سەردەمەدا, "جەعفەرخانی زەندە" , کە دوای مردنی باوکی (عەلی مورادخان) دەسەڵاتی گرتە دەست (٦٨) .هەرچی سەرەتای ناکۆکی سیاسی و سەربازی نێوان زەند و ئەردەڵانییەکان لەسەردەمی "جەعفەرخان" و "خوسرەوخانە", دوو بۆچوون, یاخود دوو شێواز هەیە:

یەکەم :

لە ساڵی (١٢٠٠ ك/١٧٩٤ن)دا, کاتێك "جەعفەر خانی زەند" ببوە جێنشینی "کەریم خان" و "عەلی مراد خانی زەند", لە وڵاتی " فارس" ەوە گەیشتە

ئەسفەهان و " ئیسماعیل خان" ی ئامۆزای خۆی وەك سەردار ناردە ناوچەکە, "ئیسماعیل خان" دوای ئەوەی گەیشتە شار ی (بروجرد)(٦٩), بەبێ هیچ هۆیەك کەوتە یاخی بوون و لە "جەعفەرخان" یاخی بوو, بۆیە "جەعفەرخان" لە ئیسفەهانەوە کەوتە ڕێی (بروجرد), بۆ دەرهێنانی ڕیشەی "ئیسماعیل خان", بەڵام کاتێك گەیشتە ناوچەکە "ئیسماعیل خان" خۆی لەبەر نەگرت و کۆمەڵی دەوروبەری بڵاوەیان لێکرد و "ئیسماعیل خانیش" دەست بەدامێنی "خوسرەو خانی" والی بوو (٧٠). بەڵام لەبەرئەوەی داب و نەریتی شەڕ هەڵگیرساندن و فیتنە بەرپاکردن لەبنەماڵەی ئەردەلانییەکان دووربووە, "ئیسماعیل خانیان"بانگ کردوە, ئەویش ڕووی کردۆتە لای(گەڕووس(٧١))(٧٢). بەڵام کاتێك "جەعفەرخان" گەیشتە هەمەدان, بەبێ هودە بەرەنگاری "خوسرەوخانی" والی بۆوە, بەناوی داواکردنەوەی "ئیسماعیل خانەوە", "جەعفەرخان" گەرەکی بوو کوردستان(سنە) ژێرو و ژووربکات, بۆیە "خوسرەوخان" پاش ناردنی چەندین نامەو هەواڵبەر و پاڕانەوە(لەبەر جەعفەرخان), ناچار بەنیازی داکۆکی کردن, کەوتە ڕێ و لەڕێگادا (عەلی خانی بەگلەربەگی خەمسە)(٧٣) و (محمد حسێن خانی گەڕووسی ) لەگەڵ کەوتن (٧٤) .هەردوو لەشکر لە "یکن ئاباد" سەربەهەمەدان ڕووبەڕووی یەك بوونەوە, لەئەنجامدا "جەعفەرخانی زەند" شکاو بەرەو ئیسفەهان ڕای کرد, "خوسرەو خانی" والیش ڕووی کردە هەمەدان, لەوێوە نامە و هەواڵبەری لەگەڵ (زەنبورەك)(٧٥) و تۆبخانەو(نەقارەخانە)ی(٧٦) "جەعفەرخانی زەند"ی ناردە دیوەخانی "ئاغا محمد خانی قاجار", کە ئەوسەردەمە "تاران"ی کردبووە مەڵبەندی شاهی و خێوەتی سەرکەوتنی لێ هەڵدابوو(٧٧).

جارێکی تر زەند و ئەردەلانییەکان,بەردەبنەوە گیانی یەکتر لەدوای مردنی "کەریم خانی زەند", پێدەچێت جێگرەوەکانی زەند, هەمان ئەقلێتی خێڵەکی و ساویلکەی "کەریم خانیان" پەسەند کردبێت لەکاتی پەیڕەوکردنی سیاسەتی

خۆیان بەرامبەر بە چواردەورەکەیان, چونکە ئەوەتا لەسەر بنەمای نا ئەقلانی و ئەقلّی خێڵەکی "جەعفەرخان", ئامادە نییە بنەمای گفتوگۆکردن بگرێتەبەر بۆ داواکردنەوەی "ئیسماعیل خانی" ئامۆزای, کە کردبوویە بیانوو بۆ داگیرکردنی ناوچەکانی ئەردەڵان, هەرچی "خوسرەوخانی" ئەردەڵانیشە لەپێناو مانەوە و پتەوکردنی پێگەی خۆی, جۆرێك لە بچوکی و لایەنگری بۆ" محمد خانی قاجار" مسۆگەر کردبوو, کە دوژمنی بنەماڵەی زەندییەکان بوو.

**دووەم :**

بەپێی سەرچاوەمێژووییەکان, کاتێك ناکۆکی نێوان خانی زەند و ئاغامحمد خانی قاجار لەسەر تاج و تەختی ئێران لەو پەڕی توندو تیژیدابوە, هەریەکەیان ئەیویست سنوری قەڵەمڕەوەکەی خۆی فراوانتربکات و, ئەوی کە لەناو ببات .(٧٨)

لەبەر ئەمە کاتێك "جەعفەرخان" لە ئەسفەهانەوە هاتە هەمەدان, ئەیویست خانی ئەردەڵان بەلای خۆیدا ڕاکێشێت,چونکە لەو دەمەدا "خوسرەوخان" والی کوردستان, لەڕووی ژمارەی سەربازو پاڵەوانەوە, لەسەرووی هەموو میرەکانی ئێرانەوەبووە(٧٩). بۆیە پەیك و پەیامی بۆ "خوسرەوخان" ناردو, داوای لێ کرد کە بچێ بۆ سەردانی , بەڵام "خوسرەو خان" بۆ ڕاوێژکردن, هەموو خەڵکی وڵاتی ئەردەڵانی کۆکردەوە و , تیایدا قسە لەسەر ئەوەکرا کە گوێڕایەڵی بۆ "جەعفەرخان" بکەن یان بەرهەڵستی بکەن(٨٠).

میرزا ئەحمەدی وەزیر, کە باووباپیری پشتاوپشت لەکوردستان خاوەن پلەو پایەبوون... بە"خوسرەوخان" دەڵێت: (خانەکانی زەند لەئێلییەتدا هەمیشە لەحاکمانی کورد نەوی تربوون, جگە لە"کەریم خان" کە وەکیلی خوابوو, گەیشتە دەسەڵات, دوای ئەو خزم و کورەکانی کەوتنە دوبەرەکی و شەرکردن لەناو یەکتردا, بەپێی ڕەوتی ڕووداوەکان وا دەرئەکەوێت لەناوچونی دەوڵەتی زەند

ڕوون و ئاشکرایە. ئەگەر چەندساڵێ "کەریم خان" لەم دنیایەدا ئیقبالی بو، چ پێویستە کە خوسرەوخانی والی کوردستان گوێڕایەڵی فەرمانی جەعفەرخان بێت ؟ )، بۆیە لەو کاتەدا" خوسرەو خان" دەکەوێتە ژێر کاریگەری قسەکانی میرزا ئەحمەدی وەزیر، بڕیاریاندا کە دژی "جەعفەر خان" ڕابوەستن وگوێڕایەڵی بۆ خانی قاجار دەربڕن، لەبەر ئەوە بەتوندی وەڵامی "جەعفەر خانی زەند"ی دایەوەو، لەشکری ئەردەڵانی سازدا بۆ شەڕو، هەواڵی بۆ خانەکانی خەمسەو گەڕووس نارد کە بەلەشکرەوە بێن بۆیارمەتی دانی (٨١).

پاش ئەوەی لەشکری ئەردەڵان بۆ بەرەنگاری خانی زەند بەرەو هەمەدان کشا، هێزی قەراگوزلو و خانەکانی خەمسەو گەڕوس گەیشتن و، لەبەهاری نزیک هەمەدان یەکیان گرتەوە، لەشکری هەردوولا لە (٢٤ی شەعبانی ١٢٠٠ك/١٧٩٤ز) دایان بەیەکدا، ڕۆژی یەکەم شەردرێژەی کێشا بەبێ ئەوەی بەسەرکەوتنی هیچ لایەك تەواو ببێ، لەڕۆژی دووەمدا، لای نیوەڕۆکەی لەشکری خانەکانی خەمسە بەشکاوی شەڕیان بەجێ هێشت. "خوسرەوخان" لەم کاتەدا پەشۆکا، خۆی و کوڕەکانی بە دووهەزار سوارەوە بۆیان چونە مەیدانەوە، توانیان لەشکری زەند شڕبکەن، بەجۆرێك کە ١٣٠٠ کەس لەهێزی فارس(شیراز)و زەند بکوژن، ٨٠٠کەس بەدیلی بگرن (٨٢). ٢٤٠کەسیش لەهیزی ئەردەڵانییەکان کوژراو ٥٤کەسیشیان بەسەختی بریندار بوو(٨٣).

مێژوونوسەکانی ئەردەڵان بۆ ئەوەی "جەعفەرخان" سوك و، "خوسرەوخان" زل بکەن، ئەڵێن: خانی زەند چونکە قەڵەوو ورگن بو، نەیتوانی بو هەڵبێت و لەناو سەنگەرەکانی تۆپخانەکەیدا خۆی قایم کردبوو، کەشەو داهات مەلایەکی هەمەدانی بەقورئان و جەواهیرێکی زۆرەوە ناردە لای خوسرەوخان بۆئەوەی ڕێگەی بدات بڕوات، خوسرەوخانیش پیاوەتی لەگەڵ کرد و ڕێگەی دا لەگەڵ سێ کەس لەنۆکەرەکانی بڕۆن، دواتر "خوسرەوخان"، دیلەکانی شەڕەکە،

لەگەڵ نامەیەکی دڵسۆزی و چەردەیەك جەواهیری بەدیاری بۆ ئاغا "محمد خانی قاجار" نارد (٨٤).

٢-/ ئیسماعیل خانی زەند و خوسرەوخانی ئەردەڵان:-

ساڵێك دوای سەرشۆڕکردنی "جەعفەرخانی زەند",(١٢٠١ك/١٧٩٥ز) "ئیسماعیل خانی" ئامۆزای "جەعفەرخانی زەند", توانی لەناوچەکانی عێراقی عەجەم(٨٥), کۆمەڵە خەڵکێکی دە پانزە هەزار کەسی کۆبکاتەوە و گەمارۆی شاری کرماشان بدات (٨٦).

لەو کاتەدا, حاجی "عەلی خانی زەنگەنە", کە بەگلەربەگی(٨٧) کرماشان بوو, چەند کەسێك لەخزمانی خۆی و هاوڕێیانی و پێشنوێژی کرماشانی, ناردە لای "خوسرەوخان", بۆئەوەی یارمەتیان بدات, خوسرەوخانیش دەستبەجێ بەسوپا و هێزی خۆیەوە ڕووی کردە کرماشان, "ئیسماعیل خان", کەبەمەی زانی, لەمەنزڵی (چەرخستان)(٨٨), ڕیزی شەڕی ڕازاندەوە و بەلەشکری زۆرەوە خۆی ئامادەی جەنگ کرد (٨٩).

دواتر, "خوسرەوخان" هێرشی کردە سەر "ئیسماعیل خانی زەند", و دوای هێرشکردن, "ئیسماعیل خانی زەند" شکاو هەڵات, بەشێکی زۆری سوپاکەشی بوونە خۆراکی شمشێرەکانی ئەردەڵان, بەشێکی زۆریشیان بەدیل گیران, دوای جەنگ, "خوسرەوخان", چەند کەللە سەرێك و نەقارەخانە و کەڕەناخانە و زەنبوورەکخانەی "ئیسماعیل خانی زەند"ی ناردە بەردەرگای "ئاغا محمد خانی قاجار", ئەویش, شەرەفی خەڵاتی بایەخدار و ئەسپ و زین...., نارد بۆ "خوسرەوخان", هەروەها ناوچەکانی (ئەسەئاباد, تۆی, سرکان, صەحنە, سونقور, دینەوەر), کەسەر بەهەمەدان و کرماشانن, درایە "خوسرەوخانی" والی و ئەم ناوچانە خرانە سەرئەردەڵان (٩٠).

## ٣-/ عەلی موڕادخانی زەند و خوسرەوخانی ئەردەڵان:-

"خوسـرەوخان" لەئەردەڵانـدا دەسـەڵاتی خـۆی بـاش قـایمکرد, مـیری ئەردەڵان بەشدارییەکی چالاکانەی کرد لـەو زۆرانبازییـەی لـەپێناو تـەختی ئێرانـدا کرا, بەڵام سیاسەتی تایبەتی خـۆی بـەڕێوە دەبـرد, پـاڵی دەدایـە لای زەنـد یـان قاجارەکـان یـان شـەڕی لەگـەڵ دەکـردن, بـەپێی بەرژەوەنـدی خـۆی . "خوسرەوخان", لەو ڕەوشە سیاسییە ئاڵۆزەی پاش ساڵی (١٧٧٩ن)دا بەکردەوە سەربەخۆی بەدەست هێنابوو (٩١).

ئەم سەربەخۆییە بووە مایەی نیگەرانی و ترسی چواردەورەکەی, بەتایبەت "عەلی موراد خانی زەند", دوای ئەوەی کە زاڵبوو بەسەر خزمانی خۆیدا, زانی کـە "خوسـرەوخان", لەگـەورەیی و ئازایـەتی, شـکۆ و بەهرەداریـدا لـە خـۆی تێپەڕانـدووە, هـەوڵی دا بیگرێ و لای خـۆی وەکـو دیلێکـی ڕێـزدار ڕایگـرێ, لـە مـانگی هەشـتی (١٧٨٠ن)دا, "خوسـرەوخان" لەلایـەن زەنـدەوە داوەت کـرا و گەیشتە بارەگای زەند. "عەلی موراد خان" بەحورمـەتێکی گـەورەو پێشوازی لـە "خوسرەوخان کـرد", بـەڵام ڕێگـەی گەڕانـەوەی نـەدا بـۆ کوردسـتان, فـەرمانی حوکمڕانی دا بە "کاهزاد خان", مامی "خوسرەوخان"(٩٢).

بەڵام دیلێتی "خوسرەوخان" زۆری نەخەیاند, چونکە "عـەلی مـوردا خـان" لەسەر دەسـتی کـوڕانی "سـادیق خـانی زەنـد" تووشـی شـکان بـوو, لـەم کاتـەدا "خوسرەوخان" توانی هەڵبێت و بگاتەوە ئەردەڵان(٩٣).

## بەندی سێیەم

## پەیوەندییە ئابوری و کۆمەڵایەتییەکان

بەشی یەکەم / پەیوەندییە ئابورییەکان .

تەوەرەی یەکەم : ژیانی ئابوری میرنشینی ئەردەڵان .

تەوەرەی دووەم : ژیانی ئابوری زەند .

بەشی دووەم / پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان .

## بەندی سێیەم

## پەیوەندییە ئابوری و کۆمەڵایەتییەکان

لەبەشی دووەمدا(پەیوەندی سیاسی و سەربازی), توانیمان پەیوەندی نێوان زەند و میرنشینی ئەردەڵان بخەینە ڕوو لەبەر ڕۆشنای سەرچاوە مێژووییەکان, کە چ پەیوەندی یەکی خراپ و توند لەنێوانیاندا بەرجەستەبووە, بەجۆرێك ئەم پەیوەندییانە لە بەرهەڵستی کردنی یەکتر و هێرشکردنە سەر یەکتر و کوشتارو خوێن ڕژان لەسەر خاکی یەکتر و وێرانکردنی شارو ناوچەکانی یەکتر خۆیدەبینیەوە, ئاشکراشە هەر دوو دەوڵەتێك, یاخود هەردوو نەتەوەیەك, یا دوو خێڵێك لەسەر ڕووی زەویدا گەر پەیوەندی نێوانیان تەبا و ئارام نەبێت, کەشێکی گونجاو و لەبار نەرەخسێت لە نێوانیاندا, ئەوا هیچ بەرژەوندی یەکی ئابوری و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و ڕۆشنبیری و کەلتوری لەنێوانیاندا نایەتە دی, چونکە پەیوەندی ئابوری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و فەرهەنگی...هتد, وەك هەردیاردەیەکی تری ناو کۆمەڵگا دەکەوێتە ژێرکاریگەری و کارتێکردنی ئەو گۆڕان و ئاڵوگۆڕانەی لە ژیانی ئابوری, فیکری, کەلتووری, پەیوەندی سیاسی, سەقامگیربوونی ئاشتی, کە لە ناو کۆمەڵگەدا بەرجەستەدەبێت, ئاشکراشە کە سیستمی میرنشینی, تاکە مۆدێلی حکومڕانی کورد بووە, لەو سەردەمەدا, کە لەناوچەیەکی تەسکدا بۆ سەردەمێکی دیاری کراو دەرکەوتووە, ئەم میرنشینەش,

لە قەڵەمڕەوی خۆیدا، بەپێی پرەنسیب و دەستورێکی نەنووسراو کەبەرهەمی سیستمی عەشیرەتی بووە، کۆمەڵی ڕێکخستووە و شێوەی پەیوەندی نێوان ئەندامەکانی و پەیوەندی نێوان خۆی و ئەوانی دیاری کردووە، هەروەها هیچ یەکێك لە میرنشینە کوردییەکان، وەك دەسەڵاتی خێڵێك، یان بنەماڵەیەك، نەك وەك نوێنەری کولتورێك، نەیتوانیوە زەمینەیەکی هاوبەشی کولتووری و ئایدۆلۆجی و سیاسی لەگەڵ میرنشینەکانی دیکەی کوردستان بدۆزێتەوە، بۆیە ئەوان لە جیاتی ئەوەی تەواوکەری یەکتربن، دژی یەکتر بوون(٩٤).

هەموو ئەمان بوونەتە، هۆکارو بەربەست لە دروست بوونی پەیوەندی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری، هەروەها پێشکەوتنی کۆمەڵی کوردەواری لەو سەردەمەدا .

بەشی یەکەم / پەیوەندییە ئابورییەکان

پێوویستە پێش ئەوەی باسی پەیوەندی ئابوری بکەین لە نێوان بنەماڵەی زەند و میرنشینی ئەردەڵان، ئاوڕێك لەبارودۆخی ئابوری ئەوسای کوردستان و ناوچەکە بدەینەوە، ئەو بنەمایانە ڕونبکەینەوە کە ئابوری هەریەك لەم دوو دەسەڵاتدارەی لەسەر وەستاوە، بۆ وێناکردنی بارودۆخی ئابوری میرنشینی ئەردەڵان و ناوچەکانی خێڵی زەند، پێویستمان بە کێشانی وێنەیەکی گشتی ڕابردووی ئەوسای ناوچەکە و کوردستان هەیە لە ڕووی سنوری جوگرافی و گونجانی ئاو هەوای ناوچەکەو، ڕۆڵی شوێنگەی فەلەکی کوردستان، لەسەر ژیانی ئابوری و چالاکی یە ئابورییەکان، بەتایبەت لەسەر کەرتی کشتوکاڵ کاریگەری یەکی زۆری هەیە، چونکە کوردستان دەکەوێتە باشوری ناوچەی سازگاری باکوری ئەو ناوچەیەوە کە زۆربەی بارانەکەی لە کەژی زستاندا دەبارێ و هاوینیشی جگە لەپانتاییەکی زۆر کەم، بارانی لێ نابارێ و وشکە، ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی کە زۆربەی کشتوکاڵەکان لە زستاندا بکرێ و لەسەر باران ڕابوەستێ، یان پشت بەباران ببەستێ(٩٥).

" ئەولیای چەلەبی"(٩٦)، لە ساڵی(١٦٦٥ن)، سەبارەت بە سنوری کوردستان، بەم شێوەیە بۆمان دیاری دەکات و دەنووسێت: (( ئەم وڵاتە سەری لای باکوری دەگاتە ئەرزەرۆم و لە وانیشدا هەکاری و جەزیرە و ئامێدی (عەمادیە)و موسڵ و شارەزور و هەریر و ئەردەڵان و بەغداد و درنە و دەرتەنگ، تا دەگاتە بەسرە خاکێکی حەفتا قۆناغی بە کوردستان وبە بەردەڵان، بەڵام پانایی کوردستان بە ئەندازەی درێژاییەکەی نییە،لای خۆرهەڵاتی سنووری عەجەمە و لەهەریر و ئەردەڵانەوە تاخاکی شام و حەڵەب، بیست– بیست و پێنج قۆناغە، بەشی هەرە تەسکی ئەم پانایییە، پێنج قۆناغە )) (٩٧).

**تەوەرەی یەکەم : ژیانی ئابوری میرنشینی ئەردەڵان**

ژیانی ئابوری زۆربەی زۆری دانیشتوانی میرنشینی ئەردەڵان، بە دوو جۆر کار بەسترابۆوە، ئەوانیش بریتی بوون لە: ئاژەڵ بەخێوکردن و کشتوکاڵ کردن، کشتوکاڵ بە شێوەیەکی سەرەکی لە دۆڵەکان دەکرا، دۆڵەکانی شارەزوور لە ڕووی بەپیتییەوە لە هەموو کوردستانی خوارووی ڕۆژهەڵات ناو بانگی دەرکردبوو، گەنم و جۆ بەرهەمی سەرەکی بوون، هەروەها کوردەکانی ئەردەڵان بە جوتیار و باخچەوانی لێهاتوو دادەنران، هەرچی ئامێری زەوی کێڵان و کارکردنی جوتیارانی کوردان یەکجار سادە بوون(٩٨).

هەروەها دانیشتوانی میرنشینی ئەردەڵان، پێکهاتبوون لە:یەکەم: خەڵکی نیشتە جێ، ئەوانەی بە شێوەیەکی سەرەکی خەریکی کشتوکاڵ کردن بوون، دووەم: نیوە نیشتە جێ، ئەوانەی خەریکی کشتوکاڵ و ئاژەڵ بەخێوکردن بوون، سێیەم: ئاژەڵ بەخێوکەری کۆچەر(٩٩).

بوونی جوتیارو بردنی ئاژەڵ لە کەژی کارکرندا بۆ سەرچیا، لە ئابوری کوردستانی خواروی ڕۆژهەڵات، بەڵگەی ئەوەیەکە، لەم بەشەی وڵاتی کوردانـدا، لەنێوان شێوەکانی ژیانی ئاژەڵ بەخێوکردنی کۆچەری و کشتوکاڵی نیشتە جێی،

هیچ سنورێك نەبووە(١٠٠). لە نێو میرنشینی ئەردەڵاندا گەلێك خێڵ هەبوون, کە لەڕووی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییەوە, ڕۆڵیان بینیوە, لە بەربڵاوترین و دیارترین هۆزەکانی کوردستانی رۆژهەڵات, گەلە هۆزی جافە, کە لەجوانڕۆوە تا سنە دەگرێتەوە, وە بەشێکن لە جافی گەورەی کوردستانی ناوەند لەعێراق, هەروەها هۆزی بلّباس و مەنگوڕ, هەروەها هۆزی جەلالی ...هتد (١٠١).

ئەم خێڵە کوردانەش, یەکەیەکی کۆمەڵایەتی و سیاسین و بەگشتی بەمەڵبەندێکەوە بەستراونەتەوە و لەڕووەوە یەکەیەکی ئابووریش پێکدەهێنن و لەسەر بنەمای رەچەڵەك و خزمایەتییەکی ڕاستەقینە یاخود هەڵبەستراو هەڵچون و شیرازەیەکی نێوخۆیی دیاریکراویان هەیە(١٠٢).

پێکەوە بەڕێوە چوونی ئابوری ئاژەڵ بەخێوکردن و ئابوری کشتوکاڵ, لە ناوچەکانی کوردستانی خواروی رۆژهەلات جیاوازن لەیەکتر, لە کوردستانی ئەردەڵاندا, لەناوچەکانی سنە, ئەسفەنداباد و مەریوان, ئاژەڵ بەخێوکردن لە ڕووی بایەخی ئابوورییەوە نەدەگەیشتە کشتوکاڵ کردن, بەڵام لەهەورامانی تەخت و هەورامانی لهۆن و بانە, ئاژەڵ بەخێوکردن بنچینەی ئابوری پێکدەهێنا(١٠٣).

کەواتەهەرچی شوناسی ئابوری میرنشینی ئەردەلانە, بەندە بە بەخێوکردنی ئاژەڵ لەلایەن خێڵە کۆچەرییەکان و کشتوکاڵکردن, چونکە بەشێکی زۆری خێڵەکانی ئەردەڵان, لەڕووی ئابوری یەوە بایەخێکی زۆریان بۆ میرنشینەکە هەبووە, وە ئاشکراشە کە ئابوری خێل بەشێوەیەکی سەرەکی بریتی بووە لە بەخێوکردنی مەروماڵات و گا و رەنێوهێنانی ئەسپ, هەروەها ئەم هۆزانە لە گەرمیان و لەکوێستانیش لەوەڕگە و پاوانی تایبەت بەخۆیان هەبووە, واتا کوێستان و گەرمیانیان کردووە(١٠٤).

**تەوەرەی دووەم : ژیانی ئابوری زەند**

سەرچاوە مێژووییەکان, گەواهی ئەودەدەن, کە هەرچی ئابوری بنەماڵەی زەندییەکانە, لەسەر کشتوکاڵکردن و ئاژەڵداری بەندە, ئەم ئاژەڵدارییە بە چەشنی کۆن تیایدا بڵاوە, بەڵام کاتێك "کەریم خانی زەند" , (شیراز)ی کردە پایتەختی دەسەڵاتەکەی, لەڕێگەی کارگێڕی و حوکمڕانەکانی بەردەستی گرنگی دا بە مەسەلەی کشتوکاڵکردن, ئەمەش لەڕێگەی دابەشکردنی زەوی وزار و پەیداکردنی کرێکارو تۆو و چاك کردنەوەی ڕایەڵەی ئاودێری, هەروەها خۆی چاودێری کۆکردنەوی بەرهەم وداهاتی دەکرد(١٠٥). بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە نەخشەی ژمارە(یەك) و وێنەی ژمارە (هەشت) .

بۆیە لەسەردەمی کەریم خاندا, کشتوکاڵ گەشەسەندنێکی بەخۆیەوە دی, بەجۆرێك دەغڵ و دانەوێڵەو توتن و شەرابی شیراز و میوەی وشك کراو, هەم بۆ ناوخۆ هەم بۆ ناردنەدەرەوە بەرهەم دەهێنران, هەروەها لەنێو شیرازدا چەندین کارگە دامەزرابوون, کە کەرەستەی شەڕکردنیان بەرهەم دەهێنا , وەکو کارخانەکانی مەراغەو قەزوێن و کرمان,کەریم خان گەلێك هەوڵی گرنگی دا بۆ بەرەو پێش چونی بازرگانی, بەتایبەت لەناوچەی شیرازدا بۆ ئەم مەبەستەش گەلێك دووکان و بازاری دروست کردبوو تابیێتە جێگەی بازرگانی (١٠٦). هەروەها گرنگی دا بە جوڵانەوەی بازرگانی لەگەڵ ئینگلیز لەناوچەی (بوشهر), ئەویش لە بەخشینی باجی هێنان و بردن, بەتایبەت لەسەر کەلو پەل و خوری (١٠٧).

ئەگەرچی میرنشینی ئەردەڵان و بنەماڵەی زەندییەکان , هەردووکیان لەڕووی ئاستی ئابوریدا خاڵی هاوبەش و جیاوازیان هەیە, وە هەردوولا ئاستی ئابوری یان لەسەر کشتوکاڵ و ئاژەڵداری بەند بووە بەتایبەت میرنشینی ئەردەڵان, بەڵام هیچ پەیوەندی یەکی گۆڕینەوەی شمەك و ئاژەڵداری لەنێوانیاندا ڕووی نەداوە , ئەمەش لەبەر خراپی پەیوەندی سیاسی و سەربازی لەنێوانیان,

بەجۆرێك گرژی کەوتۆتە نێوانیان, ڕەنگدانەوەی هەبووە لەسەر پەیوەندییە ئابوریەکانیشیان, هەروەها نەبوونی ڕێگا و بان و, ژیانی خێڵە کوردە کۆچەرییەکان بوونەتە هۆکارێك بۆ دەرنەکەوتنی بازرگانی لە کوردستاندا, چونکە خێڵ گوێ ناداتە کاروباری ئابوری و ئاوەدانی و ئاوەدانکردنەوەی وڵات (١٠٨).

وەك پێشتریش باسمان کرد میرنشینی ئەردەڵانیش و بنەماڵەی زەندییەکانیش, خێڵ پێکهاتەیەکی سەرەکی بوون لە نێو ناوچەکانیاندا.

بەشی دووەم / پەیوەندییە کۆمەڵایەتیی و ڕۆشنبیرییەکان

**تەوەرەی یەکەم : باری کۆمەڵایەتی وڕۆشنبیری زەند**

کاتێك "کەریم خان" لە شیرازسەقامگیربوو, هەوڵی دا کە بەشێکی زۆری وەستاکار و شاگردەکانیان کۆبکاتەوە و دنەی دوورخراوان و بازرگانان و پەنابەرانی دا کە بگەڕێنەوە ئێران و گەشە بدەن بەپایتەخت, لەوانە ((وەفا))ی قومی شاعیر کە لەسەردەمی دەسەڵاتی نادرشادا چووبووە ئیسفەهان و لەسەردەمی فەرمانڕەوایەتی کەریم خاندا گەڕانەوە ئێران, هەروەها چەند کۆمەڵێك لەئازەربیجان و ئەستەرئابادو و کۆمەڵێك پەنابەریش لە عێراق و جولفاوە هاتنە شیراز, لە ئاکامدا ژمارەیەکی زۆر لە شاعیر و وێنەگر, ڕوویان کردە شیراز, ئەمانەش بوونە سەرەتایەکی باش بۆبڵاوبوونەوە و پەرەسەندی باری ئەدەبی و ڕۆشنبیری لە شیرازی پایتەخت (١٠٩).

**تەوەرەی دووەم: باری کۆمەڵایەتی وڕۆشنبیری میرنشینی ئەردەڵان**

وەك لەبەشەکانی پێشووتردا خستمانە ڕوو کە لە نێو میرنشینی ئەردەڵان, خێڵ, ڕۆڵێکی سەرەکی و کاریگەری بینیوە لەنێو لە پێشکەوتنی سیاسی, هەمان ئەم کاریگەرییەش بۆ بواری کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری ڕاستن, بەتایبەت لە ڕووی

پەیوەندی ژن و ژنخوازییەوە, وەك پەیوەندی خزمایەتی لە گەڵ بەگزادەكانی خێڵی جافدا, هەروەها خێڵی جاف هەموو ساڵێك كۆبوونەوەیەكی گەورەیان سازدەكر, وە گەلێك خێڵی تریش بەشداری دەكرد, بۆ ئەوەی پەیوەندی یەكی دۆستایەتی و یەكێتی یەكی پتەو لە نێوانیاندا دروست بێت(١١٠).

لە ئامێزی ئەم عێلە ناودار و گەورەیەدا، شانبەشانی میر و سەرۆك و پیاو ماقووڵ و سوارچاك و جەنگاوەرە دلێرەكانیان، چەندین زانای ئایینی و مەلای بلیمەت و هزرڤانی دانا و نووسەر و مێژووناس و ، شاعیر و ئەدەبیی پایەبەرز هەڵكەوتوون كە لە نێو لاپەڕەكانی مێژوومانداا شوێنێكی شایستە و دیاریان بۆ خۆیان مسۆگەر كردووە, لەوانەزانایانی ئاییینی پایەبڵند، صلاح شهرزوری، مەولانا خالیدی نەقشبەندی، مەلا عەبدولكەریمی مودەڕیس، شاعیرانی هەڵكەوتووی وەك: لزا خانم جاف، عێل بەگی جاف، خانای قوبادی، نالی، مەولەوی ، وەلی دێوانە، تاهیر بەگی جاف، ئەحمەد موختار جاف، عەبدوڵڵا گۆران، مینە جاف، نەبەرد جاف(١١١), هەروەها كە سایەتییەكی وەك مەستوورە, لەناو میرنشینی ئەردەڵاندا ئافرەتێكی خوێندەوارو مێژوو نوس بووە كە سەرجەم ڕووداو قۆناغەكانی مێژووی ئەردەڵانی نووسیوەتەوە لە پەرتووكێكدا بە ناوی مێژووی ئەردەلان,كە لەنووسینی ئەم پەرتووكەدا مەستوورە پەیڕەوی ڕێبازی شەرفخانی كردووە لەنووسینەوە و گێڕانەوەی ڕووداوەكان(١١٢) . هەروەها مەستورە, دیوانێكی شیعریشی هەیە,سدیق بۆرەكی لە بارەی مەستوورەوە دەونوسێت: (( وەكو ئەستێرەیەكی گەش و ترووسكەدار لە ئاسمانی وێژەیكورد‌ەواریدا دەدرەوشێتەوە)), یەكێك لە و هۆنراوانەی كە مەستوورە بە شێوەزاری سۆرانی هۆنیوەتەوە كە دەڵێت:

گرفتارم بـــە نازی چاوەکانی مەستی فەتتانـت

بریـنـدارم بە تیری سینەسۆزی نێشـی موژگانـت

بەزولف و پەرچەم و ئەگریجەکانت غارەتت کردم

دڵێکم بوو ئەویشت خستە ناو چاهی زەنەخدانت (١١٣) .

دەر ئەنجام

١- خراپی پەیوەندی نێوان زەند و میرنشینی ئـەردەڵان, لـە ئـەنجامی جیـاوازی بیرکردنەوە و جیاوازی قـەوارەی سـەربەخۆییان نییـە, بـەڵکو گرژبـوونی نێوانیـان بەرهـەمی ئـەقڵێتی خێڵـەکی و دۆگمـایی و چـەق بەسـتوییە, چـونکە سـەرەتایی ناکۆکییـان لەسـەر بەریککـەوتنی بەرژەونـدی و دابەشـکردنی دەسـەڵات نـەبووە, بەڵکو هەردوولا کۆیلـە و ژێردەسـتە بـوون, ئەردەڵانییـەکان کۆیلـە و پیـاوی ئاغـا محمد خانی قاجاربوون, بنەماڵەی زەندیش کۆیلەی دەسـەڵاتگرتنە دەسـت بـوون, بەتایبەت لەدوای مردنی کەریم خانـەوە , کەوتنـە گیـانی یـەکتر, بـێ ئـەوەی بـیر لەخراپی ئەم ململانێی و کوشتارەبکەنەوە لەسەر دەسەڵاتەکەیان .

٢- ئەکەرچـی سەرچـاوەکان گـەواهی ئـەوە ئـەدەن لەسـەر کـەریم خـان, کـە کەسـایەتیی یـەکی بـاش و چـالاك بـووە , لەسـەر دەمـی خۆیـدا, بـەڵام ئـەقڵێتی سیاسی و دیبلۆماسی لەلای ئەو, غیابێکی بەردەوامی هـەبووە, چـونکە دەیتـوانی میرەکانی ئەردەڵان بکات بە پاڵپشت و هاو هێزی خـۆی لـە ناوچـەکەدا, قـەوارەی سیاسی و ڕووبەری جوگرافییان فراوانتربکەن و بناغەی دەوڵەتێکی کـوردی بـەهێز دابمەزرێنن .

٣- لاوازی کـەریم خـان لـەڕووی کـارگێڕی و سیاسـییەوە, نـەیزانیوە بەباشـی پەیوەندی دیبلۆماسی لەگەڵ دەوروبەریدا دروست بکات, هـەتاوەکو بییانکـات بـە پاڵپـشت و دۆسـتی خـۆی, هەمیـشە بەقـسەی دەوروبەرەکـەی هەڵخەڵـەتاوە,

کەئەمەش ئەنجامێکی نەرێی بۆ سەر قەڵەمڕەوی دەسەڵاتەکەی دروست کردووە.

٤- بەهۆی ئاڵۆزی لە پەیوەندییە سیاسییەکانی نێوان زەند و ئەردەڵان، کاردانەوەیەکی خراپی کردۆتە سەر ڕەوتی ئابوری و بازرگانی لە نێوانیان، ئەم کارتێکردنەش ئەنجامێکی نەرێی هەبووە، هیچ کامیان سوودی ئابوری و بازرگانی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری یان لەیەك نەکردووە .

٥- ئەگەر چی میرنشینی ئەردەڵان لە قۆناغێکی دواکەوتوویی دەرەبەگایەتیدا دروستبووە، بەڵام دەبینین کە لەو قۆناغەدا ئافرەت جۆرێك لەدەسەڵاتی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری بۆخۆی دابینکردووە، واتا ئافرەت تا ڕادەیەك ئازادی پێدراوە تاوەکو سەربەست بێت لە دیاریکردنی شوناسێك بۆخۆی، بۆنمونە دەرکەوتنی کەسایەتییەکی وەکو (مەستوورەی) کوردستانی گەواهی ئەو دێڕانەی سەرەوەمان بۆ ئەدەن، کە لەو کاتەدا وەك مێژوونووسێك و ئەدیبێك دەرکەوتووە و توانیوێتی گەلێك قۆناغی مێژووی ئەردەڵانمان بۆ تۆماربکات لە پەرتوکێکدا بەناوی ( مێژووی ئەردەڵان ) ، وەگەلێک شیعریشی بەدەست و خامەی خۆی هۆنیوەتەوە .

٦- بەشداری کردن ژن لەشەڕدا، یەکێك بووە لەو نەریتانەی کە لەناو بنەماڵەی زەندییەکاندا باوبووە، ئەمەش ئەوەمان بۆ دەردەخات کە ژنی کورد لەوسەردەمەدا هاوشانی ڕەگەزی بەرامبەریان هەوڵیانداوەو توانیویانە بوونی خۆیان بسەلمێنن و ڕۆڵێکی ئەکتیڤیان هەبووە .

راپەراندنی ئیش وکاری خێزان وهۆزو برا گەورایەتیش هەر بەسیاسەتیان ناوبردووە،سیاسەت لە رۆژئاوا لە (politique)ی فەرەنسیە کە هاتووە ،ئەویش لە بنەچەدا لە ئەغریقی ویونانیەکە هاتووەو ئەرستۆ بەکاری هێناوە،کە لە دوو وشەی لێکدراوی (polis–شار)و(tehem–بەرێوەبر)هاتووە،واتە بەریوەبردنی شار. ئەوەی زیاتر مانای سیاسەتە (govern) ە بە مانای حکومەت یش دێت ولێك نزیکن،ئەوەش زاراوەیەکی کۆن نیە،یان سیاسەت واپێناس کراوە بە دی هێنانی زیاترین بەختەوەری بۆ زۆرترین کەس[٥٩].زانستی سیاسی زانستی مرۆڤ نیە وەك بونەوەرێکی تاك وپەیوەندی تاك بەتای مرۆڤ بەڵکو زانستی کۆمەڵی مرۆڤەکانە.گەشەی فکری سیاسی پەیوەستە بەگەشەی کۆمەڵگاکانی مرۆڤایەتی وجیگیربوونی، وەگۆرانی بەسەردادێت بەگۆرانی شارستانیەتی مرۆڤایەتی. هزری سیاسی بە پێوەردادەنرێت بۆ گەشەوگۆرانی عقلی مرۆڤەکان[٦٠] .

ئاشکرایە زانستی سیاسی وزانستی ئابووری کاریگەری یان لەسەر یەکتر هەیە،هەریەکەیان کاریگەرە بە ئەوی دیکە،بەوەی کە ئابوری لێکۆلینەوەیە بۆ هەڵسوکەوتی ئینسان لە چوارچێوەی کۆمەڵدا،سیاسەتیش بەریوەبردنی تاك وکۆمەڵگایە[٦١].ساکارترین کۆمەڵگا لەوکەسانە پێك هاتووە کە لەسەر بنەمای دابەشکردنی کاروئالوگۆری کارو بەرهەمەکانی خۆیان پێداویستیە ئابووریەکانی خۆیان دەستەبەردەکەن ،تواناکان جۆراوجۆرن هەرکەسەو بۆکارێك ئامادەیی زیاتری هەیە.لە ئەنجام دا بەرهەمی کاروتوانا جۆراوجۆرەکان لەگەڵ یەکتر دا ئالوگۆر دەکرێن .بەم جۆرە کۆمەڵگایەك دروست دەبێت کە جوتیاران،پیشەسازان ،پیشەوەران وبازرگانان لە خۆ دەگرێت،بەلآم ئاخۆ مرۆڤەکان هەر بەمەرازیدەبن وکۆمەڵگا لێرەدا رادەوەستیٚ؟نەخێر،چونکە زۆربەی مرۆڤەکان بەوەندەرازینابن .زێدەخوازی ئاستی خواستەکانی مرۆڤ بەرزدەکاتەوە و تێرکردنی ئەم خواستانە دەبێتە هۆی جەنگ ودەست بەسەرداگرتن .لێرەدا چینێکی دیکە پێویستە ،چینێك

کە ئەرکی جەنگ وپارستن بەڕێوە ببات .لەگەڵ سوپاو پاراستندا،دەسەڵاتیش وەك ئامرازی کۆنترۆڵ لە کۆمەڵگادا لەدایك دەبێ.کەوابوو کۆمەڵگا پێویستی بەکەسانێك دەبێ کە تواناو پسپۆریان لەگەڵ چینەکانی پێشودا جیاواز بێت وئەم چینەش پاسەوانەکانن،بە پیشەی تایبەتی خۆیانەوە خەریکن.بەڵام چ گەرەنتیەك هەیە کە ئەم کەسانە کەڵکی نابەجێ لە پیشەکەی خۆیان وەرناگرن؟کەوابوو دەبێ پیاوێکی فەلسەفی کە ڕەنگدانەوەی عەقلی کۆمەڵگایە هەموو ئەم کاروبارانە ڕێك وپێك بکات.بۆ دڵنیایی لە ڕەوتی دروستی کارەکان پاسەوانان ودەسەڵاتداران دەبێ لە ژن ومنداڵ ودارایيدا هاوبەش بن بۆ ئەوەی تەنیا بۆ کۆمەڵگا کاربکەن نەوەك بۆ خۆیان .چ هۆکارێك دەبێتە هۆی ئەوە کە یەکە بچوکترەکان بۆ یەکەی گەورەتر گەشە بکەن؟ئەو شتەی کە دەبێتە هۆی سەرهەڵدان وگەشەکردنی ئەم کۆمەڵانە پێداویستی وتواناکانی مرۆڤە ئەو کۆمەڵانەی کە گەورەترن بۆ دابینکردنی پێداویستیە جۆراوجۆرەکانیان وکەڵك وەرگرتن لە توانا جۆراوجۆرەکان ئیمکانیاتێکی باشتریان لەبەر دەستدایە.بنەماڵەو گوند ناتوانن گەلێك لە پێداویستیەکانی خەڵك دابین بکەن کەواتە دەبێ لەگەڵ یەکەی گەورەتردا تێکەڵ بن.ئەم یەکە گەورەترە دەولەتەشارە.دەولەتە شار ئەم توانایەی هەیە کە هەموو پێداویستیەکانی خەڵك دابین بکات و سوود لە هەموو بەهرەو تواناکان وەربگرێ.دەولەت وەك جەستەیەکی زیندوو وایە کە هەریەك لە ئەندامەکانی ئەرکی تایبەتی خۆیان ئەنجام دەدەن.کۆمەڵگا وەك جەستەیەك لە سێ ئەندامی سەرەکی پێکهاتووە دەسەڵاتداران ،پاسەوانان، بەرهەمهێنەران.ئەگەر هەریەك لەم سێ چینە (پۆل) ئەرکی خۆیان بە باشترین شێوە ئەنجام بدەن باشترین کۆمەڵگا دروستدەبێ.واباشە کە هەر یەکەیان بەپێی فەزیلەتی تایبەت بەخۆی بجوولێتەوەو ئەرکی تایبەتی خۆی جێبەجێ بکات.فەزیلەتی دەسەڵاتدار یا فەرمانڕەوا ژیرییە ،فەزیلەتی تایبەتی پاسەوانان

ئازایەتییە وفەزیلەتی تایبەتی بەرهەمهێنەران دان بەخۆ داگرتنە.دادپەروەریش ئەوەیە کە هەریەك لەم سێ چینە لە جێی خۆیاندابن.هەروەك چۆن ناهاوئاهەنگی لە نێوان ئەندامانی کۆمەڵگا دەبێتە هۆی نەخۆشی کۆمەڵگا .دادپەروەری لە ناوڕۆح ولە ناو کۆمەڵگا فاکتەری هاوئاهەنگییە.لە کۆمەڵگادا دەسەڵاتداران هاوکاری خەڵکن نەك سەروەری خەڵك.خەڵکیش نان دەرهێنەری کۆمەڵگان نەك رەعیەتی دەسەڵاتداران [٦٢].

پەیوەندی بەهێزوکاریگەر لە نێوان باری ئابووری وکێشە سیاسی وکۆمەڵایەتییەکاندا هەیە.ئەم ژیارە رۆژئاواییەی ئێستا کە باڵی بەسەر جیهاندا کێشاوە .بنەما سیاسییەکانی لەسەر خۆپەرستی وستەم وژێر پێ خستنی مافی گەلانیتر دامەزراوە،هەرچەندە چەندین دەزگای نێودەوڵەتی وپەیمانی جیهانی بانگەشەی دادوپەکسانی دەکەن،بەلام ئەوانە کاریگەرییەکی گەورەیان نەبووەی ونەیانتوانیوە جیهان ومرۆڤ لە بەدبەختی وئالۆگۆری رزگاربکەن ونەشیانتوانیوە داروخان ودواکەوتن وگرانی وجەنگەکان چارەسەر بکەن .بیریاران وفەیلەسوفانی رۆژئاوا دەوڵەت وسیاسەتمەدارەکانیان ئاگادارکردووەتەوە.کە ئەم ژیارە رۆژئاواییە بەهێزو گەشەسەندوەی کە بەهێزو دەسەڵاتی جیهانی ژێر چەپۆك خستووە،بەرەوتیاچوون هەنگاو دەنێت ،چونکە دەستبەرداری وزەی رۆحی وبنەما مرۆییەکان بووەو لە دەریایەکی ماددی وخۆپەرستی وبەرەڵلایی وملمڵانێ لەسەر سەپاندنی دەسەلات بەسەر گەلانی چەوساوەدا نغرۆ بووە [٦٣] .

بەرپابوونی شۆرشی فەرەنسی کە بە شۆرشە هەرەکاریگەریەکانی مێژووی مرۆڤایەتی دادەنرێت کە نەك تەنها لە فەرەنسا بەڵکو لە ئەورووپاو جیهانیش ،ئەویش بەوەی کە بیرمەندان وبیروباوەرەکانی لەگەڵ خۆیدا هێنای باڵی بەسەر تەواوی جیهاندا کێشابوو ،هۆیەکانی بەرپابوونی کۆمەڵایەتی وئابووری وسیاسی

بوو.ئەو بێزارییەی سەرچاوەی گرتبوو کە خێروبێری ولأت وسەرجەم ئیمتیازاتەکان بەسەر دووچینیدا دابەشکرابوو کە چینی خانەدان وپیاوانی ئاینی بوو بە بەراورد لەگەڵ چینی سێیەم یان چینی گشتی ژمارەیان زۆرکەم بوو.خەڵکی ئاگاداری ئەوەبوون ئەو دووچینە ی دیکە بێرەحمانە وبێبەزەییانە خوێنیان دەمژن ولەسەر حسابی ئەوان ژیانیکی خۆشی وکەیف وسەفا دەژین .بە چاوێکی سوك وناشیرین سەیری خەڵکی هەژارو دەستکورتیان دەکرد،بۆنمونە وەك سوکایەتی پێکردن بەوجەماوەرەی لەشارەکاندا ئیشی دەستیان دەکرد .میللەت باش لەوە تێگەیشتبوون کە خانەدان وپیاوانی ئاینی ،بارگرانییەکن بەسەر خۆیان و ولأتەکەیانەوە.بۆیە تەواو بێزاربوون لێیان ولە دەرفەتێك دەگەران بۆ تێکشکاندن و جڵەوکردنیان.لە شەوی ٤ ئابی ساڵی ١٧٨٩ جوتیارو خەڵکی برسی ونەدار بۆ تۆڵە سەندنەوە بە شێوەیەکی توندوبێرەحمانە،دایان بەسەر کۆشك وتەلأری دەرەبەگ وخانەدانەکان،لەماوەیەکی کەمدا تالانیان کردو ئاگریان تێبەردان وسوتاندنیان[٦٤].ئەوناعەدالەتی ونایەکسانییەی کە خەڵکی پێش ساڵی ١٧٨٩زاینی ژیانیان تێیدا دەگوزەراند لەو سەردەمەدا باڵی بەسەر تەواوی فەرنسادا کێشابوو.ئەو دەمارگیرییە ئاینی ومەزهەبییەو ئەوستەم وچەوساندنەوە زۆرە کە گەورە پیاوانی ئاینی ورژێمی پاشایەتی بێباکانەو دوور لە هەر بەهاو رەوشێکی مرۆڤانە لە بەرامبەر خەڵکی سادەو بێنەواداو نەخوێندەواری ئەوکاتی فەرەنساجێبەجێیان دەکرد[٦٥].ئەو قەیرانە داراییەی کەفەرەنسا لەو سەردەمەدا بەدەستییەوە دەینالاند لە ئەنجامی ئەو هەموو شەڕو شۆڕو جەنگانەوە بوو کە پاشاکان بە درێژایی سەدەی حەڤدەو هەژدە بەرپایان کردبوو. لە ساڵی ١٧٨٩زاینی فەرەنسا نزیکەی پێنج ملیار لیرە قەرزار بوو، لەکاتێکدا بڕی ئەو پارەیەی لەناو ولأتدا ئاڵو گۆڕی پێدەکرا تەنها دووملیارو نیو لیرەبوو، هەروەها ئەو مەسروفاتە زۆرەی کەپاشاو وەزیرەکان و پیاوانی ئاینی وخانەدانەکان و دارو

دەستەی کۆشك خەرجیان دەکرد،خودی کۆشك خاوەنی دەزگایەکی خزمەتگوزاری بەرفراونبووە کە بۆ بەڕێوەبردنی پێویستی بە پارەو پولێکی زۆرو بودجەیەکی خەیاڵی هەبوو لەساڵی ١٧٨٠زاینی تێچونی خوانی پاشایەتی ٣,٦٦٠,٤٩١ فرەنکی فەرەنسی بووە. سەرفکردنی پارە بەو شێوە نارێك و بێبەرنامەییە قەیرانێکی گەورەی دارایی لێکەوتەوە کە تەنها بە بەرپاکردنی شۆڕش و گۆڕینی ڕژێمی پاشایەتی چارەسەر دەکرا. لە ساڵی ١٧٨٥زاینی زۆربەی دانشتوانی پاریس سیس و لاواز بوون و دەموچاویان زەرد هەڵگەڕابوو گەشەیان باش نەبوو کە لە بەر خراپی و نەبوونی خۆراك وایان لێهاتبوو. نان یەکێ بوو لە دواکارییە سەرەکییەکانی میللەت، لەزۆربەی شارەکاندا نەبوونی وبەرزبوونەوەی نرخی نان و بەرووبوومی خۆراك هۆکاری بنەرەتی راپەرین و خۆ پیشاندانەکان بوون کە ئامانجی سەرەکیان دابین کردن و نزمکردنەوەی نرخی نان بوو. برسییەتی گەشتبووە ئاستێك کە خەڵکی ئامادەبوو قوربانی بەگیانی خۆی بدات و تەحەدای سوپاو دارو دەستەکەی پاشا بکات و پەلاماری باستیل و عەمبار(کۆگا) ی دانەوێڵەکان بدات و چی تێدایە فەرهودی بکات[٦٦].بەشێك لە مێژوونوسان پێیان وایە ئەم شۆڕشە لە ئەسڵدا شۆڕشی چینی بۆرژوازی سەرمایەداری نوێ بوو، دژ بە ڕژێمی پاشایەتی و ئابووری و کۆمەڵایەتی کۆنی چەقبەستوو. بۆرژوازییەتێك لە سەرەتا ی دەرکەوتن و دروستبوونی دابوو لە کۆمەڵگای فەرەنسی ئەوکات.[٦٧]

کۆچی تورك و مەغۆلەکانیش بەرەو ئاسیای بچوك و رۆژهەڵاتی ئیسلامی ،لە ناوچەی ئەودیو روبار ئەوەی کە ئەمڕۆ بەتورکستان ناوی دێت و لە بانی مەنغۆلیاو باکوری چین لە رۆژهەڵاتەوە بۆ دەریای خەزەر(دەریای قەزوین) لە رۆژئاواوە و لە دەشتایی سیبریا لە باکورەوە بۆنیمچە دورگەی هیندیو فارس لە باشورەوە، خێڵەکانی غەزوو تیرە گەورەکانی لەو ناوچەیەدا نیشتەجێ بوون کە بەتورکەکان

ناسراون،ئەو كۆچە بەهۆی هۆكارە كۆمەڵایەتی وئابووری و سیاسییەكانەوە بوو.بەزۆربوونی وەچەو ئەوە زیادبوونی بەخێرایی وایانكرد ئەو هۆزانە لەناوچەكەی خۆیاندا شوێنیان تەسك بێت و هەروەها وشكی و بێپیتی خاك و گەران بەدوای لەوەرگاو پاوەن و ژیانی خۆشگوزەرانیدا لەروی ئابوورییەوە هاندەریان بوو. هەندێكیش ئەو كۆچانە دەگێرنەوە بۆ هۆكارە سیاسییەكان، كاتێك ئەو هۆزانە كەوتنە بەر چەندین فشاری گەورەی هۆزەكانی تر كەژمارەو توانایان لەوان زیاتر بوو كە مەغۆلەكان بوون، توركەكانیان ناچاركرد بە كۆچكردن تاكو بگەرێن بەدوای نشینگەیەكی تر داو زەوییەكانیان بەجێ بهێڵن بۆگەران بە دوای بەخششی ئارامی و سە قامگیری. ئەو هۆزە كۆچەریانە ناچاربوون كە بەرەو رۆژئاوا ئاراستە وەربگرن و نزیكی ئەو زەوییە ئیسلامیانە بنەوە كە موسڵمانان لە دوای شەری نەهاوەندو كەوتنی دەوڵەتی ساسانی لە وڵاتی فارس لە ٢١ك \ ٦٤١ز دا فەتحیانكرد[٦٨] .

لەباسی هۆكارەكانی نشوستهێنانی دەوڵەتی عوسمانی صەلابی دەڵێ: دوركەوتنەوەیان بوو لە حوكمكردن بە شەریعەتی خوا كە هەرچی سەختی و چەرمەسەری و دڵتەنگی دونیا هەیە هێنای بەسەر تاك و ئومەتدا ، شوێنەوارەكانی دوركەوتنەوە لە شەریعەتی خواش لە ژیاندا لە هەموو ئاستەكانی كۆمەڵایەتی و ئابووری وسیاسیدا دەردەكەوێت[٦٩] .

سەرچاوەو پەراوێز

(١) عەبدوڵڵا زەنگەنە،بستێكی خاكی كوردستان بە هەموو دونیا ناگۆرمەوە (دیداروچاوپێكەوتن لەگەڵ د.كەمال مەزهەر)،چاپی یەكەم ،چاپخانەی گرین گڵۆری ،(لوبنان:٢٠٠٩)، ل١٨١.

(٢) القرأن الكريم ،سوره قريش،ئايەتی ٤.

(٣) ئـی.ئیـێچ.کار،مێژووچـیە؟ وەرگێرانـی ئاسـۆس محەمـەد مەلاقادر،چـاپی یەکەم،چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە ،دەزگای موکریانی،( هەولێر:٢٠٠٥)،ل١٣٧.

(٤) کەمال مەزهەر،مێژوو،( بەغدا: ١٩٨٣)، ل٩.

(٥) رەحیم سابیر، فەلسەفەی مێژوو، چاپی دووەم ،چاپخانەی گەنج،(سلیمانی :٢٠٠٥)،ل١٣.

(٦) رەحیم سابیر،هەمان سەرچاوە، ل٤٤.

(٧) ئی.ئیێچ.کار،سەرچاوەی پێشوو، ل٩٢.

(٨) عەلی شەریعەتی ،میژوو.. زانستی هـەبوونی مـرۆڤ ، وەرگێرانـی هـاوار محمـد رشید ،(١-٢)، گۆڤاری مێژوو، ژمارە (١٠)،(هەولێر: بەهاری ٢٠٠٩)،ل١٨١.

(٩) کەمال مەزهەر،سەرچاوەی پێشوو،ل٨.

(١٠) عەبدولحسین زرین کوب ، ئەفسانە و مێژوو ، وەرگێڕانی وریا فایەق ، گۆڤاری کـۆچ ( وەرزە گۆڤـارێکی ڕوناکبیریـە ) ژمـارە ( ١١ – ١٢ ) ،( سـلێمانی :پـایزو زستانی ٢٠٠٩ ) ، ل٤١٠ .

(١١ ) مسعود ضاهر ، فێرنان برۆدێل و قوتابخانەی ( مێژووی نوێ ) ، وەرگێڕانـی شوان ئەحمەد ، گۆڤاری سەردەم ( گۆڤـارێکی تایبەتـە بـە وەرگێـڕان و کولتـوری بیانی ) دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دەریدەکات ، ژمـارە ( ٦١ )،( سـلێمانی :زستانی ٢٠٠٩ )، ل٢٤١.

(١٢) فاروق رەفیق،تاقیکردنەوەیەی چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی لەسەر زەمـین لـە سـەردەمی شـێواندنی چـەمکەکاندا ،فەرهـەنگ(هەفتەنامـەی فەرهـەنگی هەولێر،بلاوکراوەیـەکی فیکـری –ڕەخنەییـە)،ڕۆژنامـەی هـەولێر دەریـدەکات ،ژمارە(٢٠)،هەفتەی (٧)،شوباتی ٢٠١٠،ل٧.

(١٣) کەمال مەزهەر،سەرچاوەی پێشوو،ل١٤.

(١٤) ئی.ئیێچ.کار،سەرچاوەی پێشوو، ل٥٩.

( ١٥ ) کەمال مەزهەر ، سەرچاوەی پێشوو، ل١٧ .

( ١٦ ) کەمال مەزهەر ، سەرچاوەی پێشوو، ل١٦.

( ١٧ ) عبدالکریم سروشت ، شەریعەتی و فەلسەفەی مێژوو ، وەرگێڕانی ئەرخەوان سەیفور ، گۆڤاری کۆچ ( وەرزە گۆڤارێکی ڕوناکبیریە ، ژمارە ١١ — ١٢ ) ، (سلێمانی:پایز و زستانی ٢٠٠٩ )، ل٦٥٢ .

( ١٨ ) کەمال مەزهەر ، سەرچاوەی پێشوو ،ل٩.

( ١٩ ) سامان حسین ئەحمەد ، ڕۆڵی تۆبۆگرافیا لە ئاراستەکردنی ڕەوتی مێژوو لای فەرنان پرۆدیل گۆڤاری کۆچ (٠وەرزە گۆڤارێکی ڕوناکبیریە ، ژمارە ١١ — ١٢ ) ، (سلێمانی پایز و زستانی ٢٠٠٩ )، ل٦٢٦ .

(٢٠) سامان حسین ئەحمەد ، ڕۆڵی تۆبۆگرافیا لە ئاراستەکردنی ڕەوتی مێژوو لای فەرنان پرۆدیل گۆڤاری کۆچ ( وەرزە گۆڤارێکی ڕوناکبیریە ، ژمارە ١١ — ١٢ ) ، (سلێمانی :پایز و زستانی ٢٠٠٩ )، ل٦٣١.

(٢١) سامان حسین ئەحمەد ، ڕۆڵی تۆبۆگرافیا لە ئاراستەکردنی ڕەوتی مێژوو لای فەرنان پرۆدیل گۆڤاری کۆچ ( وەرزە گۆڤارێکی ڕوناکبیریە ، ژمارە ١١ — ١٢ ) ،( سلێمانی :پایز و زستانی ٢٠٠٩ )، ل٦٣٢.

(٢٢) ڕەحیم سابیر، سەرچاوەی پێشوو،ل ٨٩.

(٢٣) هەمان سەرچاوە ،ل ٩٢.

(٢٤) مسعود ضاهر ، فێرنان برۆدێل و قوتابخانەی ( مێژووی نوێ ) ، وەرگێڕانی شوان ئەحمەد ، گۆڤاری سەردەم ( گۆڤارێکی تایبەتە بە وەرگێڕان و کولتوری بیانی ) دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دەریدەکات ، ژمارە ( ٦١ ) (سلێمانی ،زستانی ٢٠٠٩)، ل٢٤٣.

(٢٥) عبدالکریم سروشت ، شەریەتی و فەلسفەی مێژوو ، وەرگێڕانی ئەرخەوان سەیفور ، گۆڤاری کۆچ ( وەرزە گۆڤارێکی ڕوناکبیریە ، ژمارە ١١ — ١٢ ) ، (سلێانی پایز و زستانی ٢٠٠٩ )، ل٦٥٣.

(٢٦) رەحیم سابیر، سەرچاوەی پێشوو،ل٩٤.

(٢٧) ئەحمد سەید عەلی بەرزنجی ،محەمەد پاشای ڕەواندوز، چاپخانەی شڤان ،(سلیمانی ،٢٠٠٤)،ل٦٤،٥٦.

(٢٨) ئەحمد سەید عەلی بەرزنجی،هەمان سەرچاوە، ل٦٦.

(٢٩) مسعود ضاهر ، فێرنان برۆدێل و قوتابخانەی ( مێژووی نوێ ) ، وەرگێڕانی شوان ئەحمەد ، گۆڤاری سەردەم ( گۆڤارێکی تایبەتە بە وەرگێڕان و کولتوری بیانی ) دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دەریدەکات ، ژمارە ( ٦١ ) (سلێمانی ،زستانی ٢٠٠٩)، ل٢٤٢.

(٣٠) رحیم سابیر،سەرچاوەی پێشوو ،ل١٨١.

(٣١)ابن منظور،لسان العرب،دار صادر ،(بیروت)، ج١١ ،ص١١٣.

(٣٢) محمود حسن صوان ،اساسیات الاقتصاد الاسلامي،الطبعة الاولی ، دار المناهج،(عمان، ٢٠٠٤)، ل١٧.

(٣٣)یاسر عبدالکریم الحوراني،الفکر الاقتصادی عند الامام الغزالی،الاردن،٢٠٠٣،ص٩١.

( ٣٤ ) مەسعود عبدالخالق ، مەوسوعەی جودی بۆ چەمك و زاراوەکانی سەردەم ، بەشی یەکەم ، چاپی یکەم ، دەزگای تەفسیر،( هەولێر : ٢٠٠٨) ،ل١٨١ .

( ٣٥ ) فرانك.س. کاپریز، دەرونزانی و ڕەفتار ، وەرگێڕانی سۆران خورماڵی ، چاپەمەنی گەنج ، چاپی یەکەم،( سلێمانی : ٢٠٠٥ ) ، ل٢٣٥ .

( ٣٦ ) فرۆید: دەروونناسی بەناوبانگ لە نەمسا لە دایك بووە لە ساڵی ١٩٣٩ز کۆچی دوایی کردووە.

( ٣٧) مەسعود عبدالخالق ، سەرچاوەی پێشوو ، ل١٢٩ .

( ٣٨ ) ئی.ئێێچ.کار،سەرچاوەی پێشوو، ل٥٦ .

( ٣٩ ) کەمال مەزهەر ، سەرچاوەی پێشوو ، ل١٥ .

( ٤٠ ) کەمال مەزهەر ، هەمان سەرچاوە ، ل١٢ .

(٤١) هەمان سەرچاوە ،ل١٢.

(٤٢) رەحیم سابیر، سەرچاوەی پێشوو،ل١٤١.

(٤٣) ئی.ئێیچ.کار،سەرچاوەی پێشوو، ل١٥٨.

(٤٤) پرۆدۆن: بەیار جۆزیف پرۆدۆن فەیلەسوفی فەرەنسی لە کانونی دووەمی ١٨٠٩ زاینی لە بیزانسون لە دایك بووە لە ١٨٦٥زاینی لە پاریس کۆچی دوایی کردووە.گرینگترین کتێبی خۆی لە ١٨٤٦ زاینی نوسی بە ناوی (سیستەمی دژ پێکە ئابورییەکان).

(٤٥) جۆرج گۆرڤیچ ،پرۆدۆن،وەرگێرانی ئارام ئەمین،چاپی یەکەم،چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە،(هەولێر),ل٤٠،٤٦.

(٤٦) کەمال مەزهەر ، سەرچاوەی پێشوو ، ل١٨.

(٤٧) رەحیم سابیر، سەرچاوەی پێشوو،ل١٠٢.

(٤٨) ویل دورانت ،چێژەکانی فەلسەفە،وەرگێرانی شۆرش ،چاپی یەکەم،(سلیمانی:٢٠٠٧)،ل٣٧٣.

(٤٩)هەمان سەرچاوە، ل٣٧٥.

(٥٠) هەمان سەرچاوە ، ل٣٧٦.

(٥١) هەمان سەرچاوە ،ل٣٨٥.

(٥٢) سەید عبدولعەلی قەوام،جیهانیبوون و جیهانی سێیەم و ئاسایشی نەتەوەیی،و.سەلاح جعفری ،چاپی یەکەم،چاپخانەی هاوسەر،دەزگای موکریانی ،هەولێر،ل٧٢

(٥٣) هەمان سەرچاوە ،ل٨١.

( ٥٤ ) رەحیم سابیر، سەرچاوەی پێشوو،ل١٦٦ .

( ٥٥ ) جفری برۆن ، مێژووی ئەوروپا ، وەرگێرانی نهاد جلال حبیب الله ، چاپی یەکەم ، ٢٠٠٩ ، ل١٦ .

( ٥٦ ) ئارام قادر ، ئیسلام و سیاسەت ، لێکۆڵینەوەیەك لەمەڕ پەیوەندی نێوان ئیسلام و سیاسەت ، چاپی یەکەم ، ٢٠٠٧کۆمپانیای چاپ و پەخشی نووسەر ، ل١٧.

(٥٧) ئی.ئیێچ.کار، سەرچاوەی پێشوو،ل٥٦.

(٥٨) مستەفا محمد تەحان،ئیمام حەسەن بەننا،وەرگێرانی محمد عبدول رحیم،چاپی دووەم ،(سلیمانی:٢٠٠٩)،ل١٤٨.

(٥٩) مەسعود عبدالخالق،سەرچاوەی پێشوو، ل٤٠.

(٦٠) محمد نصر مهنا ،في تاريخ الفكر السياسي المقارن،(الاسكندرية:٢٠٠٦)،ل١٣،٢١.

(٦١) محمود حسن صوان ،اساسيات الاقتصاد الاسلامي،الطبعة الاولى،دار المناهج،(عمان:٢٠٠٤)،ل١٨.

(٦٢) کەمال پوولادی،مێژووی هزری سیاسی لە رۆژئاوا،بەرگی یەکەم،چاپی یەکەم،چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە،(هەولێر:٢٠٠٥)،ل٤٧.

(٦٣) مستەفا محمد تەحان،سەرچاوەی پێشوو،ل٢٣٠.

(٦٤)کۆمەڵێ نووسەر،شۆرشی فەرەنسی١٧٨٩،وەرگێرانی هەورامان وریا قانع،چاپخانەی رەنج،(سلیمانی:٢٠٠٦)،ل٤١.

(٦٥) هەمان سەرچاوە،ل٢٦.

(٦٦) هەمان سەرچاوە،ل٤٠ .

(٦٧) هەمان سەرچاوە،ل٢٦.

(٦٨) علی محمد صلابی،دەوڵەتی عوسمانی هۆی گەشەسەندن و روخانی ، و. احمد عبدالرحمن احمد و نهاد جلال ،چاپی یەکەم ، دار المعرفه ،(بیروت:٢٠٠٧) ، ل٣٤٥.

(٦٩) هەمان سەرچاوە،ل٦٥١.

سەرچاوەکان

- القران الکریم .

کتێبە کوردییەکان

١- ئارام قادر ، ئیسلام و سیاسەت ، لێکۆڵینەوەیەك لەمەڕ پەیوەندی نێوان ئیسلام و سیاسەت ، چاپی یەکەم ، ٢٠٠٧کۆمپانیای چاپ و پەخشی نووسەر.

٢- ئەحمد سەید عەلی بەرزنجی ،محەمەد پاشای ڕەواندوز، چاپخانەی شڤان ،(سلیمانی ،٢٠٠٤).

٣- ئی.ئیچ.کار،مێژووچیە؟ وەرگێرانی ئاسۆس محەمەد مەلاقادر،چاپی یەکەم،چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە ،دەزگای موکریانی،( هەولێر:٢٠٠٥).

٤- جفری برۆن ، مێژووی ئەوروپا ، وەرگێرانی نهاد جلال حبیب الله ، چاپی یەکەم ، ٢٠٠٩.

٥- جۆرج گۆرڤیچ ،پرۆدۆن،وەرگیرانی ئارام ئەمین،چاپی یەکەم،چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە،(هەولێر).

٦- رەحیم سابیر، فەلسەفەی مێژوو، چاپی دووەم ،چاپخانەی گەنج،(سلیمانی ٢٠٠٥:).

٧- سەید عبدولعەلی قەوام،جیهانیبوون و جیهانی سێیەم و ئاسایشی نەتەوەیی،و.سەلاح جعفری ،چاپی یەکەم،چاپخانەی هاوسەر،دەزگای موکریانی ،(هەولێر).

٨- عەبدوڵلا زەنگەنە ،بستێکی خاکی کوردستان بە هەموو دونیا ناگۆرمەوە (دیداروچاوپێکەوتن لەگەڵ د.کەمال مەزهەر)،چاپی یەکەم ،چاپخانەی گرین گلۆری ،(لوبنان:٢٠٠٩).

٩-علی محمد صلابی،دەوڵەتی عوسمانی هۆی گە شەسەندن و روخانی ، و. احمد عبدالرحمن احمد و نهاد جلال ،چاپی یەکەم ، دار المعرفه ،(بیروت:٢٠٠٧) .

١٠-فرانك . س . کاپریز ، دەروونزانی و ڕەفتار ، وەرگێڕانی سۆران خورماڵی ، چاپەمەنی گەنج ، چاپی یەکەم ، ( سلێمانی : ٢٠٠٥ ) .

١١- کەمال پوولادی،مێژووی هزری سیاسی لە رۆژئاوا،بەرگی یەکەم،چاپی یەکەم،چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە،(هەولێر:٢٠٠٥).

١٢- کەمال مەزهەر،مێژوو،( بەغدا: ١٩٨٣).

١٣- کۆمەڵێ نووسەر،شورشی فەرەنسی١٧٨٩،وەرگێرانی هەورامان وریا قانع،چاپخانەی رەنج،(سلیمانی:٢٠٠٦).

١٤-مستەفا محمد تەحان،ئیمام حەسەن بەننا،وەرگێرانی محمد عبدول رحیم ،چاپی دووەم ،(سلیمانی:٢٠٠٩).

١٥- مەسعود عبدالخالق ، مەوسوعەی جودی بۆ چەمك و زاراوەکانی سەردەم ، بەشی یەکەم ، چاپی یکەم ، دەزگای تەفسیر ،( هەولێر : ٢٠٠٨ ) .

١٦- ویل دورانت ،چیژەکانی فەلسەفە،وەرگێرانی شۆرش ،چاپی یەکەم،(سلیمانی:٢٠٠٧).

کتێبە عەرەبیەکان

١٧- ابن منظور،لسان العرب،دار صادر ،(بیروت)، ج١١ .

١٨-محمود حسن صوان ،اساسیات الاقتصاد الاسلامی،الگبعه الاولی،دار المناهج،(عمان:٢٠٠٤).

١٩- محمد نصر مهنا ،فی تاریخ الفکر السیاسی المقارن،(الاسکندریه:٢٠٠٦).

٢٠- یاسر عبدالکریم الحورانی،الفکر الاقتصادی عند الامام الغزالی،(الاردن:٢٠٠٣).

گۆڤارەکان

٢١- عبدالکریم سروشت ، شەریعەتی و فەلسەفەی مێژوو ، وەرگێڕانی ئەرخەوان سەیفور ، گۆڤاری کۆچ ( وەرزە گۆڤارێکی ڕوناکبیریە ، ژمارە ١١ - ١٢ ) ، (سلێمانی:پایز و زستانی ٢٠٠٩ ).

٢٢- عەبدولحسین زرین کوب ، ئەفسانە و مێژوو ، وەرگێڕانی وریا فایەق ، گۆڤاری کۆچ ( وەرزە گۆڤارێکی ڕوناکبیریە ) ژمارە ( ١١ - ١٢ ) ،( سلێمانی :پایزو زستانی ٢٠٠٩ ) .
٢٣- عەلی شەریعەتی ،میژوو.. زانستی هەبوونی مرۆڤ ، وەرگێرانی هاوار محمد رشید ،(١-٢)، گۆڤاری مێژوو، ژمارە (١٠)،(هەولێر: بەهاری ٢٠٠٩).
٢٤- سامان حسین ئەحمەد ، ڕۆڵی تۆبۆگرافیا لە ئاڕاستەکردنی ڕەوتی مێژوو لای ڤەرنان پرۆدیل گۆڤاری کۆچ ( وەرزە گۆڤارێکی ڕوناکبیریە ، ژمارە ١١ - ١٢ ) ، (سلێمانی پایز و زستانی ٢٠٠٩ ) .
٢٥- مسعود چاهر ، فێرنان برۆدێل و قوتابخانەی ( مێژووی نویَ ) ، وەرگێڕانی شوان ئەحمەد ، گۆڤاری سەردەم ( گۆڤارێکی تایبەتە بە وەرگێڕان و کولتوری بیانی ) دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دەریدەکات ، ژمارە ( ٦١ )،( سلێمانی :زستانی ٢٠٠٩ ).
٢٦- فاروق رەفیق،تاقیکردنەوەیەی چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی لەسەر زەمین لە سەردەمی شێواندنی چەمکەکاندا ،فەرهەنگ(هەفتەنامەی فەرهەنگی هەولێر،بلاوکراوەیەکی فیکری -ڕەخنەییە)،ڕۆژنامەی هەولێر دەریدەکات ،ژمارە(٢٠)،هەفتەی (٧)،(شوباتی ٢٠١٠).

# دوو هەڵوێست لە تەرازووی مێژوودا

د. حسن جاف

وەکو زۆربەی مێژوونووسان ئاماژەی بۆ دەکەن، میللەتی کورد لە کوردستانی باشووردا تووش گێژاوی شەڕی یەکەمی جیهانی ببوو، و قات و قڕی و برسییەتی و ماڵوێرانی و کوێرەوەری یەکەم مەرجی سەرەکی (موضوعي)ی یاخیبوون و لەتاو زوڵم و زۆر و ڕاپەڕینی میللەتی کورد بوو ئەگەر ئەو خەڵکە بارودۆخێکی وەك بارودۆخی شەڕی جیهانی کە هەرچی بەدبەختی مرۆڤایەتی هەیە خەست بوو بووە، نەبووایە[1] هەرگیز بیریان لەوە نەدەکردەوە دوای شۆڕشی شێخ مەحمودی نەمر بکەون، لەو بارودۆخەدا نەتەوەی کورد دوای هەر میرێك، هەر ئاغایەك، هەر شێخێك، هەر مەلایەك، هەر کەسێکی تر بە نەبزی ئەو بجووڵایەتەوە دوای ئەکەوت و نەشی دەپرسی پێشەواکەی شێخە یان دەرەبەگە یان هەر بابەتێکی ترە کەس لە (هویە)ی چینایەتی هیچ پێشەوایەکی شۆڕشەکانی کوردی نەپرسیووە ئەو جۆرە (هویە)ش بە خەیاڵی شۆڕشگێڕانی ئەو سەردەمانەدا نەهاتووە هەرگیز بە مەرجی چوونە مەیدانی شۆڕشیان لە قەڵەم نەداوە، لام وایە قۆناغەکە لە بارودۆخێکدا بوو.. هەر دەسەڵاتدارێکی کورد چ شێخ چ مەلا چ ئاغا و بەگ ئاڵای شۆڕشی کوردی هەڵکردایە خەڵکەکە دوای ئەکەوت. شێخ مەحمودی حەفید لە سەرەتای داگیرکردنی کوردستان لەلایەن ئینگلیزەکانەوە لەو بڕوایەدابوو ئینگلیزەکان شتێك بۆ کورد دەکەن و مافی ڕەوای وەك میللەتێك دەپارێزن.

لەم بارەوە خوالێخۆشبوو ڕەفیق حیلمی دەڵێت لە ٧ی نیسانی ١٩١٨ لەژێر سەرکردایەتی جەنەراڵ مارشالدا هێزێکی ئینگلیز گەیشتنە کەرکوك، شێخ مەحمود

لەگەڵ تورکەکان بەتەواوی تێك چووبوو و هیوای هیچی پێیان نەمابوو، لەبەرئەوە ویستی لەپێش گەیشتنی ئینگلیزەکان بە سلێمانی لە کات و لە هەل کەڵك وەربگرێت و دوای ئەوە کە لەگەڵ پیا وە ناسراوەکانی ئەو دەمەی سلێمانیدا پێکهات نامەیەکی بەدزییەوە نارده کەرکوك بۆ ویڵسن و گەورەی هێزەکانی ئینگلیز . لەم نامەیەدا داوای ئەوەی لێدەکردن کە بڕیار بدەن بە دامەزراندنی حکومەتێکی کوردی لە ناوچەی سلێمانی لەگەڵ هەندێ قەول و بڕیاری تر. (امتیازات)، خۆیشی واتە شێخ مەحمود بڕیاری ئەوەی ئەدا کە بەناوی ئینگلیزەکانەوە لەژێر چاودێری ئەواندا سەرەکی ئەم حکومەتە بکات.[٢] کەواتە شێخ مەحمود لەو بڕوایەدا بووە کە ئینگلیزەکان کوردستان لە دەست جەور و ستەمی عوسمانییەکان ئازاد دەکەن بۆیە بڕیاری هاوکارییان لەگەڵدا دەدا و ئەوەبوو لە ٣١ی تشرینی یەکەمی ١٩١٨ کە موتارەکە (هدنە) بڵاو کرایەوە، شێخ ئەو لەشکرە تورکەی کە لە سلێمانیدا بوو دەستی بەسەردا گرت و سلێمانی تەسلیمی ئینگلیزەکان کرد. میجر نوئێل کە بەم جۆرە بە ئاسانیەوە بەبێ دەنگ و تەقە هاتە سلێمانی دەستبەجێ بە یارمەتی شێخ مەحمود دەستکرا بە ناردنی عەسکەرەکانی تورك بۆ لای عەلی ئیحسان پاشان لە موصل عەممارەکانی خواردەمەنی و ئازووقە و ئەو چەك و سلاحانەی کە لە عەماردابوو بەدەست عەسکەرەکانەوە بوو لەلایەن شێخ مەحمودەوە لێیان وەرگیرا[٣].

دوای ئەمە بەپێی ئەو ڕاسپێرییە کە لە (ویڵسن)ی وەرگرتبوو میجەر نوئێل ڕۆژی یەکەمی تشرینی دووەمی ١٩١٨ لەبەر دەرگای (سەرا) کۆبوونەوەیەکی گەورەی ڕێکخست کە عولەما و ئەشراف و سادات و تاجرەکان و ڕەئیسەکان و عەشایەر و لە هەموو دەستەکانی تری ئەهالی تێدا بوو بۆیە بەناوی نوێنەری دەوڵەتی بەریتانیا بوو لە عێراق واتە بەناوی حاکمی عام و بە فارسی ووتارێکی دوورودرێژی خوێندەوە و موژدەی ئازادی و سەربەستی بە کوردان دا و بەڵێنی

پاڵپشتی و هاوکاری بە کوردان ڕاگەیاند، و شێخ مەحمودی لەلایەن حاکمی عامی عێراقەوە بە حوکمداری کوردستان ناساند[٤]. لەم قۆناغەدا دەبینین بنەماڵەی جاف بەتایبەت بنەماڵەی عوسمان پاشا کە بریتی بوون لە عادیلە خانمی هاوسەری عوسمان پاشا و کوڕەکانی ئەحمەد موختار جاف و عیزەت بەگی وەسمان پاشا هاوبیری شێخ مەحمود بوونە. بنەماڵەی جاف لەم قۆناغەدا لەو بڕوادا بوونە کە ئینگلیز کوردستان ئازاد دەکات و زۆربەی ڕۆشنبیرانی ئەو سەردەمە و پیاوە ناسراوەکان و دەسەڵاتدارانی کورد هەر لەو بڕوادا بوونە، بەتایبەت لەم بارەوە ئاماژە بۆ شێخ تەهای نەهری دەکەن کە لەو بڕوایەدا دوو دڵی بەخۆی نیشان نەدەدا لەو بڕوایەدا بوو ئازادی کوردستان ئینگلیزەکان مسۆگەری دەکەن و خۆیشی دەکەنە حکومداری کوردستان، بەم هیوایەوە بە هەموو توانا یەکییەوە هاوکاری ئینگلیزەکانی دەکرد. هەروەها خوالێخۆشبوو سمکۆی شکاکیش هەر لەو بڕوادا بووە و زۆر تەقەلای دا کە ئینگلیزەکان هاوکاری بکەن و متمانەی پێ ببەخشن و پاڵپشتی شۆڕەکەی دژی دەوڵەتی ئێران بکەن، پێویستە ئەم حەقیقەتەیش لە بەرچاو بگرین لە کۆنگرەی قاهیرەدا ڕێکەوتی ١٢ی ئازاری ١٩٢٠ چەرچل و وەزیری موستەعمەراتی ئینگلیز بە پشت بەستن بەو یاداشتەی فەرمانگەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست پێشکەشی کردبوو بە لیژنەی سیاسی نووسرابوو ڕای بەهێزی ئێمە ئەوەیە کە ناوچە کوردییەکان نابێ بخرێتە سەر ئەو دەوڵەتە عەرەبییە کە میسۆپۆتامیا دروست دەکرێ، بۆیە دەبێ حکومەتی خاوەن شکۆ هەوڵبدا و بەپێی توانا هانی بنەمای یەکێتی کوردی بدات و پێناسی کوردی چاودێری بکات، دیاریکردنی ئەو ناوچەیەی حکومەتی خاوەن شکۆ دەتوانێ ئەم سیاسەتەی تێدا پەیڕەو بکات بەپێی پێویست پشت بەو مەرجە کۆتاییانە دەبەستێ کە لە ئەنجامی ڕێکەوتنێکی ئاشتیانە لەگەڵ تورکیادا دێتە ئاراوە، پێوانەی ئەم ناوچەیە هەر چەندێك بێت ئێمە لەو بڕوایەداین کە حکومەتی خاوەن

شکۆ ئاسانکاری بۆ بوونی جۆرێك لە سیستەمی ناوەندیی کوردی دەکات کە ڕاوێژکارێکی بەریتانی لەگەڵ بێت بەمەرجێك ئەم ڕاوێژکارە سەر بە نوێنەری باڵا (المندوب السامی) بێ لە میسۆپۆتامیا و هەر لەڕێی ئەویشەوە پەیوەندی لەگەڵ حکومەتی خاوەن شکۆدا دەبێت.

لە کۆبوونەوەی ڕۆژی ١٥ی ئازاری لیژنەکە: سێر پرسی کۆکس قسەی کرد سەبارەت بە ناوەڕۆکی یاداشتی فەرمانگەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لاری هەبوو و گووتی کورد تەنها لە کەرکوك و سلێمانی و ناوچەکانی باکوری ویلایەتی موصل زۆرینەن کە بەشێکی جیانەکراوەی عێراقە، (هربرت یۆم) بەرپەرچی دایەوە، پێشنیاری ئەوەی کرد کە یەکسەر و بێ دواکەوتن دەوڵەتێکی کوردی دابمەزرێ و بخرێتە ژێر چاودێری ڕاستەوخۆی نوێنەری باڵا نەك بەشێك بێت لە عێراق یان لەبەرپرسیارێتی حکومەتەکەیدا بێت، میجەر نوئێل لەوەدا لایەنگیریی کردوینستۆن چەرچل ڕای وابوو کە ئەو حوکمێکی زاتی تەواوی کوردستانی باشووری پێ باشە، Home Rule لەبەرئەوەی دەیویست دەوڵەتێکی جیاکەرەوە هەبێ لەنێوان فشاری تورکی لە دەرەوە و پەیدابوونی بزافێکی عێراقی دژ بە بەریتانیا لە ناوەوە ڕەزامەندی خۆی بۆ ڕاکانی یۆنگ و نوئێل دەربڕی پاشان گووتی کە حکومەتی داهاتووی عێراق کە خاوەن سوپایەکی عەرەبی بێت هیوا و ئاواتەکانی کورد پشتگوێ دەخات، وەك کەمایەتیش دەیان چەوسێنێتەوە، پاشان وەك ئاگادارکردنەوەیەك گووتی ئەگەر بوار بۆ کوردەکان نەڕەخسێ حوکمی خۆیان بۆ خۆیان بکەن و بەسترانەوە بە دەوڵەتی تازە دروستبووی عێراقەوە ئەوسا هەر میرێکی شەریفی (نیسبەت بۆ شەریفی مەککە) ئەو لێرەدا مەبەستی (فەیصەڵ)ە هەرچەندە دیموکراتی بێ و بێ لایەنانە بیر بکاتەوە کە هێزی بەدەست خۆیەوە و دوور نیە لە ڕووی ئاواتی نەتەوەیی کورد وبەرژەوەندی کورددا وەك کەمایەتییەکی ڕەگەزی بوەستێ، بۆیە هیچ ڕێگایەکی دیکە نییە لە بەرژەوەندی بەریتانیادا بێت

جگە لە دروستکردنی دەوڵەتێکی جیاکەرەوەی Buffe/ Stutf کوردی لەنێوان عێراق و تورکیادا. لیژنە کارەکانی خۆی کۆتایی پێهێنا بە ڕاسپاردەکەی (یۆنگ) کە داوا دەکات باشووری کوردستان بە جیاکراوەیی بمێنێتەوە، و نەبەسترێتەوە بە عێراقەوە (چەرچل) و نێل و لۆرێنس کە زۆرینەن لایەنگری ئەو ڕاسپاردە بوون، ئەوانەی دژی بوون سێر پرسی کۆکس و گرترود بیل بوون ڕای بایکۆت سکرتێری وەرنەگیراو لە وتوێژەکەدا بەشداری نەکرد، بەڵام زۆرینە لەبەر دڵی سێر پرسی کۆکس مەرجێکی دانا کە ئەم بڕیارە تا سێ ساڵ کاری پێناکرێت بۆئەوەی کوردەکان بتوانن ڕای خۆیان دەربڕن ئایا دەچنە پاڵ عێراق یان نا°.

بەم جۆرە لە بڕیارەکانی کۆنگرەی قاهیرەدا بۆمان ڕووندەبێتەوە لە سیاسەتی ئینگلیزەکاندا سەبارەت بە کوردستان دوو بۆچوونی جیاواز هەبووە، یەکێکیان بۆچوونی کاربەدەستانی سەر بە بە بەڕێوەبەرایەتی هندستانە کە بە قوتابخانەی (بۆمبای) بەناوبانگە کە بڕوایان بە دامەزراندنی دەوڵەتێکی یەکپارچە لە عێراقدا هەبووە و بە پێویستیان زانیووە کە کوردستانیش بلکێنرێتە ئەم دەوڵەتە تازەوە و سێر پرسی کۆکس و گرترودبیل نوماینەدەی ئەم قوتابخانەیە بوونە لەبەرامبەر ئەم سیاسەتەدا بۆچوونی قوتابخانەی قاهیرەش لە ئارادا بووە کە باوەڕیان بە دەوڵەتێکی سەر بەخۆی کوردبووە لە کوردستانی باشووردا کە چەرچل و یۆنگ و نوئێل و لۆرنس هەڵگری ئەم باوەڕە بوونە.

ئەوەبوو لەماوەی ئەو سێ ساڵەدا کە دانرا بۆ جێبەجێکردنی بڕیارەکانی موئتەمەری قاهیرە بۆچوونی سێر پرسی کوکس و مس بیل سەرکەوت و کوردستانی باشووریان لکاندە دەوڵەتی تازە دامەزراوی عێراقەوە کە لە ساڵی ١٩٢١ دروستکرا، کەوابوو زۆربەی کەسایەتییە ناودارەکان کورد لەو سەردەمەدا لەو بڕوایەدا نەبوون کە ئینگلیس دەوڵەتێکی کورد پێکدەهێنێت کەسایەتییەکانی بەگزادەی جافیش وەکو دەیان ناسراوان و کەسایەتییەکانی کورد کە ناومان

هێنان لە هەمان بڕوادابوون بەتایبەت عادیلە خانم هاوسەری عوسمان پاشای جاف لەو بڕوایەدا دڵنیابووە و دوو دڵییەکی لەم بارەوە نیشان نەدەدا، هەروەها ئەحمەد موختار جاف و عیزەت بەگی برای و کەریم بەگی فەتاح بەگ هەر ئەو بڕوایەیان هەبووە، بەڵام مەحمود پاشا هەر لە سەرەتاوە چووە ئەو باوەڕەوە کە ئینگلیسەکان ڕاست ناکەن لەگەڵ کورددا ئەوەبوو وەڵامێکی نێگەتیف بە میجەر نۆئیل دەداتەوە کاتێك داخوازی هاوکاری لێ کردبوو[٦].

بەبۆچوونی خۆم ئەم هەڵوێستەی مەحمود پاشا تەنها لەبەر پیری و نەخۆشی نەبووە، هۆ سەرەکییەکەی ئەوەبووە کە بینیوویەتی ئینگلیزەکان پتر ڕوو لە شێخ مەحمود دەکەن و ئەم ڕەفتارەیان بە کەمکردنەوەی شان و شەوکەتی خۆی لە قەڵەم داوە. تەنیا وەکو مێژوونووسان داکۆکی لەسەر دەکەن مەحمود پاشا دژی دەوڵەتی عوسمانی جوڵاوەتەوە. خوالێخۆشبوو محەمەد ئەمین زەکی بەگ لەم بارەوە ئەڵێت: مەحمود پاشا لەم دواییەدا موتەهەم کرابوو بە هەندێ مەسەلەی نەتەوەیی و حکومەتی عوسمانی لەڕووی ئەم نەتەوەگەریی و سیاسەتی نەتەوەگەرییەوە دڵی لێ کرمێ بووبوو[٧]. د. کەمال مەزهەریش لەم بارەوە ئەڵێ سوارەی حەمیدییە عەشایەرە کوردەکان سوڵتان عەبدولحەمید بەکاری ئەهێنان بۆ چەسپاندنی دەسەڵاتی خۆی. بەهۆی ئەم هێزەوە دەیتوانی بەرەنگاری بزووتنەوەی نەتەوەیی میللەتەکانی ژێر دەست بکا بەتایبەت بزووتنەوەی کوردەکان خۆیان، هەروەها ئەم هێزە بەکاربێنێ بە مەبەستی بەرپاکردنی هەرا و ئاژاوە لە سنووری ڕووسیادا، شایانی ووتنە زۆربەی عەشایەرە گەورەکانی کوردستان پشتیوانی دروستیبوونی ئەم تەشکیلاتی حەمیدییە نەبوون وەکو عەشیرەتی پشدەر و هەمەوەند و جاف و عەشایەری ناوچەی بەدلیس[٨].

بێگومان تەشکیلاتی حەمیدیە لە دەورەی سەرۆکایەتی مەحمود پاشای جافدا دامەزراوە. هەر لەم بارەوە لازاریف ڕۆژهەڵاتناسی ڕووسی دەڵێت سوڵتان

عەبدولحەمید چاوی لەوەبوو کە لەسەر حیسابی دراوسێکەی لای ڕاستییەوە هەیبەت و زەبر و زەنگی دەوڵەتەکەی ببوژێنێتەوە و بیچەسپێنێ و سوپاکەی بەهێز بکات و چاو لە دۆخە داڕزاوەکەی وڵات کە هەتا دەهات زیاتر بەرەو شلەقین و شلۆقی دەڕۆیشت، بپۆشێت. ئەم دۆخە شلۆقییە کە لەو ڕۆژەوە دەستی پێکرد کە هاتە سەر حوکم و بەدرێژاییساڵانی فەرمانڕەواییەکەی بەردەوام بوو بۆئەوە وای دەکرد پیلانی دەستدرێژکردنە سەر ئێران گەرم بێت و جۆش بسێنێت، ئەوەبوو لە ناوچەی سەر سنووردا تەنیا کورد هەبوو ئەم سنوورەکەش تا ئەو ڕۆژە دەستنیشان نەکرابوو، هەر پاش دامەزراندنی سوارەی حەمیدیە بە ساڵێك پشێوی لەسەر سنووری ئێران وتورکیا دەستی پێکرد، خێڵی جاف لە عێراقدا ئەو ئاشووبەی هەڵگیرساند و مەحمود پاشای جاف سەرۆکی ئەم خێڵە هەمیشە لەگەڵ کاربەدەستانی دەوڵەتی عوسمانیدا لە دووبەرەکیدا بوو و دانووی لەگەڵیان نەدەکولا[1].

پاش دامرکاندنەوەی شۆڕشی شێخ عوبەیدولا ساڵی ١٨٨٢ مەحمود پاشا هەمیشە لە پارێزدا بووە ئەو پەیمانە بەجێبهێنێ کە شێخ لەگەڵ باوکیدا بەستبووی و کوشتنی حەمە پاشا ١٧١٥– ١٨٨١ بووە هۆی جێبەجێنەکردنی ئەو پەیمانە و لەگەڵ چەند سەردارێکی تری کورددا وەك شێخ عەبدوللقادری نەهری، بنەماڵەی بەدرخانییەکان لە ئەستەمبوڵ لەو خولیایەدا بوون ، ڕۆژێ دژی عوسمانییەکان ڕاپەڕن، گرتنی مەحمود پاشا لەلایەن سوڵتان عەبدولحەمیدەوە یەکجار تووڕەی دەکات و پەیوەندی لەگەڵ حیزب و کۆڕ و کۆمەڵەی دژ بە سوڵتان عەبدولحەمید وەك کۆمەڵەی "جون تورك" و پاش ئەم کۆمەڵەی لەگەڵ کۆمەڵەی "اتحاد وترقی"دا بەرقەرار دەکات. ئەو کۆمەڵانە هانیان داون لەدژی سوڵتان عەبدولحەمید شۆڕشێ بەرپا بکەن، بەم خولیایەوە ساڵی ١٣٠٩ك/ ١٨٩٢ز بڕیاریدا لە ئەستەمبوڵ کە دەست بەسەر بوو هەڵبێت و لەڕێی قەفقاس و ئێرانەوە خۆی

دەگەیەنێتە شارەزوور و ناوچەکانی جاف لە کوردستانی باشووردا و لە دەوڵەتی عوسمانی یاغی دەبێت و ئەداتە شاخی بەمۆ و کۆنگرەیەکی گەورە لە سەرۆک هۆزەکانی کورد پێك دێنێ، پیرە مێرد لەم بارەوە دەڵێت: هەر سەبارەت بە کورد و ئەو کۆنگرانەی بۆ دەست خستنی مەوجودییەتێك بۆی بەستراوە کۆبوونەوە گەورەکەی کەناری ئاوی زەڵم و هەولی مەردانەی مەحمود پاشام لەم رووەوە دێتەوە بیر[10]. بەڵام پیری و کەنەفتی و نەخۆشی لەدوا دوایی تەمەنیدا لەپێی دەخات و ئەم ئیعتیرافە گەورەیە دەکات و دەڵێ: "تا توانیم نەمزانی، کە زانیم نەمتوانی"، کەوابوو مەحمود پاشایش رۆحی کوردایەتی لە دەمارەکانیدا دەجولایەوە و لەسەرەتای داگیرکردنی کوردستاندا لەلایەن ئینگلیسەکانەوە و ئەو توانایەی لەخۆیدا نەدەبینی بە چالاکی بێتە گۆڕەپانی سیاسەتەوە، و کە دەبینێ ئینگلیسەکان بتر روویان لە شێخ مەحمودە کە بەو پەڕی توانایەوە هاتبووە گۆڕەپانی سیاسەتەوە و ئاڵای کوردایەتی هەڵگرتبوو لێیان ئەتەکێتەوە و بە راشکاوی لە "دووئاوان"دا بە میجر نۆئیل دەڵێت کە هاوکاریتان لەگەڵدا ناکەم[11].

ئەمەش هەڵەیەکی مێژوویی بووە کە مەحمود پاشا تێی کەوتووە، ئەگینا هاوکاری لەگەڵ ئینگلیسەکان و شێخ مەحموددا بکردایە لەو بڕوایەدام زۆر شت دەگۆڕا و بەقازانجی دۆزی کورد لەو قۆناغەدا دەبوو، کەوابوو ئەم هەڵوێست و دوو بەرەکییە کە لەنێوان مەحمودد پاشا و خوالێخۆشبوو شێخ مەحموددا هەبووە لەسەر کوردایەتی نەبووە کە یەکێکیان باش بووبن و ئەو تریان دژ بە کورد، هەردوو لایەنەکە، چی بەگزادەکانی جاف و چی شێخ مەحمودی نەمر بڕوایان بە کوردایەتی هەبووە، مەحمود پاشای جاف بەڕاشکاوی ئیعتیرافی بەم حەقیقەتە کردووە کە هەر سەرۆکێکی کوردی دوای کێشەی میللەتەکەی بکەوێ پاڵپشتی لێدەکات و ئەم ئیعتیرافەی مەحمود پاشا لە گفتوگۆیەکدا لەگەڵ شاعیری بەناوبانگی میللەتەکەمان شێخ سەلامی عازەبانیدا روون دەبێتەوە کە بە شێخ

سەلام دەڵێت دوای بیستنی خەبەری دیلیی شێخ مەحمود بە برینداری لە شەڕی دەربەندی بازیاندا "شێخ مەحمود بووە پیاوێکی گەورە و ڕەفیقی ئێمەمانان نییە"[١٢].

ئەم هەڵوێستی دووبەرەکییە خێڵەکییە کە لەنێوان بەگزادەکانی جاف و شێخ مەحموددا هەبووە لە قۆناغ بەدەرنەبووە و لەگەڵ سروشتی ئەو سەردەمەدا گونجاوە، و ئەوەی شا یانی باسە ئەم دووبەرەکییە هەرگیز نەگەیشتۆتە ڕادەی ڕاپەڕین و شەڕو خوێنڕشتن. ئەم ململانێیە بە سەرکەوتنی شێخ مەحمود هاتە ئەنجام چونکە شێخ مەحمود بزوتنەوەی ئازادیخوازی میللەتەکەی لە ئەستۆی سەرۆك هۆزەکان و بنەماڵە ناسراوە بە دەسەڵاتەکانی تری کورد لە مەیدان بەدوور خستەوە، و خۆی بووە تاکە سواری ئەو سەردەمە، چونکە سیاسەتی ئینگلیسەکان بەپێچەوانەی وەعدێك کەدرابووە کورد گۆڕا و قوتابخانەی سیاسی (بومبەی) سەرکەوتە سەر قوتابخانەی سیاسی قاهیرەدا کە دەیویست دەوڵەتێکی کوردی لە کوردستانی باشووردا دامەزرێنێت و کەسایەتییەکانی بەگزادەی جاف وەکوئەحمەد موختار جاف و کەریم بەگی جاف لەو هەڵوێست گۆڕانەی ئینگلیسەکان یەکجار قارس و زیز دەبن بەتایبەت ئەحمەد موختار جاف کە شاعیرێکی کوردپەروەر و دڵسۆز بووە بۆئەوەی کورد بگاتە ئامانجە نەتەوایەتییەکانی ئامادەبووە خۆی قوربانی بکات وەك خۆی لە شعرێکی دا دەڵێت:

جەژنی قوربانساڵی جارێ خەڵك ی قوربانی ئەکەن

بۆ وەتەن من ڕۆژی سەد جار ڕۆحی خۆم قوربان ئەکەم..

شاعیرانی کورد سەرزەنشت دەکا کە بەسە بەس باسی زوڵف و چاوی یار بکەن و دەڵێ:

شاعیرانی کورد بەسە بەس باسی زوڵف و چاو بکەن

کەم خەیاڵی پەرچەم و کاکۆڵی ئاڵۆزاو بکەن
لابدەن کەم باسی سونبول یا لقی لاو لاو بکەن
ئێوە تەدبیرێکی حاڵی قەومی دڵسوتاو بکەن[١٣].

یاوەك داخوازی لە میللەتەکەی دەکات لە خەو هەڵسن، دەڵێ:

لە خەو هەڵسن درەنگە میللەتی کورد، خەو زەرەرتانە
هەموو تاریخی عالەم شاهیدی فەزل و هونەرتانە
دەسا تێکۆشن ئەی قەومی نەجیبی بێکەسی مەزڵوم
بە گورج قەتعیکەن ئەو ڕێگە دوورە وا لە بەرتانە
بخوێنن چونکە خوێندن بۆ دیفاعی تیغی دوژمنتان
هەموو ئان و سەعاتێ عەینی قەڵغان و سوپەرتانە
بەخۆڕایی لەدەستی بەرمەدەن ئەم خاکە مەحبوبە
کە تۆزی وەك گەواهر سورمە و کوحلی بەسەرتانە
بەسەر چەرخا ئەکەر نازیش بکەن حەقتانە ئەی کوردان
تەماشای سێبەری ئەم شاخ و کێوانەی لەسەرتانە
بەبێ قەدری بەسەریا ڕامەبورن حورمەتی بگرن
گوڵاڵە سوورەی ئەم سەحرایە خوێناو جگەرتانە
دەمێکە ئەم وڵاتە وا ئەسیری پەنجەی جەهلە
لە سایەی عیلمەوە ئیمڕۆ ئیتر نۆبەی زەفەرتانە
زبانی حال (ئەحمەد) هەر ئەڵێ وریابن ئەی میللەت
بزانن بەردی ئەم سەحرایە ئەڵماس و گەوهەرتانە[١٤].

ئەحمەد موختار هەر لەم بابەتەوە بۆمبای خەیاڵی ئەتەقێنێتەوە وبێ باکانە لە ١٩ شعری بەرزتردا سۆزی دەروونی خۆی بۆ وڵاتەکەی کوردستان دەخاتە ڕوو دەڵێت:

دێتە گوێم دەنگ بەسۆز و شیوەن و گریانە وا
ناڵەی دڵمە لە حەسرەت خاکی کوردستانە وا
لانەواز و بێکەس و مظلومن ئێستا قەوی کورد
گاه بەدەستی تورکەکان و گاه بەدەستی ئێرانەوە.
اسمی وجدان و عەدالەت بێ مسمایە و درۆ
بۆ سیاسەت ئەم قسە کە ووتووتە سەر لێوانەوە
ڕاستە گەر ئیسمی عەدالەت بۆچی منداڵانی کورد
دیل و سەرگەردان بورینەوە بەسەر کێوانەوە
ئەم قەراری عصبە وا خەڵکی ئەڵێن بۆ کورد ئەبێ
هەر قسەی ڕووتە و قسەش ناچێتە ناو گیرافانەوە
ئیمڕۆ باوابێ بەڵام ڕۆژێ ئەبێ ئەولادی کورد
دێتەوە مەیدان بەعیلم و سەنعەت و عیرفانەوە
نەوجەوانان وەتەن تەوحید ئەکەن ئەم میللەتە
هەر لە کرماشان هەتا ورمێ و سنە و بۆکانەوە
ڕێکئەخەن وضعییەتی وان و جەزیرە سەر بەسەر
عەقرە و زاخۆ ئەبەستن ڕێك بەقەد بۆتانەوە
خانەقین و مەندەلی خاکی لوڕسیتان یەك بە یەك
وەك وەسا ئەدروون بە باڵای مەنتیقەی بابانەوە
بەچکە شێرانی عەشایر بۆ قڕانی دوژمنان
هەر وەکو ڕۆستەم ئەکەونە جەولانەوە
پاش قڕانی مودەعی دەست پێ ئەکەن تەعمیری ملك
ڕێگەی ئاسن ئەچێتە شاخی هەورامانەوە
کێووکەژ ئەبێتە باغ و جادە قەسروری
بۆ تەما شا دەستە دەستە دێن لە ئینگلستانەوە..

بێگومان ئەحمەد موختار جاف بەم هەستە بەرزەی کوردایەتییەوە، بەم خەرمانە هەست و جۆش و گڕ و کڵپەوە ڕەوایی عەقڵ نییە کە ببێتە دوژمنی وڵاتەکەی، کە ئامادەبووە خۆی بکاتە قوربانی. بیرکردنەوەی ئەحمەد موختار جاف لە ئایندەی کوردستان و بڕوای بەهێزی بە کورردستانێکی گەشەکردووی ئازاد و سەربەست لە ناخی دەروونیدا جێگیر بوو‌بوو ڕیشەی دەواندی و هەستی بەزەیی بە حاڵی میللەتەکەی لە شعر و هەڵوێستیدا بە ئاشکرا ڕوونە. من لام وایە سەرەتای هەموو بزووتنەوەیەك و هەڵوێستێکی سیاسی لە بەزەییەوە دەست پێدەکات، ئینجا وەکو مادییەکان دەڵێن لە قۆناغی وشیاری (وعی) لێکدانەوەی بەرژەوەندی چینایەتی ڕەنگی مێژووینەی خۆی وەردەگرێت و ئەبێ بە بیروباوەڕ و ئایدیۆلۆجیا. ئەحمەد موختار جاف بەزەییەکەی لە بەزەیی پۆشکین و تۆلستۆی و گۆران و تەوفیق فیکرەت و میخائیل نەعیمە جیا ناکرێتەوە، چون ئەوانیش هەر لە نیگای بەزەیی بە خەڵکی زۆر لێکراوەوە لە ناحەقی و ستەم و زۆردارییەوە تووڕەبوون و بەگژ خراپەدا چوون. ئەحمەد موختار جاف بەزەییەکەی هەر لە دڵیدا نەماوەتەوە، تەنها هەر فرمێسك بۆ باری نەگونجاوی خەڵك و کوێرەوەری کوردەواری بڕێژێت، بەڵکو بەپێی مەنتیقی شۆڕشگێڕی مێژوویینەی ئەو قۆناغە هەستاوە لەگەڵ جەماوەرەکەدا، لەگەڵ دەستەی ئینتلیجنسیای نەتەوەکەیدا و بۆ بەدەنك و هاواری جەماوەرەوە چوون داویەتیە ئەوکێوە نەك بۆ قایمقامیەتی و پلە و پایە چوون، پلە و پایەکە خۆی لە خۆیدا ئەوەندە دڵخۆشکەرە نەبوو بەبێ دانە کێو و چەك بەکارهێنان فەراهەم ئەبوو زۆر بەئاسانی[١٥].

ئەوەی ئاشکرا و ڕوونە کە ئینگلیسەکان سیاسەتی قوتابخانەی (بومبەی)یان پێدە کرد و پشتیان کردە میللەتی کورد و کوردستانی باشووریان لکاندە دەوڵەتی

عێراقـی نوێـوە و ئـەم سیاسـەتەیان بـە زۆرەملـێ بەسـەر کـورددا سـەپاند، ئـەو کەسایەتییانەی کە لەو بڕوایەدا بوون، جەختیان لەسەر ئـەوە دەکـرد کـە ئینگلیـز دەوڵەتێك بـۆ کـورد دادەمـەزرێنێت تووشـی نائومێـدی و زیـزی و تـوڕەیی بـوون، ئەوەبوو ئەحمەد موختار جاف بزافێکی چەکداریی لە ناوچەی هەڵەبجە و سـازان و مـەرەخێوە دژ بـە دەوڵـەتی عێـراق بـەرپا کـرد و ڕۆژ بـەڕۆژ هێزەکـەی پـەرەی دەسـەند، خەڵکەکـە هەڵبەسـتیان لـە پەسـن و ستایـشیدا هەڵئەبەسـت، ئـەمیش نموونەیەکی ئەو هەڵبەستانەیە:

شازادەی دەوران ئەحمەد موختارەن

پەی ڕۆژی دەعوا ئەسفەندیارەن

هەر پەی ویش خاسەن چە ڕۆژی هەیجە

چەنی دوژمنان بکەر و هەیجە

دایم لە خەیاڵ حاڵی کوردانە

بۆیە ئەراکیل خاکی ئێرانەن

ئومێد ئیدەن وە لولەی تفەنگ

ئیستیقلالمان بگیر و وەچەنگ.

ئەحمەد موختار بۆ میللەتەکـەی و نیـشتمانەکە خـۆی کـردە کۆچـی قوربـانی ئـەوەبوو کاربەدەسـتانی دەوڵـەتی عێـراق کەوتنـە تەلاشـێکی سـەختەوە بـۆ لەنێوبردنی و لە سـاڵی ١٩٣٥دا لـە تەمـەنی ٣٨ سـاڵیدا لەسـەر ئـاوی سـیروان بـە دەسـتی یـەکێك لـە کرێگرتووەکـانی ڕژێمـی عێـراق بـە ڕەزامەنـدی ئینگلیـسەکان کوژرا. هەروەها کەریم بەگی فەتاح بەگی جافیش کە ببووە سـەرۆکی عێڵـی جـاف گەیشتبووە ئەو قەناعەتە کە ئینگلـیس هـیچ بـۆ کـورد ناکـەن و پـشتیان کردۆتـە میللەتی کورد، ئەوەبوو دەستی خستە نێو دەستی خوالێخۆشبوو شێخ مەحمودی نەمرەوە و لە شەڕی ئاوباریکدا لەگەڵ داود بەگی بـرای و محەمـەد و ئـەمین بـەگی

کورپیدا و چەکدارانی تیرەی سوفیوەند و گلاڵی و تەرخانی و ڕوغزادیش لەو شەڕەدا بەشدارییان کرد ولەم شەڕە خوێنینەدا لە شۆڕشگێڕانی کورد ٣٧ شەهید بوون هەڵبەت ژمارەی برینداڕەکان زیاتر بوون[١٦]، بەڵام ئەنجامی شەڕەکە بە سەرکەوتنی هێزی شۆڕشگێڕانی کورد کۆتایی هات.و لە چەکدارانی جافی گەرمیان مەجیدی مایەخان و محمەد ئەمین ئەلەپارە شەهید بوون و حسینە سوورکەی ڕۆغزادی بریندار بوو[١٧].

هەروەها دەبینین خوالێخۆشبوو عیزەت بەگی عوسسمان پاشا پاش ڕاپەڕینی ٦ی ئەیلولی ١٩٣٠ بە سەرۆکایەتەی شێخ مەحمود دەستێکی باڵای هەبووە لە هاندانی خەڵکدا دژی ئینگلیسەکان. پشتیوانیی ناوبراو لە شێخ مەحمود ئەبێتە هۆی ئەوەی کاربەدەستانی ئینگلیس بەهۆی دام و دەزگاکەیانەوە بیخەنە بەندیخانەوە، لەم نووسراوەدا ئەم ڕاسستییەمان بۆ دەردەکەوێت، کە خوالێخۆشبوو شێخ مەحمود زوو دەرکی بەوە کرد کە ئینگلیسەکان سیاسەتیان سەبارەت بە کورد گۆڕیوە و ڕێگەی چەکداریی هەڵبژارد و کەوتە شەڕێکی خوێنینەوە دژ بە ئینگلیسەکان و دەوڵەتی دەستنیشاندەی عێراق و ئەم شەڕ و شۆڕە تا ساڵی ١٩٣١ بەردەوام بووە، کە شەڕی ئاوباریك دوا شەڕی شێخ مەحمود دەدرێتە قەڵەم، بەڵام جافەکان تا سەرەتای سییەکان هەر بڕوایان بە ئینگلیسەکان مابوو کە شتێك بۆ کورد دەکەن، سیاسەتی شەڕی چەکداریی شێخ مەحمودیان بە قازانجی کورد نەدەزانی و بڕوایان بەوەبوو کە دەبێت لەڕێی گفتوگۆ و دانوستانەوە کێشەی ڕەوای کورد چارەسەر بکرێت بەڵام کە بەتەواوی بۆیان ڕوون بووەوە کە ئینگلیز و دەوڵەتی عێراق دان نانێن بە مافی کورددا وپشتیان لە میللەتی کورد کردووە کەوتنە هاوکاری لەگەڵ شێخ مەحموددا و شەڕی چەکدارییان گرتە بەر.

لە بەراووردکردنی بەرزکردنەوەی ئاڵای شۆڕش لەلایەن شێخەمەحمودی نەمرەوە ئەم پرسیارە خۆی دەنوێنێت.. ئایا لەو سەردەمەدا دەست دانە

چەك و ئاڵای شۆڕش بەرزکردنەوە کارێکی دروست بووە و لە قازانجی میللەتی کورد بووە..؟ یان وەك کارێکی پڕ لە سەهو هەڵە و تێنەگەیشتن لە باری ڕامیاری قۆناغەکە بووە؟ ئەم پرسیارە پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی تێر و تەسەلە کە لەوزەی ئەم نووسراوەدا نیە، بەڵام بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە بە بۆچوونی ئێمە ئەگەر مەسەلەی دوور لە سازش (مساومە) و (برایی) لە ڕووی بەرژەوەندی چارەنووسی نەتەوەکەمانەوە بەراوورد بکەین یان ببیخەینە دووتای تەرازووی سوودی نەتەوەکەمانەوە بەپێی ئەزموون و ڕووداوی واقیعی سیاسی ڕۆژگار کامیان بۆ ئەو سەردەمە و قۆناغە و ئەم سەردەمەی ئەمڕۆش بەلای مەسلە حەت و بەرژەوەندی و نەتەوەی کوردا ئەلەنگێ. من پێم وایە خوالێخۆشبوو شێخ مەحمود لەجیاتی ئەم درووشمەی: نامەوێ ژینی ئەسارەت بەسمە عومری گومرەهی

نایکەمە سەر خۆم بەدەستی موددەعی تاجی شەهی

قەد بە ئەمری دوژمنانم نامەوێ فەرماندەهی

کەمێ سازشی بەکاربهێنایە و بۆرە تاجێکی لەسەر کردبا تەنانەت قەڵەمڕەویی فەرمانڕەواییەکەشی بەرتەسك بووایە دەبوو قبوڵی کردبایە[18]. وەك زۆر لە نەتەوەکانی تر بنەڕتێکی سیاسیمانی بۆ دابین بکردایە. بۆبەڵگەیش ئەوەتا ئەمڕۆ ئەم واقیعە لەوەدا بەدیار دەکەوێ کە بە زمانی خۆمان هاوار دەکەین کوڕینە نەکەن ئەمجارە هەلەکە لەدەست خۆتان بدەن، سا بەڵکەم ئەمجارە نیشان بپێکین[19].

هۆی سەرەکی ئەم نووسراوە خزمەت بە مێژووی نوێی هاوچەرخی میللەتەکەمان و ڕوونکردنەوەی هەڵوێستی ڕاستەقینەی بنەماڵەی بەگزادەکانی جاف لە قۆناغی شەڕی یەکەمی جیهانیدا و سەردەمی داگیرکردنی کوردستان لەلایەن لەشکری ئینگلیزەوە و دووبارە خوێندنەوەی ڕاستی ئەو هەڵوێستە کە

پێویستی بە ڕوونکردنەوەیەکی ڕوون و ئاشکرایە لەلایەن مێژوونووسان و ڕۆشنبیرانی میللەتەکەمانەوە و تیشك خستنە سەر حەقیقەتی ململانێی هەندێ لە بەگزادەکانی جاف لەگەڵ شێخ مەحموددا و هۆی ڕاستەقینەی ئەو ململانێیە چی بووە، بەهیوام ئەم نووسراوە خزمەتێکی بە مێژووی میللەتەکەمان کردبێت.

---

[1] چونکە شەڕی یەکەمی جیهانی درێژەی خایاند میللەتی کورد هەموو جۆرە بەدبەخت و کوێرەوەرییەکی چەشت و نزیکەی سی هەزار گەنج و تەمەن ناوەندی کورد لەم شەڕە خوێناوییەدا

کوژران. بڕوانە: خلاصة تأريخ الكرد و كردستان من أقدم العصور التأريخية الى الآن، ج١، الطبعة الثانية، ١٩٦١، ص١٧٩.

[٢] یاداشتەکانی ڕەفیق حیلمی، بەرگی یەکەم، بەغدا، ١٩٥٦، ل٥٠- ٥١.

[٣] هەمان سەرچاوە، ل٦١.

[٤] جرجيس فتح الله: يقظة الكرد، تريخ سياسي ١٩٠٠- ١٩٢٥، أربيل ٢٠٠٢، ص٢٠٩.

[٥] جرجیس فەتحوڵا، وریابوونەوەی کورد، مێژووی سیاسی ١٩٠٠- ١٩٢٥، و. حەسەن جاف، بەشی یەکەم، هەولێر- ٢٠٠٩، ل٢٦١- ٢٦٢.

[٦] کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف، تەئریخی جاف، لێکۆڵینەوەی دکتۆر حەسەن جاف، بەغدا، ١٩٩٥، ل٩.

[٧] محمد امين زكي، مشاهير الكرد و كردستان، ج٢، بغداد، ١٩٤٠، ص١٨١.

[٨] كردستان في سنوات الحرب العالمية الأولى، ترجمة: محمد الملا عبدالكريم المدرس، ص٨٩- ٩٢.

[٩] کێشەی کورد، بەشی یەکەم، و. د. کاوس قەفقتان، بەغدا، ١٩٨٩، ل١١٨.

[١٠] ڕۆژنامەی ژیان، ساڵی ١٩٣٦ك.

[١١] د. حەسەن جاف، چمکێك لە ژیانی مەحمود پاشای جاف، گۆڤاری نەوشەفەق، ژمارە ٤٠، تەموزی ٢٠٠٦.

[١٢] دیوانی شێخ سەلام، ئومێد کاکەڕەش، سلێمانی، ١٩٩١، ل٣٦.

[١٣] ڕەفیق حیلمی، شعر و ئەدەبیاتی کوردی، بەشی یەکەم، بەغدا، ١٩٨٨، ل٦٨.

[١٤] عەلاء الدین سەجادی، مێژووی ئەدەبی کوردی، ل٥٠٨.

[١٥] بڕوانە: د. حەسەن جاف بەنازناوی حەسەن گەرمیانی، خوایە لە دۆستانم بمپارێزی دوژمانتم لەسەر خۆم، گۆڤاری مامۆستای کورد، ژمارە١٧- ١٨، سوید، بەهارو هاوینی ١٩٩٣ل . هەروەها بڕوانە: مسألة الضمير ترجمة: عادل گرمياني، بغداد، ١٩٨٩.

[١٦] د. کەمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد، بەرگی دووەم، ل٧٥- ٧٦.

[١٧] بڕوانە: د. حەسەن جاف، چەند تێبینییەك دەربارەی شەڕی ئاوباریك، ڕۆژنامەی العراق، ژمارە ٢٥ ڕێکەوتی ١٦/١/ ١٩٨٥.

[١٨] بڕوانە: وتاری د. حەسەن جاف، گرنگی شەڕی ئاوباریك لە شۆڕشەکانی شێخ مەحمودد، گۆڤاری مێژوو، ژمارە ٦، هەولێر، ٢٠٠٨، ل١٠٢- ١٠٤.

[١٩] د. حەسەن جاف، خوایە لە دۆستانم بمپارێزە، سەرچاوەی پێشوو، ل٨٠

# رۆڵی ئەڵمانیا لە جەنگی دووەمی جیهانی

( ١٩٣٩ -١٩٤٥ )

حسین شاکر شریف

دەروازە

پوختەیەکی مێژوویی ئەڵمانیا بەر لە جەنگ

دوای دۆڕانی ئەڵمانیا لە جەنگی یەکەمی جیهانی بارودۆخی سیاسی وڵات شڵەژابوو، چەندین شۆڕشی ناوخۆیی بەرپا بوو، داوای لابردنی ئیمپراتۆرییەتیان دەکرد لەگەڵ دامەزراندنی ڕژێمی کۆماریی نوێ، بۆیە قەیسەر (ولیەمی دووەم) هەوڵیدا هێز بەکاربهێنرێت بۆ دامرکاندنەوەی شۆڕشەکان، بەڵام سوپا ملکەچی جێبەجێکردنی ئەم داوایە نەبوو، بۆیە ناچار بوو وازی لە دەسەڵات هێنا[١].

لەنێو ئەم بارودۆخەدا لە کانوونی دووەمی (١٩١٩ز) کۆمەڵەی نیشتمانی پێکهێنرا بۆ دانانی دەستووری ئەڵمانی، ئەم کۆمەڵەیە کۆبوونەوەیەکی کاتی لە شاری فیمار بەست بۆ دانانی حکومەت، بەرلین لەو کاتەدا تووشی خۆپیشاندان بووبوو، حکومەت دامەزرا و بەناوی کۆماری فیمار ناسرا، یەکەم سەرۆکی ئەم حکومەتە(ابرت) بوو. دەستوور لە تەمموزی (١٩١٩ز) دەرکرا کە گشت دەسەڵاتەکان لەژێر دەستی ڕایخشتاخ یاخود پەرلەماندا بوو، پەرلەمانیش دەسەڵاتی ئیرادەی ئەو گەلە و سەرۆکی دەوڵەت لەڕێگەی هەڵبژاردن دادەنرێت بۆ ما وەی حەوت ساڵ، هەموو ئیسلاحیات لەژێر دەستیدایە[٢].

حکومەتی فیمار تووشی ناڕەزا یی ناوخۆیی بووەوە بەتایبەتی دوای بەستنی پەیمانی ئاشتی (ڤێرسای) لە (١٩١٩ز) لەگەڵ فەرەنسا، بەپێی بەندەکانی ئەم

پەیمانە غەرامەیەکی گران لەسەر ئەڵمانیا سەپا بە بڕی(١٢٢) ملیار مارك و جگەلە گەڕانەوەی ئالزاس و لۆرن بۆسەر خاکی فەرەنسا و چەندین ناوچەی تری لێ دابڕا، و سیستەمی سەربازی ئیجباری لێ قەدەغە کرا[٣].

ئەم حکومەتە تووشی کێشەی زۆری ئابووری بوو بەتایبەتی دوای ئەوەی سەرۆکی فەرەنسا (بوانکار) فشاری لەسەر ئەڵمانیا دەکرد بۆ زوو دانەوەی قەرەبووەکان کە لە ئاست ئەڵمانیادا نەبوو[٤].

دوای ئەوە ی ئەڵمانیا لە ساڵی (١٩٢٣ن) نەیتوانی قیستی غەرامەی جەنگی بدا بۆیە (بوانکار)ی سەرۆکی فەرەنسا هەوڵیدا ئەم قەرەبووە بەدەست بهێنێ و گوێ بەوە نەدا کەوا ئەڵمانیا لەو کاتەدا هەژارە، بۆیە لەبەرام بە ئەم قەرەبووە سوپای فەرنسی لە ساڵی (١٩٢٣ن) ناوچەی ڕۆهۆیان داگیر کرد کە ناوچەی پیشەسازی ئەڵمانیا بوو[٥].

لە پاش ئەم شکستە باری ژیانی خەڵك لە مێژووی ئەڵمانیا گەشتە ئاستێکی یەکجار سەخت وڕەش، تووشی هەژاری و نەداری و بێکاری و هەڵئاوسانی دراو، و دەرەنجامی ئیفلیجبوونی پیشەسازی و بازرگانی بوو، ملیۆنان ماركی ئەڵمان بەچەند دۆلارێکی ئەمریکی یان پاوەندی بریتانی دەگۆڕدرایەوە، ڕووداوی ناخۆش و بگرە کارەساتێکی دیکە ئەویش سەرهەڵدانی قەیرانی ئابووری جیهانی لە مانگی ئۆکتۆبەری ساڵی (١٩٢٩)دا بوو، کە لە ئەمریکا دەستی پێکرد، بە ڕۆژانی ڕەش ناوبانگی دەرکرد، ئەو قەیرانە باری خراپی ئەڵمانیای خراپتر کرد، چونکە لەگەڵ دابەزینی ئاستی بازاڕی جیهانی، ناردنە دەرەوەی بەرهەمە پیشە سازییەکانی ئەڵمانیا لە کەمی دابوو، لەهەمان کاتدا بەرهەمهێنانی کەرەستە پێویستییەکان ناوخۆش ڕۆژ بەڕۆژ کەم بۆوە[٦].

لەدوای وەرگرتنی پۆستی ڕاوێژکاری ئەڵمانیا لە ساڵی (١٩٢٣ن) لەلایەن (گۆستاف شترسمان) لەو ماوەیەدا بارودۆخی ئابووری و سیاسی ئەڵمانیا باشتر بوو، ئەم حکومەتە نوێیە بەسەرکردایەتی (شترسمان) چەندین هەوڵیدا بۆ باشتر بوونی

بارودۆخەکە، وەکو توانی نرخی مارکی ئەڵمانی بەرز بکاتەوە، و توانی فەرەنسا رازی بکات بۆ دەست هەڵگرتن لە هەرێمی رۆهر لە ساڵی (١٩٢٥) گەڕایەوە بۆ سەر خاکی ئەڵمانیا، هەروەها توانی ئەڵمانیا بباتە ناو کۆمەڵەی گەلان وەکو ئەندام، بەم شێوە ئەڵمانیا لە ماوەی (١٩٢٤– ١٩٢٩) توانی دووبارە هەیمەنەی خۆی بگەڕێنێتەوە[٧].

ئەڵمانیا لەمەڕ سیاسەتی دەرەوەی توانی لە ١٦ی نۆڤێمبەری (١٩٢٥)ز بەشداری رێکەوتننامەی لۆکار نۆ بکات، بەپێی ئەم رێکەوتننامەیە ئەڵمانیا دانینا بە سنووری نێوان خۆی و فەرەنسا و بەلجیکا و لەگەڵ هێرشنەکردنە سەر یەکتر، ئەم رێکەوتننامەیە تاکو (١٩٣٦ز) مایەوە[٨].

لەساڵی (١٩٢٩ز) راوێژکاری ئەڵمانی (شترسمان) کۆچی دوایی کرد، بەمەش سەردەمی ناخۆشی و کارەسات دێت، هەر لەو ماوەیەدا بەهۆی خراپبوونی ئابووری ئەمریکا، بۆیە ئەمریکا ویستی چارەسەری ئابووری خۆی بکات ئەویش لەرێگەی کشانەوەی دارایی خۆی لە ئەڵمانیا، ئەمەش بووە هۆی گەورەترین کارەسات بەرەو رووی دام و دەزگا داراییەکانی ئەڵمانیا، کە چەندین بانق داخران و کرێکارەکانیان دەرکران، بەهۆی کەمی بەرهەم هێنان لە گشت کارگەکان، ئەمەش بووە هۆی بڵاوبوونەوەی بێ کاری، کە ژمارەیان گەیشتە چەندین ملیۆن، دوای ئەوەی (براوننك) هاتە شوێن (شترسمان) لە ساڵی (١٩٣٠)، ویستی چاکسازی بکات، و چارەسەری کێشەکان بکات، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو لەبەر بە هێز ی بەرەی بەرهەڵستکارەکان، بۆیە ناچار بوو واز لە دەسەڵات بهێنێ لە ساڵی (١٩٣٢)، دواتر هەڵبژاردن کرا (هندنبرغ) سەرکەوت بووە سەرۆك حکومەت، پۆستی راوێژکاری دابە (فۆن بابن) کە سۆز ی بۆ نازی دەچوو، (هیتلەر) بووە جێگری راوێژکاری پاشان (هیتلەر) توانی بگاتە پۆستی سەرۆك حکومەت[٩].

(هیتلەر) لە ساڵی (١٨٨٩ز) لە شارێکی نەمسا لەدایك بوو، لەسەرەتادا سەرباز بوو لە ئیمپراتۆرییەتی ئەڵمانی لەسەرەتای بیستەکانی سەدەی پێشوودا پاشان بووە سەرۆکی پارتی نیشتمانی سۆشیالیستی کورتکراوەکەی (نازی)یە، ئەم پارتە لەسەر

ڕەگەزپەرستی و دژایەتی ڕەچەڵەك ی جولەکە و دژی کۆمێنیستی دامەزرابوو، ساڵی (١٩٣٣) بەو ژاوەژاو و هەڕەشە ببووە سەرۆك وەزیران، لە ساڵی (١٩٣٤) هەموو دەسەڵاتی ئەڵمانیا کەوتە ژێر دەستی، لە ساڵی (١٩٣٩) جەنگی دووەمی جیهانی هەڵگیرساند، لە ساڵی (١٩٤٥) خۆی و عاشقەکەی خۆیان کوشت[١٠].

ئەڵمانیا لە ساڵی ١٩٣٣ خۆکشانەوەی خۆی لە کۆنگرەی داماڵینی چەك و کۆمەڵەی گەلان ڕاگەیاند، هەروەها سیاسەتی فراوانخوازی جێبەجێ کرد لەماوەی (١٩٣٣– ١٩٣٩)، یەکەم کار کە ئەڵمانیای نازی لەدوای وەرگتنی دەسەڵات لەلایەن (هیتلەر) پێی هەستا ئەویش گرنگیدان بە هێز ی سەر بازی ئەڵمانی، (هیتلەر) یاسای زۆرەملێی سەربازی دەرکرد، بەمەش بووە هۆی ز یادبوونی سوپای ئەڵمانی و چەندین کارگەی گەورەی تایبەت بە پیشەسازی چەك دامەزرا بۆ دروستکردنی چەك و فڕۆکە و کە ل و پەلی سەربازی، بەمەش سوپای ئەڵمانی لەڕووی هێزی وشکانی و ئاسمانی و دەریایی تەشەنەی کرد[١١].

لەساڵی (١٩٣٤) ڕێکەوتننامەی ئاشتی لەنێوان ئەڵمانیا و پۆڵۆنیا مۆرکرا بۆ هێرش نەکردنە سەر یەك، (هیتلەر) لەساڵی (١٩٣٥) توانی ناوچەی ڕاین داگیر بکات لەو کاتەدا فەرەنسا لاواز بوو[١٢].

لە ساڵی (١٩٣٦ز) ئەڵمانیا ڕێکەوتننامەی لەگەڵ یابان بەست لە دژی شوعیەت، پاشان ئەڵمانیا لە ساڵی (١٩٣٧) هەمان ڕێکەوتننامەی لەگەڵ ئیتالیا بەست، دواتر هاوپەیمانی سێ قۆڵە بەسترا لەنێوان بەرلین و ڕۆما و تۆکیۆ بەناوی میحوەر، لە ١٢ی مارسی ١٩٣٨ دەستکرا بە لکاندنی نەمسا بە ئەڵمانیا، ئەمەش هێزەکانی ئەڵمانیا توانیان دەست بەسەر نەمسا بگرن و بیخەنە ژێر قەڵەمڕەوی ئەڵمانی[١٣].

(هیتلەر) هەوڵیدا ناوچەی سودیت کە سەر بە چیکۆسلۆڤاکیا بوو بلکێنێت بە ئەڵمانیاوە، ئەمەش بووە هۆی نارەزایی بەریتانیا و فەرەنسا، بەڵام (هیتلەر) سەرکەوت لەم هەوڵەی، لە کۆنفرانسی میونیخ ساڵی ١٩٣٨ بەسترا کە سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا و فەرەنسا بەشدارییان کرد، ڕازابیوون بەم هەوڵەی هیتلەر، دواتر

(هیتلەر) نەك ناوچەی سودیتی بەتەنها گرت، بەڵکو دەستی خستە سەر تەواوی چیکۆسلۆڤاکیا، پاشان ساڵی ١٩٣٩ دەستی بەسەر پۆلۆنیادا گرت، بەمەش جەنگی دووەمی جیهانی بەرپا بوو[١٤].

## بەشی یەکەم

## رۆڵی ئەڵمانیای نازی لە هەڵگیرسانی جەنگی دووەمی جیهانی

ئەڵمانیا لە جەنگی یەکەمی جیهانی شکستی هێنا کە پەیمانی ئاشتی ساڵی ١٩١٩ بەسەری سەپێنرا، هەرچەندە ئەڵمانیا رازی نەبوو بەم پەیمانە، چونکە چەندین ناوچەی لەدەستدا و چەك داماڵینیان کرد، بۆیە بارودۆخی سیاسی و ئابووری ئەڵمانیا تێکچوو، لەبەرئەمە ئەڵمانییەکان رازینەبوون بەم بارودۆخە، زۆر هەوڵیاندا بۆ گۆڕینی دەرەنجامی جەنگەکە و کار پێنەکردنی ئەم پەیمانە، کە لەو ماوەیە دا ئەڵمانیا لەرووی سیاسەتی نێو دەوڵەتی چەند کارێکی کرد کە رێگە خۆشکەر بوون بۆ هەڵگیرساندنی جەنگێکی نوێی جیهانی[١٥].

هیتلەر رۆڵی یەکەمی هەبوو لە بەرپابوونی جەنگی دووەمی جیهانی، و هەر ئەڵمانیاش بوو جەنگەکەی راگەیاند، هەرچەندە ئەڵمانیا یەکەم دەوڵەت نەبوو کە لەدوای بەڵێننامەی (لۆکارنۆ) دەست بە هێرشی دوژمنانە بکات، بەڵکو یابان بوو کە لە ساڵی ١٩٣١ هێرشی کردە سەر چین. یەکەم قونبەلەی سیاسی کە ئەڵمانیا بە رۆژئاوای دا ئەویش کشانەوەی ئەڵمانیا بوو لە ساڵی ١٩٣٣ لە کۆنگرە داماڵینی چەك و کۆنگرەی گەلان، پاشان هیتلەر دەستی کرد بە داگیرکردنی ناوچەی راین، ئەمەش دژی رێکەوتننامەی نێودەوڵەتی بوو[١٦].

هیتلەر لەدوای وەرگرتنی دەسەلات ئامانجی جێ بەجێکردنی یەکێتی ئەڵمانیا بوو، هەروەها کۆنترۆڵکردنی دەسەڵاتی ئەڵمانیا بەسەر ناوەراستی ئەورووپا و ئەو سەر رێگایەی کە بەرەو رۆژهەڵاتی ناوەراست دەروات، لە ساڵی ١٩٣٦ ئەڵمانیا و یابان رێکەوتننامەیەکی ستراتیژییان بەست لە دژی شوعییەت، دواتر هاوپەیمانی

لەگەڵ ئیتالیاش بەست، بەم شێوەیە بەرەی میحوەر دروست بوو کە لە بەرلین و ڕۆما و تۆکیۆ و ئیسپانیا و هەنگاریا پێکدەهات. بەرەی میحوەر مەترسی دروست دەکرد لەسەر وڵاتانی ئەوروپای ڕۆژئاوا بۆیە بەریتانیا هاوپەیمانی لەگەڵ فەرەنسا بەست، ئەم جۆرە هاوپەیمانیانە سەرەتایەك بوو بۆ دەست پێکردنی جەنگەکە[١٧].

هیتلەر دەستی کرد بە هێنانەدی ئامانجەکانی ئەویش یەکێتی ئەڵمانیا بوو، سەرەتا هەوڵیدا نەمسا بگەڕێنێتەوە بۆسەر یەکێتی ئەڵمانیا، ئەم هەوڵەی هاتەجێ لە ١٢ی مارسی ١٩٣٨ هێزی ئەڵمانی توانی دەست بەسەر نەمسادا بگرێت، نەمسا خرایە سەر یەکێتی ئەڵمانیا[١٨].

لەپاشان هیتلەر چاوی بڕیبووە سەر چیکۆسلۆڤاکیا، بۆ بەدەستهێنانی ناوچەی سودیت، توانی نەك تەنها ناوچەی سودیت بگرێت، بەڵکو چیکۆسلۆڤاکیاشی داگیرکرد، ئەمەش بووە هۆی ناڕەزایی فەرەنسا و ڕووسیا و بەریتانیا و ئەمریکا، بەڵام بێ هودە بوو[١٩]. هەموو جیهان وایان دەزانی هیتلەر بە وەرگرتنەوەی ئەو ناو چانەی لە جەنگی یەکەمی جیهانی لە ئەڵمانیا سەندرابوو دەوەستێت، بەڵام هیتلەر دوای دروستکردنی سوپای ڕایخی سێیەم یاخود ئیمپراتۆریەتی سێیەم، بە پاڵپشتی وەکالەی پیشەسازی قورس و سوود وەرگرتن لە گەنجانی شارەزا، لەپێناو ئەنجامدانی ئامێرێکی جەنگی زەبەلاح نەهێمن و نە جێگیر دەبوو، دوای دەست بەسەرداگرتنی چیکۆسلۆڤاکیا وڵاتانی ڕۆژئاوا بێدەنگ بوون، چونکە نە ئەوان و نە هیچ هێزێکی جیهانی نەیدەتوانی بەرامبەر ئەو ئامێرە جەنگیە زەبەلاحەی ئەڵمانیا بووەستێتەوە، هەریەکە لە بەریتانیا و فەرەنسا چەندین مستعمراتیان هەبوو، حەزیان لە جەنگی نوێ نەبوو، هەروەها ئەمەریکا و ڕوسیا خاوەن خاکێکی گەورە و سامان بوون، ئەوانیش ئارەزوویان لە بەرپابوو نی جەنگ نەدەکرد، تەنها هیتلەر نەبێ خەونی دەست بەسەرداگرتنی بەرهەمی سلاڤییەکانی دەبینی، هیتلەر بیری داگیرکردنی ڕێڕەوی پۆلۆنی و شاری دانتزیغی دەکردەوە، تا بگاتە پروسیای ڕۆهەڵاتی ئەڵمانیا، بۆیە بۆ ئەم مەبەستە هەوڵیدا، پاشان ناکۆکی لەنێوان ئەڵمانیا و

پۆلۆنیا دروست بوو، سەرەتا ویسترا بە ئاشتی کێشەکە چارەسەر بکرێت، بەڵام بێ سوود بوو[20].

هیتلەر بۆ جەنەراڵە گەورەکانی سوپای ئەڵمانی ڕاگەیاند پێویستە جەنگ بەرپا بکەین؛ بۆیە لە (سیانۆ ریبستروب)یان پرسی کە سەرکردەی گشتی سوپای ئەڵمانیا بوو، چیتان دەوێ ممر یان دانتزیغ؟ ووتی لەو دووە هیچمان ناوێ شەڕمان دەوێ. هیتلەر داوای لە (سیانۆ) کرد بۆ ماوەی چوار تا شەش هەفتە پۆڵەندا وێران بکات، بەم شێوەیە هێرشی یەکەمی جەنگی دووەمی جیهانی دەستی پێکرد، لەلایەن ئەڵمانیا لە ساڵی ١٩٣٩ بۆسەر پۆڵەندا، و دواتر فەرەنسا و بەریتانیا شەڕیان لە دژی ئەڵمانیا ڕاگەیاند[21].

تەوەری یەکەم

هێرشی ئەڵمانیای نازی بۆ سەر پۆڵەندا

هێزەکانی هیتلەر سەرلەبەیانی ١ی ئەیلولی ١٩٣٩ دەستیان کرد بە هێرش و فڕۆکە و تۆپەکانیان ئاسمانی پۆلۆنیایان پڕ کردەوە، جەنگ لە کاتێك بەرپا بوو کە پۆلۆنییەکان وایان دەزانی هیتلەر ئامادەیە بۆ دەرگاکردنەوەی گفتوگۆ سەرلەنوێ، بەڵام شمشێری سەرزەنشت پێشکەوت، جەنگ بەرپابوو بێ ئاگادارکردنەوەیەکی فەرمی و بێ هیچ ڕاگەیاندنێك، دوو ڕۆژ تێپەڕیبو بەسەر جەنگەکە زۆربەی فڕۆکە جەنگییەکانی پۆلۆنیا لەناوچوو، بە هەزارەها فڕۆکەی نازییەکان هێرشی کتوپڕیان دەکرد، بۆمبارانی خاڵی گرنگ بەتایبەتی فڕۆکەخانەکان و ناوچە سەربازییەکان بە هەزاران تۆپی گەورە و بچووك بۆمبارانیان دەکرد[22].

پێکهاتەی سوپای ئەڵمانیا لەم هێرشە بەم شێوەیە بوو: (٤٢) تیمی پیادە و ئامێرسازی لەگەڵ (١٦) تیمی یەدەگ، سوپای ئەڵمانی بەسەر پێنج بەش دابەشکرا، بەرەو دوو ئاراستە ڕۆیی، یەکەمیان بەرەو باکور بەسەرکردایەتی جەنەراڵ (فۆن بۆك) کە سوپاکەی لە سوپای سێ و چوار پێك دەهات، دووەم بەرەو باشوور بەسەرکردایەتی جەنەراڵ (فۆن ڕۆنشتید) کە پێکدەهات لە سوپای هەشت و دە و چواردە، ئەم بەرەیە سەرەکی بوو بۆ هێرشکردن. بەرامبەر بەمە سوپای پۆلۆنی لە (٣٠) تیمی پیادە و ئامێرسازی و لەگەڵ (١١) لیوا کە لە سوارە پێکدەهات، لەگەڵ دوو لیوا کە لە زرێپۆش پێکدەهات، ژمارەی فڕۆکەی جەنگی ئەڵمانی زیاتر لە هەزار پێکدەهات، بەڵام فڕۆکەی پۆلۆنی نزیکەی چوار سەد فڕۆکەی جەنگیی کۆن بوو، لە ٧ی ئەیلولی ١٩٣٩ هێزی ئەڵمانی توانی هێزی بەرگرییە سنوورییەکانی پۆلۆنیا بەتەواو بشکێنێت[٢٣].

لە ٣ی ئەیلولدا بەریتانیا بەسەرکردایەتی (تشمبرلن) لەبەردەمی ئەنجومەنی گشتی بەریتانیا جەنگی لە دژی ئەڵمانیا ڕاگەیاند، وەکو پەیمانێك کە بەریتانیا دابووی بە پۆلۆنیا، کە یارمەتی پۆلۆنیا بدات لە حاڵەتی مەترسیدا، دوای چەند کاتژمێرێك فەرەنساش شەڕی ڕاگەیاند لە دژی ئەڵمانیا، ئیمپراتۆرییەتی ئینگلیز هەموو پشتگیری لەندەنی کرد شەڕی ڕاگەیاند[٢٤].

لەگەڵ ئەوەش هەریەکە لە بەریتانیا و فەرەنسا شەڕیان لە دژی ئەڵمانیا ڕاگەیاند، بەڵام هەردووکیان هیچ هێزێکی سەربازییان لە دژی ئەڵمانیا بەرپا نەکرد، تەنها ئەوە نەبێت فەرەنسا هەستا بە بەهێزکردنی هێڵە بەرگرییە سنوورییەکانی[٢٥].

سەرکردەی فەرەنسی و بەریتانی وایان دەزانی کە پۆلۆنیا خۆڕاگر دەبێت، بەرامبەر بە هێرشی ئەڵمانیا، چەند مانگێکی پێدەچێ و هاوپەیمانە ڕۆژئاواییەکان وەکو پێویستییەك بەرەو سنوری ڕۆژئاوای ئەڵمانیا دێن، بەڵام ڕۆژە سەرەتاکانی جەنگی پۆلۆنیا هەموو گومانەکانی بە درۆخستەوە، کاتێك بینییان هێڵە بەرگرییە پۆلۆنییەکان زۆر بە ئاسانی تێکشکان، کە هەموو جیهان سەریان سوڕما، بینییان

گەلێك لە (٣٥) ملیۆن پێکدێت، کە بەو ئاسانییە تێکبشکێت، ئەوەی زیاتر سەرسامی دروست کرد ئەوەبوو ئەڵمانییەکان توانیان بگەنە حەشارگەکانی پایتەخت، دوای تەنها یەك هەفتە لە دەستپێکی هێرشەکەیان، دوای تێپەڕبوونی هەفتەی دووەم هەموو شتێك کۆتایی پێهات[٢٦].

لە ١٧ی ئەیلولدا هێزەکانی ڕووسیا هاتنە ناو سنووری پۆڵەندا کە پێشتر ڕێکەوتنێکی نهێنی لەگەڵ ئەڵمانیا مۆرکردبوو، لەسەر دابەشکردنی داهاتەکانی خاکی پۆڵەندا، گەیشتنە ئەو شوێنەی کە بۆی دانرابوو، هەرچەندە پۆڵەندییەکان هێشتا بەرگرییان دەکرد هەردوو بەرە، بەڵام دواتر تەسلیم بوون بە ئەڵمانیا لە ٢٨ی ئەیلولدا، بەم شێوەیە هەموو بەرگرییەکانی پۆڵەندا کۆتایی پێهات، داهاتێکی گەورەی پیشەسازی و کشتوکاڵی کەوتە ژێر دەستی ئەڵمانیا، ئەو ڕۆژەی کە وارشۆ شکستی هێنا لەبەردەم ئەڵمانیا، لە مۆسکۆ ڕێکەوتننامەیەك لەگەڵ ئەڵمانیا بەسترا لەسەر دیاریکردنی ناوچە داگیرکراوەکانی پۆڵەندا[٢٧].

بەم شێوەیە خاکی پۆڵەندا دابەشبوو، بەشی ئەڵمانیا ئەو ناوچانەی بەرکەوت کەنزیکەی (٢٢) ملیۆن خەڵکی تیا دەژیان، بەشی ڕوسیاش ئەو ناوچانەی وەرگرت کە (١٣) ملیۆن کەسی تیا دەژیا[٢٨].

## تەوەری دووەم

## هێرشی ئەڵمانیای نازی بۆسەر دانیمارك و نەرویج

هیتلەر دەستی کرد بە فراوانکردنی دەسەڵاتەکانی لە ئەوروپای ڕۆژئاوادا، پێویستی ئاماژە بەوە بکەین ئەڵمانیا پێویستی زۆر بە ئاسنی خام هەبوو، کە لە کانەکان سویدەوە دەردەکران، ئەڵمانیا ئەم مادەیەی دەهێنا بۆ بەرهەمە جەنگییەکانی لە ماوەی مانگەکانی زستاندا، تا کاتێکیش کە ڕێگاکانی دەریای بەلتیق دەیان بەست، وەك پێویستیشە بەریتانیا هەوڵبدا کە زۆر لە نەرویج بکات بۆ نەناردن و گواستنەوەی ئاسن بەرەو ئەڵمانیا، لەڕێی ئاوە هەرێمییەکانەوە، هەروەها

ڕێگا لە کەشتییە بازرگانییە ئەڵمانییەکان دابخات[٢٩].

دوای بەریتانیەکان توانیان کەشتیگەلی ئەڵمانی بەناوی (تمارك) لەناو فیورد لە نەرویج تێکبشکێنێت و (٣٠٠) دیلی بەریتانی تیابوو ڕزگار بکات، ئەم کردەوە سەربازییە زیاتر هیتلەری هاندا بۆ داگیرکردنی هەردوو وڵاتی دانیمارك و نەرویج[٣٠].

ڕۆژی ٨ی نیسانی ١٩٤٠هات و هیچ کام لە دانیشتوانی ئەم دوو دەوڵەتە نەیاندەزانی کە ئەمڕۆ ڕۆژی چارەنووسیانە، تاکو شەو داهات و فەرمانە نهێنییەکان بۆ تابووری پێنج دەرچوو بۆ کارکردن، لەکاتێکدا کەشتی ئەڵمانەکان بە چەکەوە لە شوێنی دیاریکراودا بوون لە بەندەرە دانیمارکییەکان هەتا کاتژمێر سفر هات و دەستکرا بە جێبەجێکردنی پلانە دارێژراوەکان زۆر بە وردی و بەخێرایی و چەند کاتژمێرێکی نەخایاند، هیتلەر دەستی بەسەر دانیمارك و شار و بەندەرەکانیدا گرت، پێش ئەوەی خەڵك لەو سەرسامییەیان دەرچن، ئەم پلانە لە ٩ی نیسانی ١٩٤٠جێبەجێکرا[٣١].

هەروەها سەبارەت بە نەرویجیش فڕۆکە ئەڵمانییەکان لە شەودا هەستان، بەڕەوانەکردنی سەرباز و چەکێکی زۆر بەرەو فڕۆکەخانەی ئۆسلۆ بۆ یارمەتیدانی تابوری پێنج لە دانیشتوانەکە و یارمەتیاندان بە گەیاندنی چەك و پێداویستی بۆیان، تاوەکو ڕۆژ بووەوە شارەکە چووە دەستی ئەڵمانیاوە، هەفتەیەکی نەخایاند ئەڵمانیا دەستی بەسەر بەشی هەرە گەوەی وڵاتی نەرویجدا گرت، کاتێك هاوپەیمانەکان هەستان بە ناردنی هەندێك لە کەشتی و سەربازەکانیان، بۆ یارمەتی نەرویج، و هێزەکانی لە بەندەری (نارفیك) دابەزاند، شەڕەکە بەرەو کۆتا یی دەچوو چونکە هیتلەر دوو ئەوەندەی هاوپەیمانەکان سەرباز و چەکی هێنابووە ئەم ناوچەیە، کە شەڕی بچووك لەم بەندەرەدا ڕوویدا[٣٢].

هەرچەندە لە سەرەتادا هاوپەیمانان هەستان بە چاندنی مین لە ئاوەکانی نەرویجدا بۆ کەشتییە ئەڵمانییەکان، بەڵام بە خێراییەکی سەرسوڕهێنەر ئەڵمانەکان هەموو بەرەنگارییەکی نەرویجییەکانیان لەناو برد، جگە لەوپەڕی باکور کە

هاوپەیمانەکان (ئینگلیز و فەرەنسییەکان) هێزی هاوپەیمانان لە بەندەرەکانی نارفیکی نەرویجی دابەزاندووە تەنها بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەڵمانەکان، بەڵام لە راستیدا هێزەکانی ئەڵمانی توانیان هێزەکانی هاوپەیمانی لە بەندەری نارفیك بە تەواوی لەناوبەرن، بەو هۆیەوە پاشای نەرویج (هاکون) لەگەڵ وەزیرەکان ڕوویان کردە دوورگەی بەریتانیا بۆ پێکهێنانی حکومەتێکی ئازاد[٣٣].

ئەم سەرکەوتنانەی ئەڵمانیا هێزە هاوپەیمانەکانی ناچار کرد بکشێنەوە لەم ناوچەیەدا، ئەم سەرکەوتنە خێرایەی کە هیتلەر لە نەرویج بەدەستی هێنا، بەم شێوەیە ئاسنی خامی بەدەست کەوت و لەگەڵ بەندەری نارفیك و چەندین بەندەری تر[٣٤].

بەشی دووەم

رۆڵی ئەڵمانیای نازی لە بەرفراوانکردنی بەرەکانی جەنگ

لە بەرواری ١٠ی ئایاری ١٩٤٠ئەڵمانیا دەستی کرد بە هێرشەکانی بۆسەر هۆڵەندا و بەلجیکا و لۆکسمبۆرگ، لەیەك کاتدا بێ ئەوەی شەڕ ڕابگەیەنێ، هەر لە سەرەتای شاڵاوەکانی توانی بۆماوەی چەند کاتژمێرێك دەست بەسەر لۆکسمبۆرگدا بگرێت[٣٥].

سوپای ئەڵمانی بۆ داگیرکردنی هۆڵەندا دەستی کرد بە کشانی بەرەو ڕووباری ئەلموز و کەناڵی ئەلبێرتیات بڕی و نویك سەنگەری (لیاج) کە بەهێز و تواناداربیەوە بەناوبانگ بوو، ئەڵمانییەکان جەنگێکی جەرگ بڕیان لە دژیان بە تەواوەتی ئەنجام دا، پلانەکانیان بایی ئەوەندە توند و بلیمەتانە دارێژرابوون سەرسامی خستە نێو هەموو چینەکانی خەڵکەوە، لەکاتێکدا سوپاکەیان سنوورەکانی دەبەزاند و پەرەشووتەکانیان لە فڕۆکەخانەی رۆتردام دابەزین و لەسەر پردەکان و خاڵە سەربازییە گرنگەکان، تا سوپای هۆڵەندا لەنێوان دوو ئاگردا مابۆوە ئاگری پەرەشووتەکان لە پشتیانەوە و ئاگری ئەو سوپایەی کە لە سنوورەکانەوە بەرەوڕوویان دەهات[٣٦].

هەرچەندە هۆڵەندییەکان بەرگرییەکی توندیان کرد لە شەڕەکان، تارادەیەك توانیان هەندێك فرۆکەخانە و شوێنی تر دووبارە دەست بەسەردا بگرنەوە، بەڵام ئەم خۆراگرییەی هۆڵەندییەکان تاسەر بەردەوام نەبوو لەبەردەم هێرشە خێراکانی ئەڵمانییەکان، بەتایبەتی دوای ئەوەی فرۆکەی جەنگی ئەڵمانییەکان لە رۆژی یازدە توانیان هێزی ئاسمانی هۆڵەندی وێران بکەن، کە هەموو فرۆکەکانی لەناوچوون تەنها (١٢) دانەیان مایەوە، یەکەی سەربازی ئەڵمانی بەردەوامبوو لە بەرەو پێشچوون لە رۆژی ١٢ ئەڵمانییەکان گەیشتنە باشووری رۆتردام، لە رۆژی (١٤) سەرکردایەتی باڵای ئەڵمانی ئاگادارکردنەوەیەکی بە هۆڵەندا دا، بۆ خۆبەدەستەوەدان، ئەگەر نا شاری رۆتردام و (اورترخت) بە هێزی ئاسمانی کاول دەکرێ، زۆر کات لەسەر ئەم ئاگاداکردنەوە نەچوو ئەڵمانییەکان دەستیان کرد بە هێرشی ئاسمانی کە ژمارەی فرۆکەکانی ئەڵمانی ٥٠ فرۆکە بوو، کە ئاسمانی رۆتردامی بۆمباران کرد، زیانێکی زۆری لێکەوتەوە[٣٧].

کاتی رۆژی ١٥ی ئایار سوپای هۆڵەندی بەتەواوی خۆی دا بەدەستەوە[٣٨]. لە هەمان بەرواری ١٠ی ئایار ١٩٤٠ ئەڵمانییەکان هێرشێکی کوشندەیان ئاراستەی بەلجیکا کرد، لەو کاتەدا پاشای بەلجیکا هانای بردە بەر هاوپەیمانان، بەم شێوە بەریتانیا و فەرەنسا هێزەکانی خۆیان ناردە بەلجیکا بۆ رزگارکردنی، بەڵام هێزی پۆڵاینی ئەڵمانی بەسەرکردایەتی جەنەراڵ (فۆن رونشتید) توانیان لە ١٤ی ئایار هێڵی بەرگری هاوپەیمانان تێکبشکێنێت، دواتر ئەڵمانییەکان ناوچەی نێوان نامور و سیدانیان بڕی، لە رووباری میز پەڕینەوە، بەنێو دارستانی ئەردن رۆیشتن، واچاوەڕواندەکرا لەلایەن هاوپەیمانەکان کەوا هیچ هێزێك نیە بتوانێت ناوچەی ئەردن ببڕێت، بەڵام ئەڵمانەکان توانیان، بەم شێوەیە هێزەکانی ئەڵمانی لە رۆژئاوا بەرەو (ئەمیان) رۆیشتن، لە باشووریش بەرو ریمس رۆیشتن، ئەڵمانییەکان چوونە ناو ئەمیان و ابڤیل لە ١٩ی ئایار، پاشان بەرەو کەنداوەکانی فەرەنسا چوون، لە ٢١ی ئایار گەیشتنە کەنارەکان، دواتر لە ٢٣ی ئایار بۆلون و کالۆنیان گرت، هێزی

فەرەنسی بەرامبەر شالاوی ئەڵمانییەکان پاشەکشەیان دەکرد[39].

لە ٢٧ی ئایار هێزەکانی بەلجیکی خۆیان دا بە دەستەوە، ئەم هێرشە خێرایەی ئەڵمانییەکان بووە هۆی ئەوەی هێزەکانی بریتانی و فەرەنسی و بەلجیکی گەمارۆ بدرێن، لە ناوچەیەکی تەسك کە زۆر گران بوو دەرچن لەم ناوچەیە، بەڵام هێزەکانی هاوپەیمانان توانیان ئەم هێزە گەمارۆدراوەیان کە ژمارەیان (٣٣٨) هەزار جەنگاوەر بوو، لە بەنداوی دنکرك بگوازنەوە بۆ بەریتانیا کە هەموو کەرەستە جەنگییەکانیان بە جێهێشت، هیتلەر هەڵەی کرد لە هێرشنەکردنی بۆسەر هاوپەیمانان لە دنکرك[40].

ئەڵمانییەکان بەرەو باشووری فەرەنسا هاتن، توانیان هێڵی بەرگی فەرەنسییەکان ببڕن، هێزە فەرەنسییەکان هەڵهاتن بەرەو دواوە، ئەڵمانییەکانیش بەردەوامبوون لە چوونە پێش بۆ ناو خاکی فەرنسا، بەبێ ئەوەی بەرگییەکی وا هەبێت ، حکومەتی فەرەنسی لەبەر ئەم بارودۆخە ناچار بوو لە ٨ی یۆنیۆ ١٩٤٠ پاریس بەجێبهێڵێت بەرەو تور رۆیشت، پاشان ئەوێشی بە جێهێشت، چووە بۆردۆ[41].

لە١٠ی حوزەیران ئیتالیا شەڕی ڕاگەیاند لە دژی فەرنساو بریتانیا و چووە ناو شەڕ، پێش ئەم ڕاگەیاندنە هیتلەر ئاگاداربوو بەوەی کە ئیتالیا دێتە ناو شەڕ، ئەڵمانییەکان لە ١٦ی حوزەیران چوونە ناو پاریس، حکومەتی فەرەنسی بەسەرکردایەتی (بول رینو) ئیستیقالەیدا لە ئێوارەی ئەو ڕۆژە، حکومەتی (مارشال بیتان) پێکهێنرا ئەم حکومەتە لە شەوی (١٦–١٧) حوزەیران داوای ئاشتبوونەوەی ئەکرد لەگەڵ ئەڵمانیا و ئیتالیا[42].

لە ٢٢ی حوزەیران نوێنەرانی فەرنسا لەگەڵ ئەڵمانی لە کمپین ئەو شوێنە هێڵی شەمەندەفەر بوو، پەیماننامەی ئاشتی یان ئاگربەستەکە بەسترا، کە پێشتر ئەڵمانیا دوای شکستیان لە جەنگ ی یەکەمی جیهانی لە هەمان ئەو شوێنەیا پەیماننامەی ئاشتی لە لایەن هاوپەیمانەکان بە سەری سەپێندرا[43].ئەڵمانییەکان کاتێك مەرجەکانی هێوربوونەوەیان لەگەڵ فەرەنسا قبوڵکرد، نیوەی خاکی فەرەنسا لە ژێر دەستی ئەڵمانەکان بوو، گرنگترین مەرجەکانی ئەم پەیماننامە ئاشتییە بەم شێوە بوو:

ئەڵمانییەکان بۆیان هەیە دەست بەسەر گشت ئەو زەوییە فەرەنسییانەدا بگرن کە کەوتۆتە باکوور و رۆژئاوا لەسەر ئەو هێڵەی کە لە جنێف دەست پێدەکات تا تور، وە لە باشووریش هەتا سنووری ئیسپانیا، سوپای ئەڵمانی دەست بەسەر هەموو بەنداوەکانی فەرەنسا دەگرن بۆ شەڕ کردن لەگەڵ ئنگلیز و شەڕەکانی دەریای ئەتلەس، هەروەها پێویستە لەسەر فەرەنسا چەك دامالین بکات، هەروەها دەبێت فەرەنسا گشت تێچوونەکانی ئەڵمانیا بداتەوە کە لە چەك سەرفی کردووە، وەك پارە و هتد، پێویستە کەشتییەکانی فەرەنسا چەك داملین بکر ێ، هەروەها گشت گیراوەکانی ئەڵمانیا لەلایەن فەرنسا ئازاد بکرێن و بەرامبەر بەمە دیلەکانی فەرەنسا هەر لەلایەن بەندیخانەکانی ئەڵمانیا بمێنێتەوە[٤٤].

لەدوای ئەم ئاگر بەستە ئەڵمانیا ڕایگەیاند کەوا هیچ مەبەستێکی نیە شەڕ ڕابگەیەنێ لە دژی بریتانیا و داوای ئاشتبوونەوەی نێوان هەردوو وڵاتی کرد[٤٥].

حکومەتی فەرەنسی پەیوەندی دیپلۆماسی لەگەڵ بریتانیا پچڕاند، بەڵام شەڕی لەدژی ڕانەگەیاند، بەم شێوە کۆتایی هات بە هاوپەیمانە کۆنەی نێوانیان[٤٦].

## تەوەری یەکەم

## شەڕی بریتانیا

سەرەڕای ئەوەی بریتانیا، بە تەنیا لە گۆڕەپان مایەوە بەرامبەر شاڵاوی ئەڵمانیا، بەریتانیا بڕیاری بەردەوامی شەڕی ڕاگەیاند[٤٧].

دوای شکستی فەرەنسا بۆماوەیەك کردەوە سەربازییەکانی ئەڵمانی وەستێنرا بە مەبەستی خۆ ئامادەکردن بۆ جەنگێکی گەورە ئەویش هێرشکردن بۆ سەر دوورگەی بەریتانیا[٤٨].

هیتلەر پلانی خۆی دارشت و ناوی لێنا (ئاوتاری) بەڵام جێبەجێکردنی ئەم پلانە بەم شێوەیە بوو کە دەبوو ئاسمان و دەریا سەرکردەی بارودۆخەکە بن، بڕیاردرا لەنا بەرنە بەر (لافتۆف) کە ئەو فرۆکە ئەڵمانیانەی کە غورنگ بەرێوەی دەبرد بۆ

لەناوبردنی فڕۆکەوانی بەریتانی و لاوازکردنی بەریتانیا پێش داگیرکردنی[٤٩].

لەسەرەتای مانگی ئابدا دەسەڵاتدارانی ئەڵمانیا شەڕی بەریتانیایان ڕاگەیاند، ئەم شەڕە ناسراوە بە هێرشی گەورەی ئاسمانی کە لە ٨ی ئاب دەستی پێکرد بەبێ پچڕان تاکو کۆتاییەکانی تشرینی دووەمی (١٩٤؟)[٥٠].

شەڕەکە بە سێ قۆناغ بەڕێوەچوو، لە قۆناغی یەکەمدا فڕۆکە ئەڵمانییەکان هێرشیان کردە سەر کەنارەکانی باشووری بەریتانیا و ناوچە دیاریکراوەکانی دوژمن، بەڵام لە قۆناغی دووەمدا ئامانجی ئەوەبوو کە سەرکردایەتی ئاسمانی و فڕۆکە و فڕۆکەخانەکان بپێکێ و کەشتیگەلی دەریایی ئینگلیز بەتەواوی لەناوبەرێ و ئاسمان پاك بکاتەوە لە بەدوورکەوتنی فڕۆکەکانی، ئەگەرچی لافتۆف نەیتوانی ئەم مەبەستانە ئەنجامبدات لەم دوو قۆناغەدا، ئەوە دەست بکات بە وێرانکردنی شارە گەورەکان و سەنتەرە پیشەسازییەکان، ئەم جۆرە قۆناغی سێیەمی شەڕەکەیە، فڕۆکەکانی بەریتانی توانیان کە ژمارەیان (١٤٧٥) فڕۆکە دەبوو خۆی ڕاگرێ بەرامبەر (٢٦٧٠) فڕۆکەی دوژمن، جگە لەوەش گەلی بەریتانی خۆی نەدایە دەست ترس و دڵەڕاوکێ[٥١].

ئەڵمانیا لە ٨ی ئاب هێرشی ئاسمانی دەستپێکرد بۆ سەر بەریتانیا، هێزی ئاسمانی ئەڵمانی بۆردومانی زۆر سەختی دەکردە سەر کاروانەکانی کەشتیگەلی بازرگانی بەریتانی و کەنارەکانی شارەکانی باشووری رۆژهەڵاتی ئینگلیز[٥٢].

فڕۆکە ئەڵمانییەکان کە دەکەوتنە خوارەوە دوو ئەوەندەی فڕۆکە ئینگلیزەکان زەرەرمەند دەبوون، لەڕاستیدا ڕووداوەکان لەلایەن هەردوو لایەن بەریتانی و ئەڵمانی زۆر قارەمانانە بوو، لەچەند ڕۆژی شەڕەکەدا بەسەر ئاسمانی بەریتانیاوە هەردوولا هەوڵ و کۆششێکی بێوێنەیان نواند لەپێناو بردنەوەی بارودۆخەکە و و لەو پێناوەشدا قوربانییەکی زۆریان دا، ئەڵمانەکان لەنێوان تەموز و تشرینی یەکەمدا لە ساڵی ١٩٤٠دا نزیکەی (١٧٣٣) فڕۆکەیان لە دەستدا، لە سەرەتای ئاب هەموو مۆڵەت و پشووەکانی ئەفسەر و سەربازانی سوپای ئەڵمانی ڕەت کرایەوە، لە سەرەتای ئابدا

ژمارەی ئەو کەشتیانەی کە ( هیتلەر) کۆیکردبوونەوە گەیشتە (٣٠٠٠) کەشتی لەنێوان گەورە و بچووك، کە لە بەندەرەکانی هۆڵەندا و بەلجیکا و فەرەنسا و ئەڵمانیا لەنگەرییان گرتبوو، چاوەڕێی فەرمانیان دەکرد بۆ گواستنەوەی سەربازی داگیرکەران لەڕێی دەریای (مانشەوە)، بەڵام لافتۆف نەیتوانی ئامانجەکانی بەدەستبهێنێ، چونکە فڕۆکەکانی ئینگلیز لەگەڵ ئەو هەموو زیانە گەورانەی پێی گەیەنرابوو، هێشتا توانای بەرەنگاری مابوو، بۆ هێرشکەران[٥٣].

لە ٦ی ئەیلول تا کۆتایی شەڕی بەریتانیا، ئەڵمانیا هێرشی ئاسمانی فراوانی دەکردە سەر شارەکانی بەریتانی و بەتایبەتی شاری لەندەن، ئەو هەموو بۆردومانە سەختانەی ئەڵمانیا دەیکردە سەر شارەکان بە مەبەستی ئەوەبوو خەڵکی شارەکانی بەرتانیا توشی بێئومێدی و توانای بەرەنگار بوونەوەیان نەمێنێ[٥٤].

سەرکردەی باڵای فڕۆکەوانی ئەڵمانی (غورنگ) نا ئەومێد بوو لە لەناوبردنی فڕۆکەی ئینگلیزەکان لە ئاسماندا، بۆیە دەستی کرد بە هەڵدانی بۆمبەکانی بۆ سەر لەندەن، بۆمبە سووتێنەرەکان و تەقەمەنییەکان بۆ سەر لەندەن تا ناوەڕاستی تشرینی دووەمی خایاند، لێرەوە هێرشە رۆژییەکان خرانە شەو، لە سەرەتای تشرینی دووەمەوە شەو بە شەو بۆمبە ئەڵمانییەکان بەسەر گەڕەکەکانی پایتەختدا دەکەوتنە خوارەوە، بەم شێوەیە لەندەن گیانی دەدا بەڵام لەڕاستیدا لەندەن نەیدەویست بمرێت، ئەگەرچی ڕاونەرە بەریتانیەکان ناتوانن بەرەنگاری بۆمبەکانی شەوانە بکەن، بەڵام لە تۆڵەسەندنەوەی ئەمەدا بۆمبهاوێژە ئینگلیزەکان پرۆسەیەکی گەورەیان لە ئەڵمانیا ئەنجام دەدا، ئەویش بۆردومانی شارەکانی بەرلین و دسلدۆف و بریم و چەندین شاری دیکەیان دەکرد، نازییەکانیش پەلاماری کارگە پیشەسازییە گەورەکانیان دەدا و بەندەرە گرنگەکان و شارەکانی بیرمینغهام و رۆشتوو و دۆڤەر و بلایون و هتد تۆپ باران دەکرد، شای کۆڤەنتری لە یەکێ لە هێرشە توندە هەرە گەورەکان کە لە ١٤ی تشرینی دووەمدا بوو وێرانکرا. لە ٢٦ی کانونی یەکەمدا بۆمبە سووتێنەرکان بەسەر لەندەن دابارین و (١٥٠٠) گرتێبەردانی لێ کەوتەوە، ئەمە

گەورەترین کارەسات بوو کە ئەو شارە ببینێت، (٢٠٠) هەزار تەن بۆمب بەسەر خاکی بەریتانیادا دابارین لەم شەڕەدا[٥٥].

لە ئەنجامی ئەم بۆردومانانەدا بووە هۆی کوژرانی (٢٣٠٠٠) لە خەڵکی مەدەنی بەریتانی و بریندابوونی زیاتر لەو ڕێژەیە، بەڵام گەلی بەریتانیا خۆڕاگربوون بەرامبەر بەم هێرشانە، بەریتانا بەردەوامبوو لەم شەڕە، گۆڕەپانی شەڕ و ململانێی نێوان بەریتانیا و ئەڵمانیا تەنیا شەڕی ئاسمانی نەبوو، تەنانەت لە دەریاکانیش پێکدادان لەنێوانیاندا هەبوو[٥٦]. زیانەکانی هاوپەیمانان دوو هێندەبوو لەپاش بەکارهێنانی ئەڵمانیا بۆ کەشتییە ژێر ئاوەکان لە کاتی شەڕەکاندا[٥٧].

هیتلەر هەوڵی دابەزینی سوپای وشکانی ئەڵمانی نەدا بۆ دا گیرکردنی بەریتانیا، چونکە سوپای ئەڵمانی ناتوانێت سەربکەوێت تاوەکو کۆنترۆڵی هێزی ئاسمانی نەکرێت لە لایەن ئەڵمانیاوە، هەرچەندە ئەڵمانیا هەوڵی زۆری دا بۆ دەست گرتن بەسەر هێزی ئاسمانی بۆ دابەزینی سوپاکەی لە بەریتانیا[٥٨].

بەڵام لە دواییدا بەهۆی ئەو زیانە گەورەیەی کەشتیگەلی دەریایی ئەڵمانی دووچاری بوو لە جەنگی نەرویجدا، ئەویش کەشتی جەنگی ئەڵمانی (بسمارك) بوو، کە جێگەی شانازییەکی گەورەی ئەڵمانەکان بوو کێشەکەی (٤٥) هەزار تەن بوو، کە لە ئایاری ١٩٤١ بەندەری نەرویجی بەجێهێشت، بە مەبەستی نوقمکردنی کەشتییە بازرگانییەکانی بەریتانیا لە ئەتلەنتیکی باشوور، بەڵام بەریتانییەکان بەمەیانزانی چەندین کەشتی ڕاونەری بەریتنانی بەدوایکەوتن بە مەبەستی نوقمکردنی کەشتی بسمارك، بەم شێوەیە لە ٢٧ی ئایار ئینگلیزەکان توانیان کۆتایی بە کەشتی بسمارك بهێنن و نوقمی ژێر ئاوی بکەن، بەم جۆرە کۆتایی بەیەکێ لە کەشتییەکی جەنگی هەرە زلی هێزی دەریای ئەڵمانی هات، بەو هۆیەوە هێزی دەریایی ئەڵمانی تووشی شکستێکی گەورە بوون، بۆیە هیتلەر وادەی هێرش و داگیرکارییەکەی دواخست بۆ تشرینی یەکەم، پاشان دووبارە دواخرایەوە بۆ بەهاری ١٩٤١، چاوەڕوانی کەش و هەوایەکی لەباری دەکرد، بۆ جاری سێیەم بڕیاری دواخستنی درا پاش ئەو هەڵمەتە

مێژوییە گەورەیەی کە کرایە سەر رووسیا، تاکو لە کۆتاییدا بۆ دواجار پلانی (ئاوتاتاری) خرایە ژێر گڵەوە[٥٩]. کاتێك هیتلەر شکستی هێنا لە شەڕی ئاسمانی لەگەڵ بەریتانیا لەو کاتەدا چەندین بزوتنەوەی بەرگری نیشتمانی لە دژی داگیرکەری نازی لە وڵاتانی هۆڵەندا و بەلجیکا و نەرویج سەریهەڵدا، ئەم شەڕە کاریگەری دروست کرد لەسەر هەستی گەلی ئەمریکی و (رۆزفلت) سەرۆکی ئەمریکا یارمەتی سەربازی زیاتری دا بە بەریتانیا[٦٠].

هۆکارەکانی رێگەگرتنی هیتلەر لە هەڵمەتکردنی بۆ سەر بەریتانیا دیارنییە و وەڵامەکەی بە شاراوەیی و بەنهێنی مایەوە، وا دەردەکەوێ هێرشکردنە سەر یەکێتی سۆڤییەت پلانێکی تایبەتی بۆ دارێژرابوو، لە دەشتەکانی رووسیا بەریتانیای رزگارکرد لە داگیرکەرانی ئەڵمانی[٦١].

### تەوەری دووەم

### جەنگ لە وڵاتانی بەلقان و ئەفریقا

سەرکردایەتی ئەڵمانی تووشی دڵەڕاوکێ بوون بەهۆی ئەو شکستانەی کە هێزەکانی ئیتالی لە بەرەکانی دەریای سپی ناوەڕاست و بەرەکانی رۆژهەڵات و یۆناندا تووشی ببوون بەرامبەر بە هێزەکانی هاوپەیمانان، بۆیە ئەڵمانیا بۆ رزگارکردنی هاوپەیمانەکەی لەم بارودۆخە دەستی کرد بە چەند کردەوەیەکی سەربازی لەم ناوچانەدا. لە بەری ئەفریقا (ئەرفین رۆمل) سەرکردایەتی هەموو هێزەکانی میحوەریان پێسپارد، ئەرکی هێرشکردن بوو بۆ سەر ئینگلیزەکان لە لیبیا تاکو میسر[٦٢].

ئەلمانیەکان خێرایان کرد لە ناردنی سوپا بۆ رزگارکردنی هاوپەیمانە شکاوەکەی لە ئەفریقادا، بۆیە سوپایەکی رێك و پێکیان نارد لە دوورگەی سقلییەوە بەرەو ئەفریقا[٦٣].

پاش دوو هە فتە لە گەیشتنی رۆمل بۆ ئەفریقا، لە ٣١ی ئازاردا رۆمل دەستی کرد بە هێرشێکی کت و پڕ لە دژی بەریتانییەکان، لە کاتێکی خێرادا ئینگلیزەکان پاشەکشەیان کرد، رۆمل توانی بەهۆی فرۆکەوانییە بەهێزەکەیەوە بیان کوتێت و گەمارۆیان بدات و بیانکات بە چەند بەشێکەوە، رۆمل لە دوو هەفتە زیاتری پێویست نەبوو بۆ پالنان بە دوژمنەکانییەوە تا سنوورەکانی میسر و دووبارە دەستی گرتەوە بەسەر لیبیادا، ئینگلیز و ئوسترالییەکان کشانەوە بۆ توبرق، و بەتەواوی دابڕان لە میسر، بەلام رۆمل شەپۆل بەشەپۆل هێزی هێرشبەرەی دەنارد و لە دژی ئەو قەلغانەی کە بریتی بوون لە ٢٣ هەزار پیاوی دوژمن، بەم شێوەیە بۆماوەی (٩) مانگ گەمارۆی توبرقی دا، بەلام ئەمجارە ئینگلیزەکان هێرشی پێچەوانەیان کردە سەر رۆمل بەبێ ئەوەی سەرکەوتووبن، بۆیە ئینگلیزەکان ئەمجارە جەنەرال (اوکلنك)یان هەلبژارد بۆ سەرکردایەتیکردنی هێزی بەریتانی و بۆئەوەی رۆمل ببەزێنێ و سەرکەوتن بەدەست بهێنێ لە برینی بەرەکەی بەرەو ئەسکەندەرییە و سوێس[٦٤].

لە نیسانی ١٩٤٠ رۆمل دووبارە هێرشێکی توندی کردە سەر توبرق و داوای لە سەرکردایەتی سوپای ئەلمانی کرد یارمەتی سەربازی بۆ بنێرێت بۆئەوەی پارێزگاری لە کەنالی سوێس بکات، بەلام یارمەتی سەربازی نەدرا چونکە لەو کاتەدا ئەلمانیا خۆیان بۆ شەڕی سۆڤییەت ئامادە کردبوو[٦٥].

هیتلەر هێزە سەربازییەکانی توند و بەهێز دەکرد، لە پایز و زستانی ١٩٤٠ دا، مەجەڕ و رۆمانیا و بولگاریای ناچارکرد کە ببنە ریزەکانی میحوەرەوە بۆ خۆ ئامادەکردن بۆ هێرشی داهاتوو، بۆ سەر یەکێتی سۆڤییەت، بەلام هیتلەر ناچاربوو پاش ئەو بارە خراپەی هێزەکانی مۆسۆلینی دووچاری بوون، کە بۆ رزگارکردنیان بەشداری بکات و ورەی میحوەر بەرز بکاتەوە لەلایەکەوە، و لەلایەکی تریشەوە

پارێزکاری لە باڵی هێزەکانی باشوور بکات پێش پەلاماردنانی سۆڤییەت. هیتلەر هەوڵیدا هەموو توانا و ڕێگا دیپلۆماتییەکان و ڕێگا ئابوورییەکان بۆ هێزە سەربازییەکەی تەرخان بکات بۆ شەڕی ڕووسیا، بۆئەوەی زوو بەسەر یۆناندا زاڵبێ دەستی کرد بە فریوودانی یوگسلافیا کە پەیوەندی بکات بە وڵاتانی میحوەرەوە و پەیمانیان بداتێ کە پارێزگای لە سنوورەکانی بکات، بەرامبەر بە یارمەتیدانی بەندەری سالۆنیکی یۆنانی پێ ببەخشێ، بۆیە سەرۆکی حکومەتی یوگسلافی ڕازیبوو، بەم شێوەیە پەیمانی سێ لایەنانەیان مۆرکرد لە ئازاری ١٩٤١ دا. دوو ڕۆژ بەسەر ئەم پەیمانە تێنەپەڕیبوو حکومەتی یوگسلافی بە کودەتایەکی سەربازی ڕوخا و پەیماننامەکە ڕەتکرایەوە، لە بەرامبەر ئەمەدا هیتلەر لە ١٦ی نیساندا پەلاماری یوگسلافیا و یۆنانی دا، کە (٦٥٠) هەزار سەرباز لە یەك کاتدا لە چوار بەرەوە پەلاماری یوگسلافیایاندا، ئەم سەربازانە سوپای یوگسلافیایان لاواز و پەرت کرد، بۆیە یوگسلافیا ناچار بوو لەدوای (١١) ڕۆژ خۆی بدات بە دەستەوە، هیتلەر سزایەکی توندی بۆ بەلگرادی پایتەختی یوگسلافیا ئامادە دەکرد، ئەویش بۆمبارانکردنی شارەکە بوو، لەئەنجامی ئەم هێرشانە (١٧) هەزار پیاو و ژن و منداڵ بوونە قوربانی[٦٦].

بەهەمان ڕێکەوت واتە لە ٦ی نیسانی ١٩٤١ سوپای ئەڵمانی هێرشی بردە سەر یۆنان، هێزەکانی یۆنان ناچار بوون پاشەکشێ بکەن لە تراقیای ڕۆژئاوا، هەرچەندە هێزەکانی بەریتانی و ئوسترالی و نیوزلەندی لەم وڵاتەدا دابەزیبوون، بۆ ڕزگارکردنی یۆنان، بەڵام نەیانتوانی خۆیان ڕابگرن بەرامبەر هێرشەکانی ئەڵمانی، بۆیە سوپای یۆنانی ناچار بوو لە ڕێکەوتی ١١ی نیساندا خۆیان بەدەستەوە بدەن[٦٧].

کەشتیگەلی بەریتانی توانی نزیکەی (٤٠) هەزار سەربازی بەریتانی و ئیمپریالییەکان ڕزگار بکات و بیانگوازێتەوە بۆ دورگەی کریت[٦٨]. لەگەڵ ئەمەشدا بۆمبە ئەڵمانییەکان توانیان (٢٨) کەشتی هاوپەیمانان نوقم بکەن[٦٩].

## تەوەرەی سێیەم

## هێرشی ئەڵمانی بۆ سەر دوورگەی کریت

جەنەراڵ (شتودنت)ی ئەڵمانی ئەرکی هێرشکردنی بۆ سەر دوورگەی کریت پێ سپێردرا، ئەم دوورگەیە هێزەکانی بەریتانی و یۆنانی و ئیمپریالی لێ بوو، لەگەڵ کەشتیگەلی دەریایی بەریتانی کە پارێزگاری لەم دوورگەیە دەکرد. لە سەرە تادا ئەڵمانەکان هێزی ئاسمانیان بەکارهێنا بۆ داگیرکردنی دوورگەکە، دوای هەفتەیەك لەو بۆردومانانەی کە فڕۆکە ئەڵمانییەکان ئەنجامیان دەدا، بۆ سەر دوورگەکە، توانیان زۆربەی فڕۆکە جەنگییەکانی بەریتانی وێران بکەن لەم دوورگەیەدا، لە دواتر (شتودنت) پەرەشووتەکانی لە نزیك فڕۆکەخانە سەرەکییەکان دابەزین، وەکو فڕۆکەخانەی مالیس و خانیا و کاندیا و هتد، لەو کاتەدا بەریتانییەکان زۆر بە توندی ڕووبەڕووی ئەم پەرەشووتانە بوونەوە و هەروەها کەشتی ئەدمیرال (کانغهام)ی بەریتانی پارێزگاری لە دەوروبەری کریت دەکرد، بەڵام ئەڵمانییەکان توانیان زۆر بە سەرکەوتووانە بە چەند قۆناغێك پەرەشووتەکانیان دابەزێنن و دەست بگرن بەسەر فڕۆکەخانەکاان، لەپاشان شتودنت دەستی بە هێرش کرد بۆ دەست گرتن بەسەر دوورگەکە، هەرچەندە بەریتانی و یۆنانییەکان بە تۆپەکانیان لەگەڵ پشتیوانی کەشتیگەلی دەریایی بەریتانی بەرگری زۆریان دەکرد، بەڵام ئەڵمانییەکان بەهۆی هێزی ئاسمانییەوە توانیان شکست بە هاوپەیمانەکان بهێنن، ئەم کردەوە سەربازییە بە بەخت دادەنرێت لە مێژووی سەربازیدا[٧٠].

ئینگلیزەکان ناچار بوون پاشەکشێ بکەن لە بەرەی باشووری ڕۆژئاواوە بۆ ئامادەبوون لە ڕووبەڕووبوونەوەی دانکرێکی سێهەم، لەنێوان ٢٨ی ئایار و ١ی حوزەیراندا، کەشتیگەلی دەریایی بەریتانی سەرکەوتنی بەدەستهێنا لە ڕاگوێزانی (١٦٥٠٠) سەرباز، بەدوای خۆیدا (١٣) هەزار کوژراو و بریندار و دیلی بەجێهێشت، بەم شێوەیە نازییەکان لەماوەی دوو مانگدا توانیان بە زیانێکی کەمەوە ببنە سەرکردەی یۆنان و یۆگسلافیا و زیانەکانیان لە (٢٥٠٠) کوژراو و (٩٠٠٠) بریندار و ون بوو ز یاتر

نەبوو، بەڵام سەرکەوتنیان لە دوورگەی کریت نرخێکی زیاتری هەبوو، لەو مێژووەوە توانیان زاڵبن بەسەر دەریای ئیجە و هەڕەشەش بکەن لە کەشتی کانگهام لە دەریای ناوەڕاستی ڕۆژهەڵاتدا و زۆر نزیك بوونەوە لە تورکیا و میسر و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست[٧١].

لەو ماوەیەدا هەموو بەشەکانی ڕۆژئاوای ئەوروپا و ناوەڕاست و وڵاتانی بەلقان لەژێر قەڵەمڕەوی ئەڵمانیادا بوون بە ڕاستەوخۆ یاخود وەکو لایەنگری ئەڵمانی[٧٢].

## بەش سێیەم

## هێرشی گەورەی ئەڵمانیا بۆ سەر یەکێتی سۆڤییەت

هیتلەر پێی وابوو ڕووسیای سپی و ئۆکرانیا گۆڕەپانێکە بۆ فراوانخوازییەکانی ئەڵمانی لە بەری ڕۆژهەڵاتدا، بۆ دەستگرتن بەسەر پیشەسازییەکانی ڕووس و لەگەڵ سوود وەرگرتن لە مادە ئاسنییەکانی، پێویستە لێدوانێکی بەهێز ئاراستەی یەکێتی سۆڤییەت بکرێت. لە بەرەبەیانی ڕۆژی ٢٢ی حوزەیرانی ١٩٤١ دا هێرشی ئەڵمانی بۆ سەر سۆڤیەت دەستی پێکرد، کە هەمان ڕۆژبوو کە ناپلیۆن بە سوپا گەورەکەی هێرشی کردە سەر ڕووسیا لە ساڵی ١٨١٢[٧٣].

هەشت هەزا ر پارچە تۆپی ئەڵمانی لە بەلتیق و دەریای ڕەشدا بەشێوەیەکی بەربڵاو کتوپڕ دەست دەکەن بە ئاگربارانکردن، ئەمەسەرەتای دەست بەکاربوونی پرۆسەی (باربرۆسە)یە، سێ ملیۆن پیاو لە بەرەبەیانی ئەو ڕۆژەدا چاوەڕێی کاتژمێری سفر بوون[٧٤].

سەرکردایەتی باڵای سوپای ئەڵمانی بەسەر سێ کۆمەڵەدا دابەشکرد، کۆمەڵەی یەکەم ئەو سوپا ئەڵمانییەی کە لەبەرەی باشووردا جێگیربوون بەسەرکردایەتی جەنەراڵ (فۆن ڕۆنشتد) دەبێ پەلاماری ئۆدیسا و کێف بدەن، تا ناوچەی دۆنیتز و

دوا پەلامارییان قەوقازە، کۆمەڵەی دووەم ئەو سوپایەی کە لە سەربازگەی بەرەی ناوەڕاست جێگیربوون بەسەرکردایەتی جەنەڕاڵ (فۆن بۆك) دەبێ مۆسکۆ داگیر بکات، کۆمەڵەی سێیەم ئەو سوپا ئەڵمانییەی کە لە سەربازگەی باکوور جێگیربوون بەسەرکردایەتی جەنەراڵ (فۆن لیب) دەبێ پەلاماری لینینگراد بدەن، سوپای ئەڵمانی لەبەرەی باشوور لەگەڵ سوپای ڕۆمانی یەکیان گرت لەژێر سەرکردایەتی (فۆن رونشتد)[٧٥].

سەبارەت بە ڕووسەکان ئەمە کارێکی کتوپڕ بوو کاتێ کە فرۆکەکانی لافتۆف تەنها لە یەکەم ڕۆژدا (١٢٠٠) فرۆکەی ڕووسی توانی لەناوبەرێت، کە زۆربەیان لەسەر زەوی ڕاگیرابوون، سوپای ئەڵمانی هەموو ڕۆژێك بەرەوپێش دەچوون، سوپاکەی فۆن لیب لە باکورەوە لە لینینگراد نزیکدەبووەوە لە باشووریش سوپای ڕۆمانی گەمارۆی شاری ئۆدیسایان دا، لە ١٦ی ئەیلول رۆنشتد توانی گەماۆی سوپاکەی جەنەراڵ بۆدیان بدات، بەڵام لە ناوەڕاستەوە فۆن بۆك بەرەو مۆسکۆ پێشدەکەوت، هێزە ئەڵمانییەکان لە ٢٢ی حوزەیران و سەرەتای تشرینی یەکەمدا توانیان دوو ملیۆن ڕووس بە چەکەکانیانەوە بە دیل بگرن، بەڵام لە هەمان کاتدا زیانەکاتی خۆیشیان زۆربوو گەیشتە (٨٠٠) هەزار کەس، لە سەرەتای ئازاری ١٩٤١ هیتلەر سەرکردەکانی ئاگادار کردبۆوە و پێی ڕاگەیاندبوون ئەم جەنگەی دەست پێدەکات بێبەزەیی دەبێ، بۆیە لە سەرەتادا بڕیاری مردنی بۆ هەموو برێکارە ڕووسەکان دەرکرد، جگەلە دیلە ڕووسەکان بەسەدان هەزاریان لەسەر خۆ دەمردن بەهۆی برسێتی و نەخۆشییەوە[٧٦].

لەبەرەی ناوەڕاست فۆن بۆك چەند ئەنجامێکی سەرسوڕهێنەری بەدەستهێنابوو، هێزەکەی دوو شەڕی گەورەیان بەڕێوەبردوبوو لەکاتی لە ناوبردنی بەرە فراوانەکەی هەردوو شاری مەنسك و سمۆلنسك، دوو لەسەر سێی ئەم دوورییەی بەرەو مۆسکۆ بڕیبوو لە ماوەی ١٨ ڕۆژدا، هیتلەر پەلەی گرتنی لینینگرادی هەبوو لەگەڵ بێبەشبوونی سۆڤییەت لە نەوتی قەوقاز، بۆ هێنانەدی ئەم ئامانجە هیتلەر فەرمانی دەرکرد بە جیاکردنەوەی چەند باڵێك لە سوپاکەی فۆن بۆك و پەیوەندیکردنیان بە

سوپای فۆن لیب لە باکور بۆ پەلاماردنی لینینگراد لەلایەکەوە، و هەروەها فەرمانیدا بە جیاکردنەوەی چەند باڵێکی دیکەی ئەم سوپایە و پەیوەندیکردنیان بەهێزی رونشتد لە باشوور بۆ توند کردنی گەمارۆی کیف، لە باکور هێزێکی ٣٠٠ هەزار سەربازی ئەڵمانی گەیشتە کەنارەکانی لینینگراد، دەستکرا بە گەمارۆدانی شارەکە کە بووە هۆی گیان لەدەستدانی ٩٠٠ هەزار مرۆڤ لە دانیشتوانی شارەکە، دواتر هیتلەر لە ٤ی ئەیلولدا فەرمانی لە ناوبردنی شارەکەیدا[٧٧].

لە کەرتی باشوور (فۆن رونشتد) توانی سوپای ئۆکرانی تێکبشکێنێ و کیف لە ١٩ی سێپتێمبەر داگیر بکات، پاشان ئۆدیسا و سارکۆفی داگیرکرد، بەرەو پێشچوو توانی لە ماوەی ٥ ڕۆژ نیمچە دوورگەی قرم ببڕێت و چەندین ناوچەی داگیر بکات تاکو گەیشتە ئاوی دۆنتز[٧٨].

هەڵبەتە مۆسکۆ ئامانجی سەرەکی سوپاکەی (فۆن بۆك) بوو لە ناوچەی ناوەڕاستدا، فەرمان دەرچوو بۆ پەلاماردنی مۆسکۆ، لەسەرەتای تشرینی یەکەمدا سوپای ئەڵمانی گەیشتە دەروازەکانی مۆسکۆ لە سێ بەرەوە بەیەکجار هێرشیان کردە سەر، هێرشەکە بە بەرەیەك دەستی پێکرد کە درێژییەکەی (٣٥٠ کلم) بە هێزێك کە ٥٢ تیمی سەربازی پێکهاتبوو وەك تیمی زرێپۆشەکانی ئەڵمانیا کە هۆس و گۆردییان سەرکردایەتیان دەکرد، بۆ گەمارۆدانی مۆسکۆ لەشێوەی گیرەیەك بوو، بەڵام جەنەراڵێ ڕووسی (جۆکۆف) ئەم هەوڵەی تێکشکاند، لە کاتێکدا گەلی ڕووسی خۆیان بۆ شەڕی پارتیزانی ساز دەدا، جۆکۆف هەوڵی دواخستنی ئەڵمانییەکانی دەدا، بەهیوای گەیشتنی فریاگوزارییەکانی لە سێبریاوە[٧٩].

لەماوەی ٢٠ ڕۆژی شەڕدا لەپێناو مۆسکۆدا ئەڵمانەکان زیانێکی زۆریان پێکەوت، گەیشتە زیاتر لە (٥٥٠٠٠) کوژراو و (٧٥٠) زرێپۆش و (١٧٥) تۆپ هاوێژیان لە دەستدا، بەهۆی ئەو بەرگرییە توندەی کە ڕووسەکان دەیان کرد، لە دژی هێرشی ئەڵمانییەکان[٨٠].

ئەوانەی کە مۆسکۆیان ڕزگارکرد لە سێبریاوە هاتن لاوانی بەهێز و دلاوەر بوون کە

ستالین چاوەڕێی گەیشتنیان بوو بۆ خۆ ئامادەکردنی هێرشێکی بەرامبەر، لەگەڵ سەرمای زستان بە سەدان هەزار سەربازی سیبریبیەکان گەیشتنە مۆسکۆ، لە ڕاستیدا سەرکردەی سوپاکانی ڕووسی توانیان هێزەکان لە بەرەکانی ئاسیا بگوازنەوە بۆ یارمەتی پایتەختەکە و هێرشێکی بەرفراوانی بەرامبەریان ساز دەدا، ئەڵمانەکان لەماوەی (٢١) مانگ سەرکەوتن لە ڕۆژئاوا تەنها (١٥٦٠٠٠) سەربازیان لەدەستدا، بەڵام لەماوەی حەوت مانك لە شەڕی سۆڤییەت یەك ملیۆن سەربازیان لەدەستدا[٨١].

بەهۆی هاتنی سەرما و بەفرێکی زۆرەوە بەستەڵەك دروست بوو بووە هۆی ئامێرەکان و زرێپۆش و تۆپهاوێژەکان و فڕۆکەکان ئەڵمانیا بەکەڵکی بەکار هێنانیان نەمێنێ، بەڵام هیتلەر دانی بەم ڕاستیە نەنا و سوور بوو لەسەر جێبەجێکردنی فەرمانەکانی، لەو کاتەدا گشت سەرکردەی بەرەکانی سوپا داوایان لە هیتلەر کرد پاشەکشە بە سوپای ئەڵمانی بکەن، بەڵام هیتلەر ڕازی نەبوو بە کشانەوەی سوپاکەی[٨٢].

بەهۆی سەرمای زستان (١٠٠٠٠٠) سەربازی ئەڵمانی سەرما لە ناوی بردن و ڕەقی کردنەوە، ڕووسەکان لەبەری ناوەڕاستەوە هێرشێکی بەرامبەریان لەدژی سوپای (فۆن بۆك) لە بەیانی ڕۆژی ٥ی کانونی یەکەم ئەنجامدا، پاڵیان بە ئەڵمانەکانەوە نا (١٥٠کلم) بەرەو دواوە بکشێنەوە و پایتەختی سۆڤییەت ڕزگار بکەن، هیتلەر دوای ئەوەی سەرکردەکانی سوپای گۆڕی بڕیاریدا خۆی ڕاستەوخۆ سەرکردایەتی سوپای ئەڵمانی بکات، دەبوایە هێزی ئەڵمانی لەگەڵ دوو جەنەراڵ شەڕ بکات لە یەك کاتدا، بەڵام بەهۆی سەرمای زستان هیتلەر دانینا بە تێکشکاندنەکەی. لە ٨ی کانونی دووەمی ساڵی ١٩٤٢ بڕیاریدا هەموو کارە سەربازییەکان ڕابگرێ، هەتا کۆتایی زستان. ساڵی ١٩٤٢ بە بای زوقم و بەفرەوە سەریهەڵدایە سەر سوپای ئەڵمانی و سێبریبیەکان لەبەرەی مۆسکۆ و لینینگراد هێرشیان دەهێنا و گەمارۆی سوپای ئەڵمانیان دەدا، بەڵام هیتلەر سووربوو لەسەر ڕای خۆی ئەویش گەمارۆدانەکەی پێ باشتربوو لە پاشەکشێ کردنی سوپاکەی، هاتنەوەی هاوینی ١٩٤٢ هیتلەر بێگومان بوو لەوەی

سوپاکەی لەو تەنگانەیە ڕزگاربیووە و ڕێگای سەرکەوتن دووبارە بۆیان کراوەتەوە، بەلام هیتلەر وایدەزانی هاتنە ناوەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکان بۆ ناو جەنگەکە هەموو ئومێدەکان بۆ سەرکەوتن لەناو دەبات، لەبەرئەوەی گرنگترین کاری ئەوەبێت کە بەهیچ شێوەیەك تێکنەشکێنرێت، ئەوەش نایەتە دی ئەگەر ئەلمانیا لەسەر بنکەیەکی ڕەقی ستراتیژی ئابووری نەوەستێت، سەرچاوەی هێزی خەونی هیتلەر قەوقازە، ئەگەر بتوانێ رووسەکان لە جەنگ فڕێبداتە دەرەوە و بێ بەشیان بکات لەو پترۆلەی قەوقاز ئینجا ناتوانن لە شەڕەکە بەردەوا م بن[٨٣].

هیتلەر پرۆسەی شینی دانا بۆ لەناو بردنی سوپای ڕووس لە باشوور لەگەڵ دەستگرتن بەسەر قەوقاز، پێش دەستبەکاربوونی ئەم پرۆسەیە سوپای ئەلمانی دوورگەی قرم و شاری سیباستۆبۆلیان گرت[٨٤].

بەپێی ئەم پلانە نوێیە کە سەرکردایەتی ئەلمانی دایڕشتبوو دەبوایە سوپای ئەلمانی لە بەرەی باشوور بەرەو پێش بچێت بەرەو دوو ئاراستە یەکێکیان بەرەو فولفا، و ئەویتریان بە ئاراستەی قەوقاز، بە مەبەستی پەرتکردنی یەکێتی سۆڤییەت بۆ دوو پارچە و دەستگرتن بەسەر نەوتی قەوقاز[٨٥].

لە ٢٨ی حوزەیرانی ١٩٤٢ بڕیاری دەستپێکردنی پرۆسەی شین درا، بەم شێوەیە هێرشی ئەلمانی دەستی پێکرد، لەسەرەتادا ڕووسەکان لە هیچ بەرەیەکدا خۆیان بۆ ڕانەدەگیرا. تا بەهاری ١٩٤٢ هات و پاشان ها وین و پایزی بەدوایاندا، لەم وەرزانەدا هێرش بۆ سەر قەوقاز شکستی هێنا و ستالینگراد کاول کرا، ، ئەلمانیەکان توانیان نۆ لەسەر دەی داگیر بکەن[٨٦]. دوای ئەوەی ئەمریکا شەڕی لە دژی یابان ڕاگەیاند، هەر یەکە لە ئیتالیا و ئەلمانیا شەڕیان لە دژی ئەمریکا ڕاگەیاند، چونکە یابان لە بەرەی میحوەر بوو، بەم شێوەیە جەنگەکە هەموو جیهانی گرتەوە[٨٧].

یەکێتی سۆڤییەت داوای لە ڕۆژئاوا کرد بەرەیەکی نوێ بکەنەوەبۆ سەرقاڵکردنی هێزەکانی ئەلمانیا، بۆیە هێزە هاوپەیمانەکان دەستیان بە هێرشی ئاسمانی کرد بۆ سەر پیشەسازییە گرنگەکانی ئەلمانیا بە کۆمەڵێك موشەك و بۆمب. لە ساڵی ١٩٤٢

هێرشی هاوپەیمانان زیاتر بوو بۆ سەر شارە گەورەکانی ڕایش و بەرلین و بریمەن و هامبۆرگ و...هتد[88].

سوپای ئەڵمانی لە ستالینگراد لەسەر خۆ بەرەو قوڵایی شارەکە دەڕۆیشت، بەڵام ئەم سوپایە خۆی لەبەردەم سوپایەکی زەبەلاحی ڕووسی بینییەوە و سەرمای زستانیش بەڕێوە بوو، ڕووسەکان سەرکەوتن لە گەمارۆدانی سوپای ئەڵمانی لە شارەکە، هەرچەندە هەوڵی زۆر درا بۆ هەڵگرتنی ئەم گەمارۆیە، و پاشەکشێ کردنی سوپای ئەڵمانی بەڵام بێ سوود بوو، ئەم گەمارۆیە بەردەوام بوو تاکو لە ئەنجامی ئەم گەمارۆیە، لە ٣١ی کانونی دووەمی ١٩٤٣ زۆربەیان خۆیان دا بە دەستەوە لەو سوپایەی کە لە سەرەتادا ژمارەیان (٣٠٠,٠٠٠) سەرباز دەبوو تەنها (١٠٠,٠٠٠) ما بوونەوە، بەدیلی کەوتە دەستی هێرش بەرەو ڕووسەکان، لە ئەنجامی ئەم شەڕە سەرەتای سەرکەوتنی زبەرەی هاوپەیمانان بوو[89].

ئەڵمانییەکان ناچار بوون پاشەکشێ بکەن لە قەوقاز و دۆنتز و فارکۆن، هێرشی ڕووسەکان لە هەموو بەرەکان دەستی پێکرد، لە تەموزی ١٩٤٣ ڕووسەکان سمولنسك و کیف یان ئازاد کرد[90].

### تەوەرەی یەکەم

### هێرشی هاوپەیمانان بۆ سەر هێزەکانی میحوەر لە باکوری ئەفریقا و ئیتالیا

لە هاوینی ١٩٤٢ سوپای ئەڵمانی توانی بچێتە ناو تـوبرق، دەست بەسەر بەشێکی زۆری زرێپۆشی بەریتانی و کەل و پەلی سەربازیدا بگرێت بەمەش دەروازەکانی قاهیرە و کەناڵی سوێس لەبەردەم سوپای ئەڵمانی کراوە بوو[91]. بۆیە بەریتانیا و ویلایەتە یەکگرتووەکان ڕێکەوتن لەسەر هێرشێکی گەورە بۆ سەر هێزەکانی میحوەر لە باکوری ئەفریقا[92].

لە شەوی ٢٣ی ئۆکتۆبەری ١٩٤٢ سوپای هەشتی بەریتانی بەسەرکردایەتی جەنەراڵ (مۆنتغمری) هێرشیان کردە سەر هێزەکانی (ڕۆمڵ) و توانیان زیانێکی گەورە

لە سوپای میحور بدەن لە شەڕی عەلەم ەین، و پاشەکشە بە سوپای میحوەر بکەن تاکو تونس. لە ٨ی نۆڤەمبەری ١٩٤٢ هێزەکانی ئەمریکی و بەریتانی لەژێر سەرکردایەتی جەنەراڵ (ئەیزنهاوەر) لە نزیك دارولبەیزا و وەهران و جەزائیر دابەزین و توانیان دەست بەسەر ئەم ناوچانەدا بگرن بەبێ بەرەنگارییەکی ئەوتۆ، رۆمڵ لە دووبەرە ڕووبەڕووی هێزەکانی دوژمن بووەوە و هەوڵیدا لە بەرامبەریاندا ڕابوەستێت[٩٣].

رۆمڵ هەستا بە دەستپێشخەری کردن، هێرشێکی کردە سەر فەرەنسییەکان، پاشان پەلاماری ئەمریکییەکانی دا و توانی زیانێکی گەورەیان پێ بگەیەنێ، لە دواتر رۆمڵ توانی هێڵەکانی هاوپەیمانان ببڕێ لە ڕێڕەوی قاسریندا، پاش ئەوەی هاوپەیمانان (٩٠ کم) پاشەکشێیان کردبوو دووبارە خۆیان ڕێکخستەوە و پەلاماری ئەڵمانییەکانیان دایەوە و گەڕاندنیانەوە شوێنی خۆیان[٩٤].

لە ٢٠ی ئازاردا سوپای هەشتی بەریتانی هێرشی کردە سەر هێڵی مارێت، توانی بیبڕێت، لە ٧ی نیساندا هێزە هاوپەیمانەکان توانیان پەیوەندی بکەنەوە بە یەکترەوە، لە ٥ی ئایاردا هێزە هاوپەیمانەکان هێرشێکی توندیان بەرپاکرد و لەئەنجامدا ئەمریکییەکان چوونە بیزرتەو سوپای بەریتانیش تونسیان گرت، دوای یەك هەفتە هەموو هێزەکانی میحوەر لە گۆڕەپانی شەڕدا خۆیان دا بەدەستەوە، ژمارەیان نزیکەی چارەگە ملیۆنێك سەرباز بوو، بەمەش شەڕ کۆتایی هات لە باکوری ئەفریقا ، رۆمڵ لەگەڵ هەندێك لە یاریدەرەکانی توانیان لە ڕێگەی ئاسمانەوە بە فڕۆکە ڕابکەن بۆ ئەڵمانیا[٩٥].

لەدوای سەرکەوتنی هێزەکانی هاوپەیمانان بەسەر میحوەر لە باکوری ئەفریقا، هاوپەیمانان بڕیاریاندا دەریای ناوەڕاست پاك بکەنەوە و هێرش بکەنە سەر ئیتالیا[٩٦]. کەشتییەکانی هاوپەیمانان سەرکەوتن لە پاك کردنەوەی دەریای ناوەڕاست لە هێزە دەریاییەکانی دوژمن[٩٧].

هاوپەیمانەکان لە ١٠ی تەموزی ١٩٤٣ لە سقلیە دابەزین، شەڕێکی توند لە نێوان هێزەکانی ئەمریکی و بەریتانی لەلایەك و هێزەکانی میحوەر لە لایەکی ترەوە ڕوویدا،

هاوپەیمانەکان زۆر بە خێرایی بەرەو پێشەوە دەچوون بۆ ناو دوورگەکە[98].

لە راستیدا هێزە ئەڵمانییەکان لەگەڵ کەمی ژمارەیاندا تونیان خۆ راگرین و بەرگرییان لە خاکەکە دەکرد، سوور بوون لەسەر رزگارکردنی زیاترین ژمارە لە هێزەکانیان لە سقلییەدا، ئەڵمانەکان تونیان (٦٠٠٠٠) سەرباز لە کۆی (٩٠٠٠٠) رزگار بکەن و بپەڕنەوە بۆ کەناری ئیتاڵی لە رێی دەربەندی (مسناوە)، لە ١٧ ئابدا شەرێك دەستی پێکرد هێزەکانی هاوپەیمانان توانیان بچنە ناو مسیناوە و سقلییە داگیر کرا، هاوپەیمانان (٣١٠٠٠) پیاو یان لەنێوان کوژرا و بریندار و وون بوو لە دەستدا، ئەڵمانەکانیش (٣٧٠٠٠) و ئیتالییەکانیش (١٣٠٠٠٠)[99].

لەگەڵ داگیرکردنی سقلیە کودەتا یەکی سەربازی لە ئیتالیا روویدا، سەرۆك مۆسۆلینی دەستی لەکار کشاندەوە و پاشان گرتیان و رەوانەی بەندیخانەیان کرد، حکومەتی (مارشال بادۆلیۆ) شوێنی گرتەوە، ئەم حکومەتە هەوڵیدا ئاگربەست لەگەڵ هاوپەیمانان بکات، بەمەش لە ٣ی ئەیلولدا ئاگربەستەکە مۆرکرا، یەکێك لە گرنگترین مەرجەکانی ئاگربەستەکە خۆبەدەستەوەدانی ئیتالیا بوو بە بێ هیچ مەرجێك، هێزی پیادەی ئیتالی شەڕی راگرت و هەموو کەشتی دەریایی و هێزی ئاسمانی ئیتالی درا بە هاوپەیمانان[100].

ئەڵمانەکان پاش چاوەڕوانی ئاگربەستەکە توانیان دەست بگرن بەسەر خاڵە ستراتیژییەکانی ئیتالیا وەکو رۆمای پایتەخت و دۆڵی (بۆی) پیشەسازییان داگیرکرد[101]. پێش راگەیاندنی ئاگر بەستەکە لە ٣ی ئەیلولی ١٩٤٣ هێزەکانی بەریتانی لە ریجیۆ دابەزین و دوای هەفتەیەك بەسەر ئەمە هێزەکانی ئەمریکی لە سالونۆی باشووری ناپۆلی دابەزین، لە دواتر هاوپەیمانان دەستیان بەسەر شارەکانی تارنتۆ و روبار و ناپۆلیدا گرت[102].

ئەڵمانەکان دەستیان بەسەر بەشێکی زۆری ئیتالیادا گرت، بەتایبەتی باکوری وڵاتەکە، لەنێو ئەم بارودۆخەدا حکومەتی (مارشال بادۆلیۆ) لەگەڵ ئەندامەکانی رایانکرد بۆ ناوەندەکانی هاوپەیمانان و شەڕیان لە دژی ئەڵمانیا راگەیاند[103].

ئەڵمانییەکان چەند گۆڕانکارییەکیان لە سەرکردایەتییەکانیان ئەنجامدا، رۆملّ لـە باکوری ئیتالیا بوو بانگ کرا بۆ فەرەنسا و و ئـەرکێکی گرنگیـان پـێ سـپارد ئـەویش ئەوەبوو دەبێ رێگـەری ئەتلـەنتیکی بـەجۆرێك لێ بکـات بـە هـیچ هێزێـك نـەبڕدرێت، بـەمجۆرە سـەرکردایەتی بـاڵای سـوپای ئـەڵمانی لـە ئیتالیـا بەگـشتی بـە جەنـەراڵ (کسلرنج) سپێدرا[١٠٤].

لە ٢٠ی جێنیوەری ١٩٤٤ هێزەکانی هاوپەیمانان لە رووباری جارلیـانۆ پەڕینـەوە، بەڵام سوپای ئەڵمانی بەسەرکردایە تی (کسلرنج) توانی بۆ ماوەی چـوار مـانگ خـۆی رابگرێت، بەرامبەر هاوپەیمانان لە هەرێمی چیایی لە نزیك کاسینۆ[١٠٥].

لـە ١١ی ئایـار هێرشـێکی گـشتی کـرا یـە سـەر دیدگاسـینۆ، توانیـان رێگـرە ئەڵمانەکان تێك بشکێنن، لە ٢٣ی هەمان مانگدا هاوپـەیمانان توانیـان هێڵـێ گۆسـتاف ببڕن، پاشان دواهەمین هێڵی بەرگری ئەڵمانەکانیان تێك شکاند کـە دەکەوێتـە پـێش رۆمـا، دواتـر هاوپـەیمانان روویـان کـردە شـاری رۆمـا ی پایتـەخت لـەو کاتـەدا ئەڵمانییەکان رایانگەیاندبوو کە شارێکی کرا وەیە و هیچ بەرەنگارییەکی تێدا ئـەنجام نادرێت، بۆیە هاوپەیمانان بەبێ هیچ زیانێك لە ٤ی حوزەیران چوونە ناو شارەکە[١٠٦].

شـارەکانی ئیتالیـا یـەك بـەدوای یـەك دەسـتیان بەسـەردا گـیرا لەلایـەن هاوپەیمانانەوە، شاری لجهۆرن و دواتر فلۆرەنسا و بینـرا و رافنـا داگیرکـران. لەگـەڵ هاتنی وەرزی زستان بەرەو پێشچوونی هاوپـەیمانان ڕاگـیرا، بـەڵام لـە ١٠ی ئـەبرێل ١٩٤٥ هێرشەکانیان دەستی پێکرد کە دوا قۆناغی شەڕ بوو لە ئیتالیا هاوپەیمانـەکان شاری بۆلۆنیا و و شاری جنوایان داگیرکرد، بەمەش سوپای ئـەڵمانی بـە یـەکجارەکی شکستی هێنا لە ئیتالیا، بۆیـە لـە ٢٩ی ئـەبریل ١٩٤٥ نوێنـەری کـسلرنج ئاگربەسـتی مۆرکرد لەگەڵ هاوپەیمانان، بەمەش سوپای ئەڵمانی خۆیاندا بەدەستەوە بـەبێ هـیچ مـەرجێك، دوای ئـەوە پەرەشـوتەکانی ئـەڵمانی توانیـان مۆسـۆلینی لـە بەندایخانـە رزگاربکەن، بەڵام دووبارە مۆسۆلینی کەوتەوە دەست یەکێك لە کەتیبەی بەرگریکارە ئیتالییەکان لە ٢٨ی ئەبریلی ١٩٤٥ مۆسۆلین گیرا و پاشان ئیعدامیان کرد[١٠٧].

### تەوەی دووەم

### هێرشی هاوپەیمانان لە هەموو بەرەکانەوە بۆ سەر هێزەکانی ئەڵمانی

خۆ ئامادەکردنی ئینگلیز و ئەمریکا دوو ساڵی خایاند بۆ پەلاماردانی قەڵای هیتلەری ئەوروپی، لەسەر دوورگەی بریتانیا دوو ملیۆن سەرباز چاوەڕێی کاتژمێر سفریان دەکرد بۆ پەلا ماردانی فەرەنسا[١٠٨].

لە ٦ی حوزەیرانی ١٩٤٤ هێزەکانی هاوپەیمانان لەسەر کەناری نۆرماندیا دابەزین و کۆنترۆڵی ئاسمانی و دەریاییان کرد[١٠٩].

کەشتییە جەنگییەکانی هاوپەیمانان بە بۆمب و موشەك ناوچەکانی سوپای ئەڵمانیان وێران کرد، کە بە نیازبوون پارێزگاری لە کەنارەکان بکەن، هەرچەندە سەربازە ئەڵمانەکان توانیان زیانێکی بەرچاو بە هاوپەیمانان بگەیەنن، بەڵام نەیانتوانی دەریان بکەنە دەریاکەوە کە لەوەوپێش هیتلەر جەنەراڵ (رونشتد)ی ڕاسپاردبوو کە هاوپەیمانان فڕێبداتەوە نێو دەر یاوە، لە یەکەم ڕۆژی هێرشەکەدا، نیوەی شەویشی بۆ دیاریکردبوو بۆ ئەنجامدانی ئەم پلانە، بەڵام کاتێك ڕونشتد شکستی هێنا هیتلەر فەرمانی بە هێزە چەکدارەکانیدا لە شوێنی خۆیان بمێننەوە و هێرش نەکەن و یەك هەنگاویش پاشەکشێ نەکەن لە هەمان کاتدا ڕایگەیاند کە بوونەتە خاوەن چەکێکی نوێ و ترسناك کە شەڕەکەی پێ دەبەنەوە ئەویش ئەو موشەکە باڵدارانەبوو کە لەسەر بنکەی خۆیان لەیەکێك لە دوورگەکانی بەلتیق ئامادە کرابوون، ئەم موشەکە ئەڵمانییەکان ناویان لێنابوو (F١) ئەم موشەکە بریتی بوو لە فڕۆکە بریتی بوو لە فڕۆکەیەکی بێ فڕۆکەوان دەیتوانی لە دووری (٤٠٠ کم) ئامانجی خۆی بپێکێ، ئەڵمانەکان ڕۆژی (١٠٠) دانەیان دەهاویشت کە لە ماوەی (٣) مانگی هاویندا (٢٤٠٠) دانەیان گەیشتە لەندەن، بەو هۆیەوە (٨٤١٦) کەس کوژران. لەسەرەتای ئەیلولدا نازییەکان موشەکی (F٢)یان داهێنا، ئەم موشەکە زۆر بەهێز بوو (١٣٠٠) موشەکیان هاویشتە بەریتانیا، بەم جۆرە قوربانی هەردوو موشەك (F١ و

F۲) گەیشتە (۳۵۰۰۰) کەس، هەورەها نازییەکان ئەم موشەکەیان گرتە ئەنفرس و بەلجیکا و لیاج لەپاش داگیرکردنی ئەم ناوچانە لەلایەن هاوپەیمانان زیانێکی زۆریان پێکەوت[۱۱۰].

ئەمریکییەکان توانیان لە ۲٦ی حوزەیران بێنە ناو شاری شربۆرخ و دواتر بەریتانییەکان شاری کاینیان داگیرکرد، هێزەکانی هاوپەیمانان بەردەوام بەرەوپێش دەچوون، و ئەلمانییەکانیش پاشەکشەیان دەکرد، شار لەدوای شار دەکەوتە ژێر دەستی هاوپەیمانەکان تا گەیشتنە نزیك پاریسی پایتەخت[۱۱۱].

هاوپەیمانان بە چەند میلێك لە پاریس دوور بوون، لەو کاتەدا بزوتنەوەی بەرگری فەرەنسی لە ناو شارەکە دەستیان بە شۆرش کرد، چەکیان لەدژی ئەلمانەکان هەلگرت، توانیان پاریس لە ۲٥ی ئابی ۱۹٤٥ ئازاد بکەن، هەر لەو کاتەدا هێزەکانی هاوپەیمانان لە رووباری سین و کەناری ریفیرای فەرەنسی دابەزین و مەبەستیان ئازادکردنی فەرەنسا بوو بەتەواوی و لەگەل گەمارۆدانی هێزەکانی ئەلمانیا لە باشووری فەرەنسا[۱۱۲].

هێزەکانی ئەمریکی و فەرەنسی توانیان (۸۰۰۰۰) دیلی ئەلمانی لەنێوان سەرباز و ئەفسەر دەستگیر بکەن[۱۱۳].

بەرگری ئەلمانییەکان زۆر لاواز بوو بۆیە شاری تۆلۆن و موسیلیا کەوتە دەست هاوپەیمانان، لە ۲ی ئەیلولدا لیۆن ئازاد کرا، لە نیوەی ئەو مانگەدا زۆربەی خاکی فەرەنسا ئازادکرا، هاوپەیمانان فشاریان خستە سەر هێزەکانی ئەلمانیا لە بەلجیکا و هۆلەندا، بەمەش هێزەکانی بەریتانی و کەنەدی توانیان دەست بەسەر ئەمیان و ئاراسدا بگرن و دواتر برۆکسل لە ۳ی ئەیلول ئازاد کرا ، لە رۆژی دواتر ئەنتۆرب ئازاد کرا، هێزەکانی هاوپەیمانان لە نیوەی مانگی ئەیلولدا گەیشتە ئەردەین و باشووی هۆلەندا کەوتە دەست ئینگلیزەکان، ئەمریکییەکان دەستیان بەسەر ستراسبرۆگ دا گرت، بەمەش هاوپەیمانان نزیك بوونەوە لە سنووری ئەلمانیا[۱۱٤].

لەو ماوەیەدا بەشی هەرە گەورەی بەرهەلستکارانی هیتلەر سەر بە چینی سوپا و

سەردارانی جەنگەکە بوون، کە هەستیان بە نزیکبوونەوەی کارەساتەکان کرد، دەستیان بە پیلانگێڕان کرد لە دژ هیتلەر وایان دەزانی دەتوانن ئەم شەڕانە رابگرن پاش لەناوبردنی هیتلەر و سەرکردە نازییەکان و پاشان ئاشت ببنەوە لەگەڵ هاوپەیمانان، پێش ٢٠ی تەموز زۆریان هەوڵیاندابوو بۆ کوشتنی هیتلەر و دوا پلانیان ئەوە بوو (شۆفنبرغ) لەهەوڵی سێیەمی دا بۆ کوشتنی هیتلەر لەکاتی کۆنگرەیەك لەمەڵبەندە تایبەتیەکەی هیتلەر لە (٢٠)ی تەمموز شۆفنبرغ نارنجۆکێکی لەژێر مێزگەردەگەدا لەنێو جانتایەکی بچووکدا لەژێر پێی هیتلەر دانا،بەڵام ئەفسەرێکی دیکە جانتاکەی هەڵگرتوو خستیە سەر مێزگردێکی دیکەی ژووری کۆنگرەکە ئەم مێزگەردە قورسە هیتلەری لە مردن رزگار کرد، دوا تەقینەوەی نارنجۆکەکە چوار ئەفسەر کوژران و هیتلەریش بە سوکی بریندار بوو، هیتلەر لەدوای ئەم پلانی کوشتنەدا دەستی کرد بە لەناوبردنی پیلانگێڕان، لە ئەنجامدا (٤٥٠٠) کەس لە سێدا رە دران، یەك لەمانە جەنەراڵ رۆمل بوو[١١٥].

ئەڵمانییەکان لەساڵی ١٩٤٤ لە شەڕەکاندا ڕووبەڕووی دوو بەرە دەبوونەوە، بەرەی رۆژ ئاوا و بەرەی ڕۆژهەڵات، لە بەرەی ڕۆژئاوا هێزەکانی هاو پەیمانان توانیان فەرەنسا و بەلجیکا و هۆڵەندا ڕزگار بکەن، لە بەرەی ڕۆژهەڵات ڕووسەکان هێرشیان دەکرد[١١٦].

ئەڵمانییەکان بە بەردەوامی پاشەکشێیان دەکردە هەموو شوێنەکان تا لە کۆتایی ساڵی ١٩٤٤ خاکی سۆڤییەت بەتاڵبوو لە هێزەکانی ئەڵمانی، لەو کاتەدا سوپای سوری ڕووسی دەستیان بە هێرشەکانیان کرد بۆ ناخی پۆڵەندا و ڕۆمانیا و بولغاریا[١١٧].

ئەڵمانیا لەدژی سووپای سوور گەورەترین بەشی هێزەکانی کە دەگەیشتە (٢٠٠) تیم، واتە زیاتر لە ملیۆن و نیو سەربازی خستبووە گەڕ، سوپای سوریش لە بەرامبەردا (٣٠٠) تیمی خستبووە شەڕەکەوە، ژمارەیان (٤) ملیۆن و نیو سەرباز دەبوو، یەکەم هێرشی ڕووسەکان لە دژی فینلەندییەکان بوو، لە ١٠ی حوزەیران

هێرشیان کردە سەریان ناچاریان کرد فینلەندییەکان ئاگربەست لەگەڵ ڕووسیا مۆربکەن و سوپای سوریش دەستی بەسەر بتسامۆدا گرت[118].

هێرشی ڕووسیا بۆسەر ڕووسیای سپی لە کۆتایی حوزەیرانی ١٩٤٤ دەستی پێکرد، توانیان دەست بەسەر منسکی پایتەختیدا بگرن[119].

هەر لە حوزەیرانی ١٩٤٤ ڕووسەکان هێرشیان کردە سەر پۆڵەندا شار لەدوای شار شاریان داگیرکرد، تاکو نزیك دەروازەکانی وارشۆ هاتن، لەناو شارەکە شۆڕش دەستی پێکرد لە دژی ئەڵمانییەکان بەڵام هێزەکانی ئەڵمانی توانیان شۆڕشەکە لەناو ببەن، لەلایەکی ترەوە سوپای ڕووسی بەرەو پێش چوو لە بەلتیق بۆ باکوری پۆڵەندا، توانی بگاتە سنووری پروسیای ڕۆژهەڵات، بەڵام ئەڵمانەکان توانیان خۆ ڕاگرین بەرامبەر ڕووسەکان، لە بە هاری ١٩٤٤ ڕووسەکان هێرشی نوێیان کردە سەر وڵاتانی بەلقان توانیان بچنە ناو خاکی ڕۆمانیا، لەدواتردا ڕۆمانییەکان ئاگر بەست یان لەگەڵ ڕووسەکان مۆرکرد و شەڕیان لە دژی هێزە ئەڵمانییەکان ڕاگەیاند، سوپای سور بەردەوام بوو لە هێرشەکانیان توانیان بچنە ناو خاکی بولغاریا و دەست بەسەر سۆفیادا بگرن، بولغارییەکان ناچار بوون ئاگربەست لەگەڵ ڕووسەکان مۆر بکەن و شەڕ لەدژی ئەڵمانیا ڕابگەیەنن[120].

سەبارەت بە یۆگسلافیا هێزەکانی بەرگری نیشتمانی ئەم وڵاتە توانیان زۆربەی خاکەکەیان ڕزگار بکەن تەنها چەند ناوچەیەك نەبێت لەژێر دەسەڵاتی ئەڵمانییەکان مابوو بۆیە یوگسلافیا ڕازیبوو بە وەرگرتنی یارمەتی لە ڕووسیا، بەمەش هێزەکانی ڕووسی و یوگسلاف و بۆلگاری بەیەکەوە بە هاوبەشی هێرشیان کردە سەر هێزەکانی ئەڵمانی توانیان هەموو خاکی یوگسلافیا ئازاد بکەن، لە ئەنجامی ئەم کردەووە سەربازییە هاوبەشەی کە لە یوگسلافیا کرایە سەر هێزەکان ئەڵمانیا بووە هۆی دروستبوونی مەترسی لەسەر هێزەکانی ئەڵمان لە یۆنان و ئەڵمانیادا، بۆیە سەرکردەی سەربازی ئەڵمانی بڕیاری پاشەکشێی دا لە کاتی کشانەوەی سوپای ئەڵمانی خەڵکی بولگاری و یوگسلاف زیانێکی زۆریان لە سوپای ئەڵمانیدا بەپێی

توانایان[121].

هەندێك لە هێزەكانی بەریتانی لە یۆنان دابەزین لە ساڵی ١٩٤٤، لەو كاتەدا هێزەكانی ئەڵمانی لە بارودۆخێكی زۆر خراپدا بوون، هێزەكانی بەریتانی بە پشتیوانی هێزە بەرگرییە یۆنانییەكان توانیان لە كۆتایی ١٩٤٤ یۆنان بە تەواوی ئازاد بكەن[122].

هەر لە ناو شەڕەكاندا كۆنگرەی (یالتا) بەسترا، كە لەنێوان رووسیا و ئەمریكا و بەریتانیا مۆركرا، بەپێی ئەم كۆنگرەیە رێكەوتنێكی یەكجارەكی لەسەر گرنگی خۆبەدەستەوەدانی رایش مۆركرا و ڕەتكردنەوەی هەموو گفتوگۆكان لەگەڵ تاوانبارە نازییەكان لە جەنگدا و لەسەر هێشتنەوەی یەكلایەنی ئەڵمانیا رێككەوتن[123].

هەنگاریا (مەجەڕ) كۆتا ویلات بوو لە ولاتانی ئەورووپای رۆژهەلات كەلەژێر داگیركەرە ئەڵمانییەكان مابوو، لەدوای رووخانی رۆمانیا رووسەكان سنووری هەنگاریایان بری، زۆر بەخێرایی گەیشتنە بۆدابێستی پایتەخت، بەلام ڕووبەڕووی بەرگری ئەڵمانی و مەجەڕی بوونەوە، لەدواتردا هەنگاریا ناچار بوو خۆی بدا بە دەستەوە و ئاگربەست مۆر بكات لە ٢٠ی كانوونی دووەمی ١٩٤٥، بەم شێوە ساڵی ١٩٤٥ كۆتایی نەهاتبوو ئەورووپای رۆژهەلات و یۆنان رزگاركران لەژێر دەسەلاتی داگیركەرە نازییەكان[124].

### تەوەرەی سێ یەم

### داگیركردنی بەرلین و ڕووخانی ئەڵمانیا

ئەڵمانیا كوتایی ١٩٤٤ بەرەو كارەسات دەڕۆیشت ئەمەش لە ئەنجامی پاشەكشێ كردنی هێزەكان ئەڵمانیا لەبەرامبەر هێرشەكانی هاوپەیمانان لە هەردەوو بەرەی رۆژئاوا و رۆژهەلاتدا، لەگەڵ گەمارۆدانی سنووری ئەڵمانیا و تێكچوونی بارودۆخی سیاسی ولات و نەمانی بەرهەمهێنانی كەرەستەی جەنگی و دابەزینی وورەی دانیشتوانی و زیادبوونی بەرهەڵستكاران لە دژی نازییەكان، ئەڵمانیا چەندین

هاوپەیمانان بەرەو دڵی ئەڵمانیا بەڕێکەوتن، شارە ئەڵمانییەکان لە ئەنجامی بۆردومانەکان بەرەو وێرانبوون دەچوون، بەرگرییە نوێیەکانی ئەڵمانی لە هەموو لایەك شکستی دەهێنا تا گەیشتە وارشۆ، دواتر چوونە ناو بۆدابست، بەردەوامبوون لە بەرەوپێشچوونیان، لە نیوەی نیساندا گەیشتنە ڤێنا[١٢٨].

هێزەکانی هاوپەیمانان بەرەو ڕووباری ئەڵب بەڕێکەوتن، لە هەمان کاتدا سوپای ڕووسی بەرەو ڕووباری ئۆدر دەکشان، ڕووسەکان زۆر بە خێرایی لە هەموو شوێنەکان پێش دەکەوتن، کە بە ئاراستەی بەرلین دەچوون، هێزەکانی بەریتانی گەیشتنە ئەڵب، ئەڵمانەکان دەستیان بە بەرگییەکی توند کرد لە شاری برمن، بەڵام دوای هەفتەیەك شارەکە لەلایەن بریتانییەکان داگیرکرا، لەو کاتەدا سەربازە ئەڵمانییەکان ورەیان لەدەست دابوو، هاوپەیمانەکان لە سێ هەفتەی مانگی نیساندا توانیان زیاتر لە (٣) ملیۆن سەربازی ئەڵمانی بەدیل بگرن[١٢٩].

نەمان و تێکشکانی رایش زۆر نزیك بوو، هیتلەر بێگومان بوو لە کۆتاییەکەی بۆیە سوور بوو لەسەر ئەوەی ئەڵمانیاش ڕاپێچی لەناوبردن بەرێت، چونکە ڕۆژێك ووتبووی ئەگەر جەنگمان دۆڕان دەبێ گەلیش لەناوبچێ، هیتلەر فەرمانی پەیڕەوکردنی سیاسەتی خاك سووتاویدا، بەڵام بۆ یەکەمجار سەرکردە سەربازییەکان ئەم کارەیان جێبەجێ نەکرد، لە نیساندا رایش لە هەموو جێیەکەوە هەڵوەشا، سوپای هاوپەیمانان گەیشتبوونە هێڵی ئەڵب، پاش دوو هەفتە سوپای سوری ڕووسیش گەیشتە سەریان، لەو کاتەدا جۆکۆف سەرکردەی سوپای ڕووسی لەپشت ئۆدەر هاتە دەرەوە، لە ٢٥ی نیساندا توانی گەمارۆی بەرلین بدات، هیتلەر لە حەشارگەکەیدا لەژێر تەلاری ڕاوێژکارانی رایش دابوو، هەوڵیدا شەڕێکی بەرگری توندی بێ سنوور ڕێکبخات[١٣٠].

هیتلەر لە دواین کاتژمێرەکانی ژیانیدا بە تەنها بوو تەنها هەندێك دار و دەستە و (ئیڤابراون)ی خۆشەویستی لەگەڵدا بوو، سەروەختێك کە فشاری هاوپەیمانان و ڕووسەکان پێکەوە بۆ بەرلین ڕووی لە توندبوون کرد هیتلەر ویستی (ئیڤا) ڕەوانەی دەرەوەی بەرلین بکات، بەڵام ئیڤا ڕازی نەبوو بۆ ئەم دواین چارەنووسەی بە تەنها بەجێبهێڵێت و بڕیاریدا تا کۆتایی لەگەڵیدا بمێنێتەوە، دواجار هەر بەو جۆرەشی

الصور، وينتقل ما بين الرؤية الحرفية للأشياء و الرؤية الماورائية، اذ يصبح التجسيد المادي مستنبطاً من الرؤية و الخيال و اشكاله.

ولعل الروحية المميزة للفنون الرافدينية كانت في اظهار الانسجام و التضاد في رمزية الأعمال بروحيتها وفكرتها، وحتى في مادتها احياناً و بشكلها. وكمثال للتناقض القيثارة الذهبية، فقد اصممت بمهارة فائقة لخلق رمز فريد، فذلك الثور الذي نمت له لحية و والذي يتقدم القيثارة تبعث للتساؤل، أهو تجريد لتشخيص ما؟ أم لهذا الثور لحية ولماذا؟ لم تأخذ القيثارة رأس الثور؟ وما هو ذلك الترميز المطلق الابعاد الدقيق التأثير؟

الاجابة على تلك الاسئلة تكمن في استخدام رموز الايصال مفاهيم معينة، فالثور الذي يعرف بعلاقته المتفردة بالبشر في كونه قوة، وذكورة، و خصب، و اللحية هنا اقتنراناً تشبيهياً بالبشر، فربما هذا التراكب على القيثارة لايمكن الا ان يكون جزء من طقس يخص الذكورة، وان وجودها كان ايحائياً رمزياً.

ان ما يمكن ان يؤديه الرمز يكون اكثر بلاغة من التعبير الشكلي المباشر، وحين نحتاج الى العدد الهائل في الاضافات في شكل واحد، قد لايستوعبها العمل الفني، نبحث عن الرمز في تلك الأفعال التي تخدم وظائف الابلاغ وتؤدي الرسالة، ربما يحمل الشكل عدداً من الرموز في وقت واحد و يكون للرمز عدد من الدلالات. يأخذ الرمز مكانته الهائلة في تمثيله للآلهة، فهو يستنبط الرؤية و الخيال في ايجاد بدائل تجسد كل صفات الألهة و أفعالهم، ولكون الآلهة غير مرئية يبدأ البحث في الرمز عن تحديد صفاتها التي تتعدى التشخيضص او الصفة الواحدة، وقد يكون التنافر سبباً لخلق رمز مميز وجديد مثل التنوع في التمثيل الرمزي. الرمز الانثوي و الذكري قد يهيمن احدهما على الآخر ولكن لاينفرد بذاته او يعمل على اقصاءه، فالرمز الانثوية تقابل الرمز الذكرية، فالالهة عشتار تقابل جلجامش حتى تحقق الفعل المرمز.

يرى ماتيس "ان الشاعر او الفنان يمتلك ضوءاً داخلياً يحول الاشياء من اجل

ان يجعل منها عالماً جديداً نابضاً منظماً، عالماً حياً هو بذاته اشارة سماوية لاتقبل الخطأ، و اظهار علاقة خصوصية بين الكائن الحي و بنيته".

ولما كان الثور صلباً قوياً مقاتلاً وحيواناً ذكرياً خصباً استعيرت صفاته لتطلق على الفحولة و القوة. وهو ديموزي الثور الوحش رمزاً للخصب في ملحمة جلجامش، واستعيرت قرونه للسمو النوعي و بالتالي تمييزاً للألهة. وصراع مع صائر المركب الذي كان رمزاً للغيمة الممطرة الراعدة، بدأ بالظهور بشكل غيمة سابحة في الفضاء ثم تطور الى طائر ناشر جناحيه، وله رأس أسد تعبيراً عن الزائر الذي يمثل (الرعد) ثم هذا الطائر بهيئه انسان نصفه الاسفل له ريش ثم اصبح الطائر رمزاً له. انه استعارة صفات القوة في الحيوان لتطلق على الالهة لتمنح الظواهر و التفسيرات رموزاً للحقائق ثابتة، وقد كانت الاستعارة الحيوانية المباشرة او المركبة هي مهيمنة في العراق القديم.

ترتبط بنية الفنون التشكيلية في العراق القديم باللاوعي. "فالرمز جزء من اللاوعي الكامن في تركيب البنى، فمثلاً توصف الشجرة بانها رمز للذكورة في التحليل النفسي البنيوي، وعندما يتحدثون عن الاشجار يقصدون الذكورة، ولو انهم لايدركون ذلك"[٥].

ليس كل تكوين فني يعتمد في تفسيره وقراءته على شكله الخارجي، بل قيمته و ماتقدنه في النهاية وظيفته. ويكون قيمة التكوين البنائي في قيمة الاستعارات و العلاقات البنائية الشكلية. ان الرمز يمكن قراءته من زاوية المضمون و الوظيفة، فالتحويل الرمزي لعناصر الواقع الى مفاهيم هي اكتمال قدرة الفكر، لأن الفكر ليس مجرد انعكاس للواقع، ان الفن انعكاس مفهومي لذلك الواقع، والذي يتخذ الرمز اداة تبرر أهداف الشكل الفني الايصالية.

ان الاشكال و تعبيراتها تتغير وفقاً للتحولات السريعة المفاجئة و تأخذ صفاتها الجديدة المتداخلة مع ذلك التحول و الحدث وقد تحمل الاشكال البشرية كانت ام

حيوانية تعبيرات او أفكار تعبر عن مساحة من الدلالات و الرموز، قد تكون اكبر من تلك الشخصية المتشكلة فنياً. يرتبط التعبير بالرمز، فالتعبير ليس تجيل للحدث فحسب وانما يتداخل بالحدث الرمزي شكلاً و فعلاً. فالرمز الفني التعبيري يلتقط في شبكة من العلاقات الطبيعية و الفكرية ما يجسدها و يبرز تعبيراتها.. ويكون للرمز الفني دلالة معنوية ينطوي عليها شكلاً ومعناً، ضمنياً يكمن في صميم بنائه، ويتشاكل الرمز في اسسه الاولى مقارباً للتصور النهائي للاشكال، وبازدياد الرمزية في التشبيه تحمل التشكيلات صفات تشاكليه، في التعبير الرمزي و الشكلي المتقادم. فالطائر برأس اسد رمزاً مطاطاً مطوعاً في التمثيل البصري و الفني، وكان رمزاً مهماً استعار الصفات الاكثر قوةً وخطاً في ايجاد معادلات القوة و البأس و السيطرة، وكانت الاجنحة جزءاً مهماً استمر في الاستعارة و التشكيل ووظف في عدد من الاحداث الرمزية و الاسطورية في الفكر الرافديني القديم، فقد مثل الطائر شرساً احياناً و مسالماً احياناً اخرى.

لقد مهر الأشوريون في الصناعات العاجية فكانوا يزخرفون الاثاث بالزخارف من العاج منحوتة نحتاً دقيقاً متقناً، وعثر في النرود على مجموعة من التحف العاجية ذات زخارف و رسوم فينقية. ومن التحف العاجية الرائعة التي ساعدت الحفائر العلمية المنظمة على كشفها و حفظها منحوتة من العاج تمثل حبشياً تفترسه لبوة كما تذكره جميع المصادر التأريخية وهذه المنحوتة هي موضوع بحثنا هذا.

وصف وتحليل القطعة العاجية مثار البحث :

ان الفنان الرافديني يمتاز بقوة ملاحظته ودراسته للأشياء التي يرمي ان يجسدها كعمل فني. يبدو ذلك واضحاً في الشكل النحتي للشخص الزنجي و الانثى الاسد في هذه القطعة. و الفنان الرافديني يهتم و يمتاز بدراسة الخصائص الذاتية للحيوانات التي ينفذها كعمل فني و يهتم بتوضيح الانفعالات المختلفة المنطبعة على وجوهها كما في موضوع جدارية صيد الاسود التي نشاهد فيها الملك (اشورناصر

بال) مستقلاً عربته في موقع الصيد يلتفت الى الخلف بشجاعة ليصوب سهماً آخر على الاسد الذي اصابته السهام فيحاول مهاجمة العربة الملكية، وتدل هذه على ملاحظة الفنان الدقيقة للحيوان و دراسته له، حيث يبدو ذلك واضحاً في تعبير الشراسة الموجودة على وجه الاسد الجريح، بينما يبدو الخنوع على الاسد الذي اصابت سهام الملك منه مقتلاً، كما يلاحظ تسجيل انفعال خوف الجياد من الاسود في حركة الاذن المضمومة على الرأس. هنا يتضح شغف الفنان الرافديني بالحيوانات و معرفته بتكوين اجسادها و انفعالاتها. اما في القطعة العاجية المنقوشة و الملونة التي تصور زنجياً فهنا يكون التحليل رمزياً.. فانا ارى ان اللبوة ليست تمثل حيواناً شرساً يفترس انسان و لكنها بحركتها الاليفة هنا من حيث احتضانها للزنجي من خلال النظر الى كفها اليسرى خلف رقبته لاتدل على انها تفترسه بل تقف له بحب و شهوانية، ولأن الزنجي لايبدي اي مقاومة، فجلسته تدل على انه مستسلم ووجهه يدل على الراحة و الاطمئنان.. ان هذه اللبوة ربما تمثل امرأة ذات نفوذ وهي تمتلك هذا الزنجي، ولأن الزنوج وعلى مر التأريخ كانوا عبيد يباعون و يشترون في سوق النخاسة، وهنا هذه المرأة المتمثلة باللبوة اختارت اشباع ملذاتها الشهوانية في ممارسة الحب مع خادمها المطيع الذي ليس له الحق في الاعتراض على رغبات سيدته مالكة جسده و روجه، وفي اي وقت و في اي مكان تختاره هي. في هذه القطعة لانرى مظهر من مظاهر الهجوم و العنف لهذه اللبوة، فلا هناك مخالب هجومية واضحة من قوائمها وانما احتضان ودي بين امرأة و رجل، حتى ذيل اللبوة في وضع يدل على انها ليست في وضع هجومي..

اما النبات البردي فهو يدل على المكان الآمن و البعيد عن اعين الرقباء لمعرفتنا بان البردي نبات ينبت من مساحات مائية بارتفاع عالي، مما يدل على ان اللبوة (المرأة) اختارت المكان الآمن لتمارس الحب مع عبدها هذا.

في هذه القطعة اختار الفنان اسلوب التبسيط في النحت فالتشريح العضلي غير واضح بالنسبة للبوة و الشخص الزنجي، وهنا يتضح ان الفنان اهتم بتوصيل الفكرة

الرمزية اكثر من التفاصيل التي قد تشوش المتلقي عن وصول الفكرة اليه بسرعة دون التفاصيل التشريحية الدقيقة التي لاتفيد عمق الفكرة.

الاستنتاجات :

في نهاية هذا البحث المصغر استنتجت الباحثة ان الفنان الرافديني وصل درجة من الرقي الذي حير الباحثين للتوصل الى ماكان هذا الفنان يعبر عن انفعالاته التي تضفي على المضمون الجمالي دلالة وجدانية خاصة، رسخت مضامينها الرمزية في حركة الفكر الاجتماعي.. ولخصت الاستنتاجات بما يلي :

١- ان قيمة الشكل الفني تأتي من قدرته التعبيرية، وهناك عدد من المضامين التعبيرية في العمل الواحد.

٢- يمكن تطويع المألوف الى اللامألوف بانسجام تراكيبه، فالحركات و الوقفات و النظرات و التداخلات الفنية الاخرى و الرموز و الايحاءات و المجاورات بتراكيبها جميعها اشكال مختلفة للتعبير عن الدلالات الرمزية.

٣- مالا يقوى على التعبير يستتر خلف الرمز، ففاعلية الرمز واضحة في استثارة حواسنا و قدرتنا العقلية لإيجاد طرق للتعبير.

٤- ان صدق وسائل التعبير هو الشكل ذاته.

٥- الرمز هو الجزء الأعمق في التعبير وهو قدرة التعبير، يبنى العمل الفني على الاستعارات الرمزية التي هي صفة للتعبير عن الفن.

٦- ان التمثيل الفني لدى الفنان الرافديني هو تأكيد لقيم رمزية تعبيرية تطفح بالمشاعر الانسانية، فالأشياء كانت تتخذ اشكالاً في عقل الفنان قبل ان تنفذ في العمل الفني.

٧- عندما يمتلك الاثر الفني معان متعددة فذلك ناتج عن بنيته وتلك هي الخاصية الرمزية لفنون، و الرمز ليس الصورة و انما تعدد المعاني في ذات العمل، حيث يحتوي العمل الفني عدداً هائلاً من المعاني المستنبطة و الظاهرة المتجددة الناتجة في حركة و علاقات الرموز بعضها ببعض و ترابطها في العمل الفني.



اللبوة المحتضره-١-



جدارية صيد الاسود



لبوة تهجم على شخص في حقل من ورد اللوتس والبردي..يرجع الى سنة



نحت بارز -سنه ٢٨٥٠ ق.م



نسر براس اسد-اور

---

پەراوێزەکان :

[1] نمرود منطقة مرتفعة في نينوى تسمى (كالح القديمة)،عبارة عن تلة و بدأ التنقيب الأثري في هذه المنطقة من قبل البعثة الفرنسية عام (١٨٤٢- ١٨٤٥) برئاسة P.Botta (القنصل الفرنسي في الموصل) وجاء بعده الإنجليزي A.H.Layard في عام ١٨٤٥ حيث وجد بقايا مدينة و قصور.

[2] د. عبد، كمال، فلسفة الأدب و الفن، دار العربية للكتاب، ليبيا، تونس، ١٩٧٨.

[3] الصلايلي، عبدالله، الصحاح في اللغة و العلوم، تصنيف: نديم مرعشلي- اسامة مرعشلي، بيروت، دار الحضارة العربية ، ١٩٧٤.

[4] نفس المصدر رقم (١) السابق.

[5] سعدون العذاري، أنغام/ بنية التعبير في الفن العراقي القديم، دار مجدلاوي للنشر و التوزيع، عمان.

المصادر :

١- د. الباشا، حسن: الفنون القديمة في بلاد وادي الرافدين، اوراق شرقية للطباعة و النشر و التوزيع، بيروت- لبنان، ٢٠٠٠م.

٢- د. عبيد، كمال: فلسفة الادب و الفن، الدار العربية للكتاب، ليبيا- تونس، ١٩٧٨م.

٣- السواح، فراس: مدخل الى نصوص الشرق القديم- دار علاء الدين للنشر و التوزيع و الترجمة، سورية- دمشق، ٢٠٠٦م.

٤- د. صاحب، زهير: الفنون التشكيلية العراقية، مطبعة دبي- بغداد، ٢٠٠٧م.

٥- د. صاحب الزهير: الفنون السومرية، ايكال للطباعة و النشر، بغداد، ٢٠٠٤م.

٦- حسين جودي، محمد: فنون العرب قبل الاسلام، دار المسيرة، عمان، ١٩٩٨م.

٧- د. فارس، شمس الدين و د. عيسى الخطاط، سلمان: تأريخ الفن القديم، دار المعرفة ١٩٨٠م.

٨- اسماعيل علام، نعمت: فنون الشرق الاوسط و العالم القديم، دار المعارف، ١٩٧٥م.

٩- لويد، سيتن: فن الشرق الادنى القديم، ترجمة محمد درويش، دار المأمون، بغداد، ١٩٨٨م.

عبد شهيب، نجم: موجز في تأريخ الفن، دار اجنادين للنشر و التوزيع، السعودية، ٢٠٠٦م.

# پرسیار و وەڵام دەربارەی مێژووی کورد "بنەماڵەی سوڵتان مظفرالدین و فەرمانڕەوایەتی هەولێر"

پ.د. أرسن موسی رشید
د. محمد عبدالله کاکە سوور

پ١/ ناو و ڕەگەزی ئەو بنەماڵەیە چی یە؟

و/ ئەو بنەماڵەیە بە ڕەگەز تورکی ناوەڕاستی ئاسیان لەگەڵ سەلجوقییەکان لە کۆتایی سەدەی پێنجی کۆچی هاتوونەتە ناوچەی ئێران و عێراق و نازناوی ئەو بنەماڵەیە (آل بکتکتین)ـــە.

پ٢/ ناوی باوکی سوڵتان مظفرالدین چی بوو؟

و/ ناوی علی کوچك بووە، بۆیەش پێیان وتووە کوچك چونکە کورتە بالا بووە.

پ٣/ علی کوچك چ کارە بووە؟

و/ یەکێك لە سەرکردەکانی عمادالدین زنگی بووە، عمادالدین زنگی ناوچەی موسڵ تاکو بەغدا و حەلەب و دیمەشقی لەژێر دەسەلاتدا بووە و دەوڵەتەکەشی پێی ووتراوە دەوڵەتی زنگی.

پ٤/ ئەم بنەماڵەیە چۆن هاتوونەتە هەولێر؟

و/ عمادالدین زنگی لەنێوان ساڵانی ٦٢٢- ٦٢٦ك دەستی بەسەر هەولێردا گرتووە و ئەو هەولێری داوەتە دەستی علی کوچك کەیەکێك لە گەورە سەرکردەکانی بووە، بەگوێرەی مێژوونووسانیش علی کوچك خۆی هەولێری وەکو یەکێك لە ناوچە دەرەبەگایەتییەکانی هەڵبژاردووە.

پ٥/ بۆچی علی کوچك هەولێری هەڵبژارد؟

و/ لەبەر دوو هۆی سەرەکی یەکێکیان نزیکی موسڵ بوو، کە خۆیشی سەرکردەیەك بوو لای عمادالدین زنگی کەلە موسڵ دادەنیشت و هۆی دووەمیش لەبەر قەڵاتی هەولێر کە کردی بە جێگای میرنشینەکەی خۆی و ماڵی خۆیشی بردە ئەوێ.

پ٦/ علی کوچك چەند منداڵی هەبوو؟

و/ مێژوونووسان دەڵێن دوو کوڕی هەبوو، کوڕی گەورەی گوگبوری بە مانای گورگە شین و نازناویشی ابو سعید بوو و دواییش نازناوی دەبێتە مظفرالدین کاتێك کە دەبێتە سوڵتان، دووەم کوڕی نازناوی (یوسف)ـە کاتێك بووە سوڵتان نازناوی بووە زین الدین و ئەمەی دواییان کوڕی بچووکیەتی.

پ٧/ میر علی کوچك لە کوێ مرد؟

و/ مێژوونووسان باس دەکەن کە تەمەنی گەورە بووە و چاوی کز بووە و موسڵی بەجێهێشت و لەگەڵ بنەماڵەکەی لە قەڵای هەولێر دانیشتن بۆیە دوای مردنی لە هەولێر نێژرا و بە گوێرەی مێژوونووسان گۆڕەکەی نزیك قەڵا بووە بۆیە ئەو گۆڕەی کە نزیك پارێزگای هەولێرە هی باوکی (علی کوچك)ـە.

پ٨/ کێ پاش علی کوچك بووە فەرمانڕەوای هەولێر؟

و/ یەکەمین فەرمانڕەوای هەولێر دوای علی کوچك کوڕە بچووکەکەی یوسف زین الدین بوو لەبەرئەوەی ئەو کەسەی بەخێوی دەکرد ئەتابکیان بوو بەناوی مجاهیدالدین قیماز کە پێی خۆش نەبوو کوڕە گەورەکەی مظفرالدین لەدوای باوکی دابنیشێ بۆیە وای کرد مظفرالدین هەولێر بەجێ بهێڵێت چونکە دەیویست هەموو دەسەڵاتەکان لەدەست خۆیدا بێت.

پ٩/ میر زین الدین یوسف چەند لە فەرمانڕوایەتی هەولێردا مایەوە؟

و/ لەبەرئەوەی مجاهیدالدین قیماز فەرمانڕەوای ڕاستەقینە بوو بۆیە دەتوانین بڵێین زین الدین ماوەیەکی کەم فەرمانڕەوایەتی کرد و کە سوڵتان صلاح الدین

ئەیوبی داوای کرد خۆی و سوپاکەی هەولێر بێنە فەلەستین بەرگری بکەن دژی خاچ دروشمەکان، تەمەنی بچووك بوو، کە چووە فەلەستین برا گەورەکەی مظفر الدین لەویٚ دەبێت هەردووکیان لە شاری ناصرە کۆدەبنەوە و بەڕای مێژوونووسان زین الدین بە نەخۆشییەکی کوشندە لە ناصرە دەمرێت بۆیە صلاح الدین ئەیوبی مظفرالدین ڕادەسپێرێت ببێتە فەرمانڕەوای هەولێر، و نازناوی سوڵتانی پیٚ بەخشرا.

پ١٠/ چ پەیوەندییەك لەنێوان صلاح الدین مظفرالدین دا هەیە؟

و/ شاری حران کە دەکەوێتە نێوان تورکیا و سوریا و ئێستا لە تورکیادایە لەلایەن سوڵتان صلاح الدینەوە درا بە مظفرالدین هەروەها صلاح الدین خوشکی خۆی کە ناوی ڕەبیعە خاتوون بوو دا بە مظفرالدین، کەواتە مظفرالدین زاوای صلاح الدین.

پ١١/ ئایا مظفرالدین نەوەی هەبوو؟

و/ بەگوێرەی مێژوونووسان هیچ کوڕی نەبووە بۆیە پێی دەووترا ابو سعید و ئامارەش بەوە نەکراوە کە کچی هەبووە، بەڵام وادیارە دوای مردنی ڕەبیعە خاتوون هەولێری جێهێشتووە و بنەماڵەکەیان لە هەولێر نەبووە، دەتوانین بڵێین ئەمەش بەڵگەیە بۆئەوەی کە کچیشی نەبووە.

## ڕیپۆرتاژێك دەربارەی :

# کتێبخانەی گشتی حاجیاوا

ئامادەکردنی : أومید ابراهیم محمد

مێـژووی دروسـتبوونی شارۆچـکەی حاجیـاوا دەگەڕێتـەوە بـۆ سـاڵی (١٩٨٨)ئـەویش لەئـەنجامی پیـادەکردنی پرۆسـەی ڕاگواسـتن و چـۆڵ کردنـی گوندەکانی کوردستان لەلایەن ڕژێمی بەعسی ڕووخاو(١٩٦٨-٢٠٠٣) بەتایبەتی گوندەسنورییەکان بەبیانووی بوونی بارەگا وهێزو چالاکی پێشمەرگە لەو ناوچانە . حاجیاوا لەسەرجەم گوندەکانی ناوچەی مەرگە و دۆڵی جافایەتی و گوندەکانی بناری کۆسرەت و ناوچەی پشدەر پێك هاتووە، سەرەتا تەنها ئۆردوگایەکی زۆرەملێ بوو بەمەبەستی نیشتەجێ کردنی دانیشتوانی ئەو گوندانە. حاجیاوا لەڕووی جوگرافی یەوە دەکەوێتە باکوری ڕۆژئاوای قەزای ڕانیە لەپارێزگای سلێمانی وەلەڕووی ئیداریشەوە هەر سەر بەو قەزایەیە .

حاجیاوا لەدوای ڕاپەڕینەمەزنەکەی بەهاری ساڵی (١٩٩١) گەشەی بەخۆوە بینیـوە، هەرچـەندە لـەماوەی سـاڵانی (١٩٩٢-٢٠٠٠) ژمارەیـەکی زۆر لەدانیـشتوانەکەی چـوونەوە گونـدەکانی خۆیـان ،بـەلام دواتـر ئـەو بارودۆخەپێچەوانەبۆوە.لەساڵی (١٩٩٩) حاجیاوا لەڕووی ئیداری یەوە بووەتە ناحیە،کەئێستا ژمارەی گوندەکانی (١٣) گوندە و شارۆچکەی حاجیاوا مەرکەزی ناحیەکەیە وە ژمارەی گەڕەکەکانی (١٥) گەڕەکە و (١٩) فەرمانگەی حکومی تێدایە کەگرنگترینیان (دادگای بەرایی حاجیاوا)یە کەلەساڵی (٢٠٠٤) دوە کراوەتەوە .

لایەنێکی گرنگی ژیانی ڕۆشنبیری حاجیاوا بوونی کتێبخانەیەکی گشتی گەورەیە لەناحیەکەدا .

کتێبخانەی گشتی حاجیاوا لەساڵی (٢٠٠٥)ەوە فەرمانی دامەزراندنی دەرچووە، وە لە(٢٠٠٥/٤/٢٧) لەناحیەکە بەفەرمی کراوەتەوە کەسەرەتا بینای تایبەتی خۆی نەبووە، بەڵکو لەبەشێکی نەخۆشخانەی حاجیاوا جێگەی بۆکراوەتەوە، لەهەمان ڕۆژدا بەردی بناغەی بینایەکی تایبەت بەو کتێبخانەیە لەلایەن (شێخ سەعید شاکەلی) بەڕیوەبەری گشتی بەڕێوەبەرایەتی کتێبخانە گشتییەکان دانرا. پرۆژەی دروستکردنی بینایەکەش لەلایەن کۆمپانیای (بانە)ەوە وەرگیراوە کەماوەی پرۆژەکە (٣٦٠) ڕۆژ بووە بەبڕی (١,٠٧٨,٤٩٤,٨٣٣) دینار، ئەم بودجەیەش لەلایەن وەزارەتی ڕۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە تەرخان کرابوو .

پرۆژەکە لە (٢٠٠٧/٧/٢٩) وەرگیراوەو لە(٢٠٠٧/٨/٢٦) کتێبخانەکە گواستراوەتە ناوی و دواتر لە(٢٠٠٧/٩/١٢) ئاهەنگی کردنەوەی بۆکراوە. بینای کتێبخانەکە لەسەر سیستەمێکی تازەی پێشکەوتوو بە (٢) نهۆم دروست کراوە .

شایانی باسە کتێبخانەکە لەچەند بەشێك پێك هاتووە وەکو بەشی کارگێڕی گشتی کە بەڕێز (عیمان محمود عبدالکریم ) بەرپرسی کارگێڕی یەکەیە هەروەها بەشی خواستنی کتێب و بەشی کتێب واتا بەشی پۆلێن کردنی کتێب وە بەشی منالآن و کارگێڕی و کۆگا و هۆڵی کۆڕوکۆبونەوەو سیمینار و هۆڵێکی گەورەی خوێندنەوە .

وەلەڕووی بەڕێوەبردنەوە ژمارەی کارمەندەکانی تەنها (٤) فەرمانبەرو (١) کارگوزارو (١) پاسەوانی شەوانەیە، بەپێ ی ڕاپۆرتی مانگی مایسی (٢٠١٠) ی کتێبخانەکە کەهاوکاتە لەگەڵ بەرواری ئامادەکردنی ئەو ڕیپۆرتاژە ئەوا ژمارەی کتێب وگۆڤارو ڕۆژنامەکان لەناو کتێبخانەکەدا بەم شێوەیەیە:

- ژمارەی کتێب (٧٦٦٢) کتێبە .
- ژمارەی گۆڤار (١٦٥٤) گۆڤارە .
- ژمارەی ڕۆژنامەکان (٢٧٠٤) ڕۆژنامەیە .

وە بەپێ ی زانیاری هەمان ڕاپۆرت ساڵانە نزیکەی (٤–٦) هەزار خوێنەر سەردانی کتێبخانەکە دەکەن و سوودی لێ وەردەگرن .

وە ئەو کتێب و گۆڤارو ڕۆژنامەو بڵاوکراوانەش بۆ خوێنەرانی ناو هۆڵ و دەرەوەی هۆڵیش بەکاردەهێنرێن، هەربۆنموونە بەپێ ی هەمان ڕاپۆرتی مانگی مایس خواستنی کتێب بۆناوخۆ و دەرەوەی کتێبخانەکە و بەپێ ی ڕەگەزی نێرو مێ بەم شێوەیە بووە :

| خوێنەر | خواستنی کتێب بۆ : | | کۆی مانگانەبەپێی ڕەگەز |
|---|---|---|---|
| | ناوخۆی کتێبخانە | دەرەوەی کتێبخانە | |
| ڕەگەزی نێرینە | ٢٩٢ | ١٠٤ | ٣٩٢ |
| ڕەگەزی مێینە | ١٨١ | ٧١ | ٢٥٢ |
| منداڵان (نێرومێ) | ١١٥ | ٥٤ | ١٦٩ |
| سەرجەم | ٥٨٨ | ٢٢٩ | ٨١٧ |
| کۆی گشتی | ٨١٧ | | |

لەلایەکی ترەوە ئەو کتێب و گۆڤارو ڕۆژنامەو بڵاوکراوانە بەچەندزمانێکی وەکو کوردی وعەرەبی و ئینگلیزی و فارسی بەرچاودەکەون، وەهەر بەپێ ی هەمان ڕاپۆرتی سەرەوە پۆلێن کردنیان بەپێ ی زمانەکان و ژمارەکانیان بەم شێوەیەیە:

| زمان | کتێب | | | | | گۆڤار | | | | | ڕۆژنامە | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | کوردی | عەرەبی | ئینگلیزی | فارسی | زمانی تر | کوردی | عەرەبی | ئینگلیزی | فارسی | زمانی تر | کوردی | عەرەبی | ئینگلیزی | فارسی | زمانی تر |
| سەرجەم | ٥٢٢٢ | ٣٣١٩ | ٨٢ | ٢٥ | ١٤ | ١٠٠٧ | ١٢٠ | ٢ | ٠ | ٢٣ | ٣٦٠٢ | ٨٢ | ١٧ | ٠ | ٢ |
| کۆی گشتی | ٧٦٦٢ | | | | | ١٦٥٤ | | | | | ٣٧٠٤ | | | | |

ماوەتەوە بڵێین کەبەپێ ی ووتەی بەڕێز (عثمان محمود عبدالكريم ) بەرپرسی گشتی کتێبخانەکە، ئەم کتێبخانەیە لەڕووی ئیداری یەوە پێویستی بەژمارەیەکی زۆرتری فەرمانبەر هەیە بۆهەڵسوراندنی ئیش و کارەکانیان، پێویستی یەکی زۆریان بەبیرێکی ئاو هەیە بەمەبەستی دابین کردنی ئاوی پێویستی خواردنەوە و بەکارهێنان بۆ کتێبخانەکە هەروەها پێویستی بەهۆڵێکی گەورەی ئینتەرنێت هەیە وەك تەکنۆلۆجیایەکی سەردەم .

# چاوپێکەوتنێك لە گەڵ بەڕێز د. عوسمان عەلی

ئەنجامدانی د. محمد

بەڕێز دکتۆر عوسمان بەخێرهاتنت دەکەین لە چاوپێکەوتنی ئەمجارەمان بۆ گۆڤاری مێژوو. لە سەرەتادا دکتۆر لێت دەپرسین ئایا جەنابت مێژووت بە ئارەزووی خۆت هەڵبژاردووە یان چۆن بوو ئەو پسپۆریەت وەرگرت؟

+ بەڵی، منیش زۆر بەخێرهاتنتان دەکەم و سوپاستان دەکەم کە ویستتان میوانداریێتی من بکەن لەم دانیشتنەدا بۆ گۆڤارەکەتان، بەڕاستی یەکەم شت ئەو گۆڤارە زۆر جێگای دڵخۆشییە و هیوای سەرککەوتنتان بۆ ئەکەم و کۆڵمەدەن و (إن شاءالله) سەریش ئەکەون. بەڵی من هەر لە وەختی ئەتوانم بڵێم لە ئامادەیی بووم، لە کەرکوك بووم، کتێبی مێژووم ئەخۆنیا، بەتایبەتی ئەو کتێبانەی کەوا باسی ژیانی ئەو کەسانەی کەوا کورتەنامەی ژیانی خۆیان نووسیبوو، ئەوانەم ئەخۆنیا، ئیتر لەوەوە مێژوو وەکو بابەت زۆر سەرنجی ڕاکێشام و لە هەمان کاتدا، ئێمە وەکو میللەتێك ئەمانویست بزانین مێژووی میللەتەکەمان چی یە و بۆچی گەیشتوینەتە ئەمڕۆ، ئەمە (تقریباً) لە بەشی دووەمی شەستەکاندا ئەو هەستەم پەیدابوو بەرامبەر مێژوو، بەشێوەیەکی زۆریش مامۆستا (محمد أمین زەکی بەگ) و (مینۆرسکی) کاریگەرییان لەسەرم هەبوو، کە باسی مێژووی کوردیان کردووە.

– بەس نامەی دکتۆرات نووسی یان پێشتر ماستەرت هەبوو ئەوجا دکتۆرا؟

+ پێشتر دوو ماستەرم هەیە، ماستەرێکم هەیە لە پەیوەندییە نێودەوڵەتیەکان و زانستە سیاسییەکان) و بە کالۆریۆسێکم هەیە و لە (علوم سیاسە)ش ماستەرێکم هەیە.

– ناونیشانی نامەی دکتۆراکەت؟

+ ناونیشانی (دۆزی کورد لە ١٩١٨ – ١٩٣٢، سیاسەتی ئینگلیز بەرامبەر بە مەسەلەی کورد لەم کاتەدا).

– لە کوردستان بەگشتی یان لە کوردستانی عێراق؟

+ لە کوردستانی عێراق، ئەتوانم بڵێم حەرەکاتی (شێخ مەحمود) و (شێخ أحمدی بارزان).

– دکتۆر لە ساڵی چەند لەدایك بوویت و لە کوێ؟

+ ١٩٥٥ لە ناحیەی لەیلان کە سەر بە شاری کەرکوکە.

– تاکو ئێستا چەند کتێبت چاپ کردووە؟

+ وەکوو کتێبم تەنهایەك کتێبم چاپ کردووە و سێ کتێبم ئامادەیە بۆ چاپ بەڵام وەکو دیراسات و مەقالات بەسێ زمان شتم هەیە، بە تورکی و عەرەبی و ئینگلیزی.

– تا چەند زانینی زمان گرنگە بۆ مێژوونووس بەڕای تۆ؟

+ ئەتوانم بڵێم زۆر گرنگە، یەکێك لەوانە کە من زۆر بەختەوەربووم کە زمانی تورکی و عەرەبیم ئەزانی جگە لە کوردی و ئینگلیزی، بەڵام (فەرەنسی و فارسی)ش ئەخوێنمەوە، بۆ ئینسانی لێکۆڵەر زۆر زۆر گرنگە بەتایبەتی لەسەر ئەو بابەتانەی کە پەیوەندی هەیە بە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، ئەبێ ئەم زمانانە بزانێ جگە لە زمانی ئینگلیزی و فەرەنسی، ئەوە هەر پێویستە، طبعاً تاڕددەیە ئەڵمانی و (ڕووسی)ش زۆر گرنگە، من بەداخەوە ئەو دوو زمانە نازانم.

– باشە سەبارەت بە ئەرشیفی ئەو زمانە تا چ ڕادەیەك شارەزایت لە ئەرشیفی عوسمانی؟ ئەو پرسیارە دەکەین چونکە لە (زانکۆی صلاح الدین) هەندێك نامە نووسسراوە لەسەر کورستان لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانی، بەڵام ئەو نامانە دیکۆمێنتی عوسمانیان بەکارنەهێناوە، یان لەوانەیە یەك دوو

دیکۆمینتی تێدا بەکارهاتبێ، پێت وانییە هەتا ئەو نامە زانکۆییانە ماستەربێ یان دکتۆرابێ، کەم و کوڕی زۆری تێدایە ئەگەر بەشێوەیەکی باش سوود لەو ئەرشیفە وەرنەگیرابێ؟

+ بەڕاستی لەسەر دکتۆراکەی خۆم کە لەسەر (شێخ مەحمود و شێخ أحمەدی بارزان) بوو، مامۆستاکەم کە سەرپەرشتی دکتۆراکەی منی ئەکرد، ووتی بەهیچ جۆرێک سەرچاوەی دووەم قەبوڵ ناکەین ئەبێ بچیتە ئەرشیف، (ئەرشیفی بریتانی)، تۆ باسی سیاسەتی بەریتانی ئەکەی دەربارەی مەسەلەی کورد، چۆن ئەبێ بی ئەرشیف بێ، بێ ئەرشیفی ئینگلیز کە ئەوان لە کوردستان بوون تۆ باسی سیاسەتی ئەوان ئەکەی ئینجا بەعزە وڵاتێک هەیە بەعزە دەزگایەك هەیە ئەرشیفی خۆیان نادەنە خەڵك، ئینجا لەو کاتەیا ئەو شتانەی کە ئەکرێ لایەنە ئەکادیمییەکەی زۆر لاواز ئەبێت، من نە خۆم نە قوتابی خۆم چ ماستەر بێت یان دکتۆرا بێت قەبوڵ ناکەم ئەو شتە بکات، ئەگەر تۆ ئەتەوێت باسی سیاسەتی عوسمانی بکەیت لە مەنتیقەیەك لە کوردستان بە گشتی بێ ئەرشیفی عوسمانی نابێت بیکەیت، حەزئەکەم بڵێم ئەرشیفی عوسمانی تەقریبەن ماوەی پانزە ساڵە کراوەتەوە.

– هەندێك پاساو دێننەوە دەڵێن ئێمە ناتوانین سەفەر بکەین بۆ تورکیا یان ئەوەتە دەڵێن توانای مادیمان نیە، باشە ئەگەر بابەتێکی تر هەڵبژێرن باشتر نیە؟

+ خەڵك جاران بۆ (أطروحة)یەکی دکتۆرا ئەچوو بۆ چەند دەوڵەتێك، ئێستا لە ئەورووپا بۆنموونە وەکو عادەتە قوتابی دکتۆرا تاڕادەیەکیش قوتابی ماستەر ئەچێت بۆ دەوڵەتێکی تر، بەڵێ زرووفی ئیقتیسادی لە ئەورووپا زۆر جیاوازە بەڵام وەبان ئەوەشەوە من خۆم ئەگەر لە کوردستانیش بم ناوێرم تێزی دکتۆرا بنووسم لە بابەتێك پەیوەندی بە ئینگلیز بێت یان بە عوسمانی یان بە ڕووس بێت، ئەگەر ئەرشیفی ڕووس یان عوسمانی یان ئینگلیز کراوە نەبێت.. چونکە ئەوە لە تێزی

دکتۆرا ناچێت. ئەوە وەکو بڵێیت لێکۆڵینەوەیەکی رۆژنامەوانییە، ئەوە هیچ لایەنێکی ئەکادیمی نیە.

- باشە کاك دکتۆر پرسیارێکی تر سەبارەت بە زمانی نووسسینی مێژوو، زمانی نوسینی ئەدەب؟ لەیەکێك لە سەرووتارەکانی گۆڤاری مێژوو باسمان لەو بابەتە کرد وەنەبێت بابەتێکی نوێمان باس کردبێت، پێمان وایە کە ئەدیب پێویستی بە خەیاڵە لە کاتی نوسین، بەڵام مێژوونووس پێویستی بە زمانێکی واقیعییە، جیاوازییەکی زۆر هەیە لەنێوان زمانی مێژوونووس و ئەدیب، شاعیر و رۆماننوس پێویستیان بە فەنتازیا هەیە، بە خەیاڵ هەیە، بەڵام مێژوونووس پێویستی بە بێ لایەنی و بە واقیعییەت هەیە، بەڵام تاکو ئیستا لە نووسینە کوردییەکاندا جار وایە لەسەر ئاستی زانکۆش مامۆستا هەیە موناقەشەت دەکات دەڵێت: جیاوازی نیە لەنێوان ئەو دوو زمانە، جەنابت رات چیە بەرامبەر بەوە؟

+ بەرای من بەڵێ، زمانی ئەدەب و زمانی رۆماننووس و زمانی مێژوو دوو زمانی زۆر زۆر جیاوازن.. بەڵێ ئەوە ئەبێت ئینسان ئیقرار بکا، کە تۆ مێژووش ئەنوسی ئەبێ تۆزێ شێوازی نووسینەوەکەت وابێ کە سەرنجی خوێنەوار رابکێشێ، ئینجا لیرە ئەبێ جارەوجار بەعزێ شت بەکاربێنی کە نووسەری رۆمانیش بەکاری دێنێ، وەکو ئەوەی لە شێوازێکی ئەکادیمی بەرز دابەزیتە ئاستی خوێنەوارێك کە ئەبێ بزانی هەموو خوێنەوارەکان ئەکادیمی نین، لەبەرئەوە جار بەجار ئەبێ بە زمانی ئەوانیش قسە بکەیت. بەڵام زمانی مێژوونووس ئەبێ زمانێك بێت دوور بێت لە خەیاڵ و زۆر زۆر واقیعبین بێت، جگەلەوەش ئەبێ راستگۆ بێت و ئەو مێژووە بنوسێ نەك وەکو خۆی حەز ئەکات بەڵکو خۆی چۆنە ئاوا بێت، ئەوە زۆر زەحمەتە ئێمە زۆر مێژوونووسانمان ئەو چوارچێوە تیۆریانەی کە هەیانە ئەیانەوێ ئینعیکاسی بکەنە سەر رووداوەکە کە لەسەری ئەنووسن، لەبەرئەوە سەیر ئەکەی

دوور ئەبن لە واقیع، بەڵام کە تۆ مێژوونووس بی، یەکەمجار مێـژوو مەنووسـە بـۆ دەرس، بۆ وانە، چونکە کە تۆ مێژوو ئەنووسی بۆ وانە، پێشەکی تۆ قـەرارت داوە ئەتەوێ شتێ ئیسپات بکەیت.. ئینجالەبەرئەوە کە ئەو پێشەکییەت لە خەیاڵ بوو، شتەکانت نابینی ئیلا بەوە ئەبینی ئەتەوێ ئەو شتەی لە خەیالتە، نـا.. تـۆ مێـژوو بخوێنە، بەشتێ بڵێ نازانم، بزانم چییە، وا لێی بکۆڵەوە، ئینجـا لـە ئـەخیرا ئەگـەر شتێ گەیشتە قەناعـەتی ئـەوە بڵـێ، ئـەوەش جـوانترە خـۆت نـەیڵێی. مەسـەلەن زۆرجار ئەیانگوت لەم ڕووداوە ئەم وانەیە فێر ئەبین، نا ئەوەش مەڵێ، با خوێنەوار خۆی بگات بەم وانە مێژووییە، چی تێگەشتی لەوە تۆ مەیڵێ، با خوێنەوار، چونکە ئیحتیماله خوێندەوارێکی تر هەمان ڕووداو ئەخوێنێتەوە شتێکی تری لێ تێئـەگات یـانیش ئـەزانێ تـۆ ئەتـەوێ تـۆ هـەموو ئـەو دەرسـانەی پـێ ئـەڵێیت کـە بگاتـە نەتیجەیـەك.. ئینجـا بگەڕێینـەوە سـەر پرسـیارەکە.. بـەڵێ جیـاوازی هەیـە و نووسەری مێژوو ئەبێ نووسەری مێژوویی و نووسەری ئـەدەب و و ڕۆمـانیش ئـەوە دوو زمـانی زۆر جیـاوازە، ئـەوەی بڵـێ جیـاواز نییـە بـەبڕوای مـن هەڵەیـە، بـەڵام سـەرلەنوێ بـە کـورتی ئـەیڵێم ئـەبێ مێـژوونووس بـەعزێ جـەوانبی مەسـەل و ئیستیعارە و ئەمانە بەکاربێنێ کە ئـەدیب بـەکاری دێنـێ، هـەتا ئـەو شـتانەی کـە خۆی ئەیەوێ نزیکی کاتەوە لە خوێندەوار.

- سـەبارەت بـە مێژوونووسـەکانی کـورد، سـەردەمێك دیـارە مێژوونووسـەکان ئەوانەی مێژوویان دەنووسیەوە ئەوانە کەسانی ئەکادیمی نەبوون چونکە دیارە زانکۆکـان و بەشـی مێـژوو لـە کوردسـتاندا ماوەیـەکی زۆر نییـە پـەیدا بـوون، مەسەلەن شەرەفخانی بەدلیسی کەسێکی ئەکادیمی نـەبوو، محمـد أمـین زکـی ئەکادیمی نەبوو، بەڵام ئایا پێت وانییە ئەوە سەردەمێکی مێژوویی بوو، ئێستا کاتێك ئێمە کۆمەڵێك بەشی مێژوومان هەیـە لـە کوردسـتان، قوتابیمـان هەیـە مەسـەلەن لـە ئـەورووپا لـە ڕووسـیا لـە یـەکێتی سـۆڤییەتی جـاران خوێنـدنی

ئـەکادیمیایان تـەواو کـردووە، ئایـا پێـت وانییـە ئێـستا مێـژوو زیـاتر لەلایـەن ئەکادیمییەکانەوە بنووسریّ باشترە نـەك لەلایـەن نووسـەرێکی بـابڵێین هـاوی هەر خۆی حەزی لە مێژووە؟

+ بێگومان .. بەڵام محمد أمین زکی و شەرەفخانی بەدلیـسی ئەمانـە هـەردووکیان ئەکادیمی بوون..

– وەکو پسپۆری مێژوو نەبوون..

+ پسپۆری مێژوو نەبوونە، بەڵام لەو کاتەیا هەتا لە مێژوونووسانی ئەورووپی ئـەو (تخصـوص)ەی (specialization) کە ئەمرۆ ئەیبینی نەبووە، مێژوونووسەکان یەکێك وەکو ئەفلاتوون مێژووی نووسیوە خـەڵکی تـریش مێـژوویان نووسـیوە کـە فەیلەسووف بوونە و لە هەمان کاتدا، یەکێك وەکو (طـبري) موفەسـیری قورئانـە و لەهەمان کاتدا مێژوونووسە، ئینجا یەکێك وەکو (شەرەفخانی بەدلیـسی) بەڕاسـتی زۆر بە جوانی مێژووی نووسیوە، مامۆستا محمد أمین زەکی)یش ئەکادیمی بـووە، چەند کتێبێکی بە زمانی تورکی هەیـە بەداخـەوە خوێنـدەواری کـورد ئاگادارییـان نیە، لە بابەت عەسکەرییەکان شتی نووسیوە، ئیداریش شتی نووسیوە، مێژووش.

– خۆی دەرچووی کۆلێژی سەربازی بووە..

+ بـەڵێ.. ئـەزانم شـتی عەسـکەری نووسـیوە و ئەمانەشـی کـردووە، ئینجـا بـا بگەڕێینەوە سەر ئەوەی ئایا مێژوونووس لە کوردستان هاوی بینوسیّ.. بەڵێ ئێمـە لەم سەدەی بیست و یەك ئەژین (تخصص) زۆر گرنگە من ئێستا وەکو نوێژکـەرێك بەعزە جارێك ئەڵێن: کاکە تۆ نوێژ ئەکەیت ڕات بەم مەسەلەیە چی یە؟ ئەڵێم: مـن لەو شتانە نازانم بەس نوێژ ئەکەم ئەوە ئەبیّ ببیبەی بۆ لای (متخصص)، مەلاکان یـان ئەوانـەی علـومی شـەری ئـەخوێنن، مـەلاکان کـە لـە حـوجرە فێـر ئـەبن و (تخصص) ئەکەن، یان ئەوانەی خریجی شەریعەن، ئەوە لەوانـە بپرسـە، بـەڵام لـە هەمان کاتدا، هەر هاوییەك کتێبێك و دوو کتێبی لەسەر کورد خوێندەوە دانەنیشیّ

مێژوو بنوسێ، مێژوونووسی بەڕاستی جگەلەوەی فەنە، عیلمیشە، ئەگەر ئینسانی کە ئەساسی نەبێ و بە قولێ لە عیلمی مێژوو تێنەگات نزیکی مێژوو نووسین نەبێت، بەڕاستی ئامۆژگاری من بۆ خوێندکاران ئەوانەی کە لاون ئەبێ زۆر ئاگادار بن شت بنووسن، دوایی دە ساڵ نەدامەتی لێ ئەکەن، لەبەرئەوە کە ئەیشی نووسێ ئەبێ بەوپەڕی تەوازووعەوە بڵێی من ئەم شتانە ئەنووسم و ئەزانم ئەم لێکۆڵنەوەی من کەم و کورتییەکی زۆری هەیە، هیوادارم لە دوارۆژدا خۆم و چەند نوسەرێکی تر سەرلەنوێ بچنەوە سەر ئەم بابەتە.

بەڵێ بەکورتی بگەڕێینەوە سەر مەسەلەکە، هاوی ئەبێ دوور بێت لە مێژوونووسی چونکە ئەوە بەڕاستی غەدر ئەکات لە مێژوو، مێژوو شتێکی ئاسان نیە.

– حەکایەتیش نییە، هەندێك وەك حەکایەت تەماشای ئەکەن؟

+ حەگایەتیش نیە، دوایی من کتێبێك ئەنووسم تۆ کتێبێك ئەنووسی لە فلان شار یەکێکی تر.. ڕای گشتی مێژوونووسان لەگەڵ ڕۆنامەنووسان و یەعنی شتی تری ئیعلامی ئەمانە خاسەتەن مێژوونووسان ڕای گشتی ئەنووسن، ڕای گشتی دروست دەکەن، لەبەرئەوە ئەگەر هاوی بیت شت بنوسیت خەڵکی تریش دێنە سەر ڕای تۆ، لەسەر ئەو ئەساسەی تۆ بیروباوەڕی تەنانەت سیاسی یان کاری ڕۆژانەی لەسەر ئەوە ئەبێ..

با نموونەیەك بدەم، من تا خوێندەوەرای بەڕیزتان ئاگادر بێت یەکێك لەوانە دەربارەی مەلای خەتێ، کە (علی أساس) ئەوە مەلا بوو، عالمێکی دین بوو، بەبێ عەقڵانە مەشورەی غەڵەتی دایە میری سۆران و ئەمەش بووە هۆی ڕووخاندنی میرنشینی سۆران و کوردیش لەوەوە بێبەش بوو لە دەوڵەتێك، ئیتر ئەگەر تۆ ئەوە بخوێنی بەو ووردییە کە چەند کەسێکی هاوی ئەو شتانەیان نووسیوە، یان چەند کەسێك ئەو شتانەیان نووسیوە بە مەبەستێکی خۆیان هەرچەندەلەو چەرخە

نزیک بوونە بەڵام من وەکو خوێندەوارێك ئەوەم خوێندەوە کە هاوی بووم، خوێندمەوە تەئسیری لێ کردم، بەرامبەر دین، بەرامبەر عولەمای ئیسلام، چونکە ووتم هۆی هەموو ئەو قوڕبەسەرییەی بەسەر میللەتی کورد هاتووە ئەمانەن، بەڵام دوایی کە وەك قوتابی مێژوو خوێندمەوە بۆم دەرکەوت، جەیشێکی عوسمانی هاتبوو، پێنج شەش ئیمارەی تورکی ڕوخاندبوو، لە ئەستەمبوڵەوە هاتبوو، پێنج شەش ئیمارەی تورکی هەبوو، تورکیش بوون بەڵام نەوعە ئۆتۆنۆمییەکیان هەبوو، دژی سوڵتانی عوسمانی، ئەمە وەختی تەنزیمات بوو، سوڵتانی عوسمانی، سوڵتان مەحمودی دووەم قەراری دابوو هەموو ئەو ئیماراتە تورکییە و کوردییە و عەرەبییە هەمووی نەهێڵێت و هەموو بەگوێرەی ئیسلاحاتی غەربی کە پێیان ئەووت تەنزیمات دەوڵەتەکە مەرکەزی بکاتەوە سەرلەنوێ و دەعمی دووەلی ئەورووپی هەبوو، ئینجا میرێکی قوڕبەسەر لە سۆران چی ئەتوانی بکات بەرامبەر جەیشێکی وەها، بەڵی جەیشەکە لە بیدایەتا یەکەم هجومی شکا، ئەمانە شتێکی زۆر تەبیعییە، بەڵام جەیشێکی جەرار هاتبوو، یەکەمیش بشکێ دووەم هەر سەرئەکەوت و دوایی سەیری ژیانی خودی میری سۆران بکە، کابرایەکی زۆر زۆر لەوە زیرەکتر بوو بەقسەی مەلایەکی بێ عەقڵ بخەڵەتێت، دوایی هەتا ئەگەر واشبێت، مەلاکە خەتابار نییە، میری سۆران خەتابارە، میری سۆران ئەو قائید بوو، چونکە لە ئیسلامیشدا کە تۆ ئیستیشارە وەرئەگریت دوایی قەرار قەراری تۆیە، وەلی ئەمر مەسئوولە لە قەرارەکەی، بەڵام لە هەمان کاتدا نموونەی (شێخ مەحمودی حەفید) ئەیانگووت تەنها سەبەبێك کە کورد نەبووە دەوڵەت لەبەرئەوە بوو کە ئەو کابرایەکی بیر تەسك بوو، وەکو شێخێکی ئاینی وەکو بڵێیت پێی زەحمەت بوو تەوقە بکات لەگەڵ ئینگلیزەکان، ئەمەش وای لێم کرد بڵێیم بەڵێ، ئەم ئایینە چی یە بۆتە هۆی هەموو ئەو قوڕ بەسەرییانەی بەسەر میللەتی کورد هاتووە، تاکو ئەمڕۆ، بەڵام کە چووم ئەرشیفی بریتانیم بینی لە لەندەن یاداشتەکانی ئینگلیزەکانم خوێند، کە لە کوردستان و لە عێراق بوون، ئەوەڵەن

(شێخ مەحمود) بە ئاسانی تەوقەی ئەکرد، نەك تەوقەی ئەکرد، ماچیانیشی ئەکرد و لەگەڵیان هەڵئەسا و دائەنیشت، بەڵام کە ئینگلیز دیتە عێراق و کوردستان، هەر ئەساسەن فیکری دەوڵەتی نەبوو، ئەو تەوقەیەش هیچ ئەسەرێکی نییە، قەسدم لەمانە چی یە؟ ئەوانەی مێژوویان ئەنووسی هاوی بوون، تێنەئەگەیشتن، مەسەلەن ئەو چانسەیان نەبوو کە من وەکو مێژوونووسێك چووم ئەرشیفم دەرکرد، نامەکانی (شێخ مەحمود)م دەرکرد، شتم بە زمانی عەرەبی و ئینگلیزی دەرکرد، بەراووردیانم کرد، سەیرم کرد ئینگلیز خۆی (مسبقاً) قەراری داوە دەوڵەت بۆ کورد دروست نەکات، بۆیە ئەو شتانەی مێژوونووس ئەینووسێ زۆر گرنگە بۆ دوارۆژی میللەت، بۆ چەسپاندنی ڕای گشتی بۆ ئەو ڕەوشتانەی کە دوایی خەڵکەکە ئەیکەن، لەبەرئەوەی ئەکەونە ژێر تەئسیری ئەو.. لەبەرئەوە ئەبی ئینسانی هاوی خۆی دوورکات لە مێژوونووسین، یانیش کە ئەینووسێ بڵێ من وەك هاوییەك ئەینووسم، ئەمە ڕای خۆمە و تکایە خوێنەوار ئاگادار بە، ئەم کەم و کورتییەی لەم لێکۆڵینەوەی مندا هەیە، بەڵام بەداخەوە کەم لەم هاوییە مێژوونووسانە ئاگاداری ئەوەن.

- وەکو مەلایەکان وەختی خۆی دەیانگووت (والله أعلم)، هەتا ابن خلدون کە باس لە ڕووداوێك دەکات لە کۆتاییدا دەڵێ: (والله أعلم)، یەعنی مەرج نییە ئەو شتەی ئەو نووسیویەتی ڕاستبێت، ئەوە نووسینێکە بەڵێ، هەر سەبارەت بە (محمد أمین زکی) دەتوانین بڵێین ئەو هەرچەندە پسپۆری مێژوو نەبووە بەڵام بواری سەربازی نزیکە لە مێژوو، هەروەها ئەو زمانزان بووە، وە خۆیشی لە کتێبەکەی نووسیوە فەرەنسی و ئەڵمانی و چەندین زمانی دی زانیووە و سەرچاوەکانی بەو زمانانە وەرگرتووە، سەبارەت بە (شەرەفخانی بەدلیسی)ش دەتوانین بڵێین ئەو لە (بلاط)ی سەفەوییەکان گەورەبووە، و لەوانەوە فێری گرنگی نووسینی مێژوو بووە، بەڵام ئێستا..

+ ئەوەی میری بەدلیس بووە، کە مێژوونووس بووە کە مێژووی (آل عوسمانی) نووسیووە، (مەلا ئیدریسی بەدلیسی) کە باپیرە گەورەیەتی، ئەوە یەکەم مێژوونووسی دەوڵەتی عوسمانییە، کتێبێکی هەیە بە فارسی لەسەر دەوڵەتی عوسمانی لە تورکیا..

– بەڵێ، یەعنی جیاوازییەك هەیە لەنێوان ئەو هاوییانەی کە ئێستا ئێمە باسیان دەکەین، و ئەوانی پێشووتر، ئەوان زمانزان بوونە، مەسەلەن (محمد أمین زکی) چەندین وولاتی بینییوە، (شەرەفخانی بەدلیسی) لە (بلاط)ەی میرەکان گەورەبووە، لە (بلاط)ەی سەفەوییەکان ژیاوە، لەگەڵ گەورەپیاوانی عوسمانی هەڵساوە و دانیشتووە، یەعنی فەرقی هەیە لەگەڵ نووسەرێك کە لەوانەیە هەر لە هەولێر یا لە سلێمانی، دەرەوەی ئەو شارانەی نەبینییوە و کتێبێك دەنووسێ، دەمانەوێ ئەو جیاوازییە بکەی..

+ بێئەوەی ناوی ئەو نووسەرە هاوییە بەرم، پێرێ لە بازاڕ کتێبێکم بینی بەناوی (عوسمانییەکان) کە هیچ لە مێژوو ناچێت، نازانم بۆ ئەو برایە دەستی درێژ کردووە؟ خۆیشی ئەساسەن مێژوونووس نیە، نازام چۆن ئەو جورئەتەی کردووە و ئەوەی نووسیوە، کە کتێبەکەم کردەوە لە بازاڕا سەیرم کرد، زۆر دوورە لە مێژووی عوسمانی، یەك (مصدر)ی تورکیای تێدا نەبوو، ئەو (مصادر)انەی بەکاریهێناوە زۆربەی لە زمانی ترەوە هاتووە، ئەوە نموونەیەکە، و ئەوە (عینوان)ێکی زۆر گەورەیە..(عوسمانییەکان)..

– دکتۆر سەبارەت بەو مێژوونووسانەی کە مێژووی کورد دەنووسن، بەشێکی زۆریان دەرچووی یەکێتی سۆڤییەتی جارانن، ئایا ئەو لایەنە سەلبیات و ئیجابیاتی هەیە؟

+ ئیجابیاتی ئەوەیە وەختێك کوردستان کەوتبووە ژێر دەسەڵاتی ئینگلیز و فەرەنسا، یان ئەو دەوڵەتانەی کەوا وەکو بڵێیت سەربەوان بوون، وەکو حکومەتی

مەلـەکی لـە عێـراق، یـان (مـستەفا کـەمال) لـە تورکیـا، یـان (ڕەزا شـا) ئـەوان نەیانهێشت یان خوێندنی مێژووی کوردییان هان نەئەدا.. بەڵام لەو کاتە سۆڤییەت لەبـەر بەرژەوەنـدی خۆیـان ئەیانویـست میللـەتی کـورد بـۆ لای خۆیـان ڕاکێـشن هانێکی باشی قوتابی کورد و مێژووی کوردیان دا..ئەوان لە زۆر شتا پێشڕەو بوون لە نووسینی مێژووی میللەتی کورد، ئەوە جانبە ئیجابییەکەیان بوو، لەبەر ئەوەش وولاتی سۆڤیەت بەڵگەنامەکانی ئیمپراتۆریەتی ڕووسی لـە لایـە، ئـەو مێژوونووسـە سۆڤییەتیانە، لەبەرئـەوە لـە چـەند دیراسـەیەك چ لـەلا یـەن ئـەوان و چ لەلایـەن قوتابیە کوردەکانەوە کە چوون بۆ ئەوێ بخوێنن، ئەو بەڵگەنامانەیان بەکارهێناوە و خزمەتێکی باشی مێژووی میللەتی کوردیان کردووە، ئەوە ئێمە وەکو کورد ئەبێ سوپاسیان بکەین و دەستخۆشیان لێ بکەین، بەڵام جانبە سلبییەکە ئەوە شـتێکی متەوەقعـە زۆری ئەوانـە چـونکە لـە دەوڵـەتێکی شمـولی ئـەژیان، لـە دەوڵـەتێکی پۆلیسی ئەژیان، ئەویش دەوڵەتی ڕووسیای شیوعی بوو، تیۆری ئامادەیان هەبوو، ئـیتر مێـژووی کـورد بـەگوێرەی ئـەو تیۆریانـە نووسـرا، کـە تیـۆری مارکـسی، مارکسییەت هەرچەندە بیرێکـە زۆر دەوڵەمەنـدە، مـن زۆر بـەڕێزەوە سـەیری ئـەو بیرە ئەکەم چونکە بەراستی زۆ ر شتی جوانی هەیە، کە دەستکەوتی ئینسانیەتە، لە زۆر بواریشەوە لە ئیسلام و مێژووی کوردیشەوە زۆر شتی ئەگونجێ بـەڵام نـەك هەموو شتێك، زۆربەی نووسەران ی ڕووس یـان ئـەو کوردانـەی چـوونەتە ڕووسـیا کەوتنە ژێر تەئسیری ئەو تیۆرە ئامادانەوە (قەوالبی ئـەزەری جـاهز).. لەبەرئـەوە زۆر حەقایق چەواشە کرا.. ئەوە سـەلبیەتی یەکـەمی بـوو، سـەلبیەتی دووەمـیش ئەگەر بەووردی لە نووسینەکانی (کمـال مظهـر) وورد بینـەوە، هـەروەك ووتم، مـن بەڕاستی مامۆستایەکە هەموو مێژوونووسێکی کورد لە هەر چوار بەشی کوردستان ئەبێ مەمنون بێت و بەشانازییەوە باسی (مامۆستا کمال مظهـر) بکـات، بەڕاسـتی مامۆستای هەموو مێژوونووسانی کوردە، بەڵام ئـەوەش نموونەیـەك ئـەو مامۆسـتا

بەرزە وەکو بڵێی (نجم)ی مێژووی میللەتی کورد نەکەوێتە ژێر (تەئسیری) ئەو پرۆفیسۆرە ئەرمەنیانەی کە سۆڤییەتیش بوون، بەڵام هەر هەستە نەتەوایەتییە ئەرمەنییەکەیان هەبوو، تەئسیریان لێی کرد، چ ئەوانەی لەگەڵ مامۆستا کاریان دەکرد، لەو نووسینانەی وە ئەو بەڵگەنامانەی کە (مامۆستا کمال مظهر) بەکاری ئەهێنێت، بەداخەوە تەئسیری لە خوێندنەکەی کردووە، خاسەتەن لەو لێکۆڵینەوەی بە ناوی (کوردستان لە ساڵەکانی شەڕی جیهانی یەکەم).. لەوێ ئەبینی لەزۆر جەوانبا بەتایبەتی لە مەسەلەی کورد و ئەرمەنا، مامۆستا لە مەوزوعییەت و لە عیلمییەت دەرئەچێت بێ ئەوەی هەست بکات، مامۆستا لەو کاتەدا.. ئەمە تەقریبەن ٣٠ ساڵێك ٣٥ ساڵێك بەر لە ئێستا ئەو کتێبەی نووسیووە، نازانم ئێستا ڕەئی چییە! من هیوا دەخوازم مامۆستا لەسەر ئەو ڕایانە نەمابێت و ڕای تری هەبێت، چونکە بەڵگەنامەی تر دەرچووە لە خودی سۆڤییەت و لە ئەوروپا و لە ئەمریکا.. لە بەریتانیا و فەرەنسا کە وا نییە، مەسەلەن مێژوونووسێکی ئەمریکی (ستیڤان شۆ)، کە زمانی تورکی و عوسمانی زۆر بە پێرفێکتی و بەباشی ئەزانی ئەچێ لە وەسائیقی عوسمانی چوار ساڵ ئیش ئەکات. ئەگا بە چەند حەقیقەتێك کە زۆر بە پێچەوانەی (مامۆستا کمال مظهر)ە لە دەوری کورد. ئەو ئەڵێ کورد و تورکیش لە هەمان کات قوربانی بوون و چەندێ ئەرمەن کوژراوە هەر ئەوەندە کورد و تورك کوژراون لەو ساڵانەی کە ئەرمەن کوژراون و ئەو ژمارەی کە ئەرمەن ئەڵێ بەعزێ جار ئەڵێن ٢ ملیۆن، ملیۆن و نیوێك.. ئەڵێ زۆر دوورە لە واقیع، ئەو ئەچێ هەموو ئیحسائیاتی عوسمانی دێنێ، جارێ لەو کاتەدا ئەوەندە ئەرمەن نەبووە لە هەموو دەوڵەتی عوسمانی، ئینجا ئەم (مذبحة) هەموو دەوڵەتی عوسمانی نەگرتۆتەوە، بەڵکو تەنها لە حدودی ڕوسیا بوو.. ئەمە نموونەیەکە کە سەلبیەتە. بەڵێ، خۆی (دکتۆر کمال) لە بابەتی (هەمەوەندەکان و موشیری حەمەی سلێمان) لە شەڕی دەربەندی بازیان ئەو داوا ی لێبووردنی کرد

چونکە لە کاتی خۆی نووسیبووی، بەڵام لە دوایی لە نەوەدەکان دیاربوو بەڵگەنامەیەکی نوێی دیتبۆوە بۆی د ەرکەوتبوو کە بۆچوونەکەی پێشووی هەڵە بووە، ئەو لەو بابەتەی داوای لێبووردنی کرد، ئەوجا هیوادارین ئەگەر لەو بابەتەش ئەو بەڵگەنامە نوێیانەی بۆ دەربکەوێ ئەوا بە ڕایەکەی خۆیدا بچێتەوە، خۆی ئەوەش گەورەیی پیشان دەدا، ئەگەر ئینسانێك بۆی دەربکەوێت لە شتێکدا بە هەڵەدا چووە بۆچوونەکەی خۆی یان نووسینەکەی خۆ ی ڕاست بکاتەوە. (مامۆستا کمال مڤهر) ئێستا لە (لەندەن)ە من چووم بۆ عەینی (ئەرشیفی مەلەکی بریتانی لە لەندەن) ئەو لەوێیە، ئێستا من داوای مەلەفێکم کرد وتیان کوردێکی تر داوای کردووە، دوایی زانیم (مامۆستا کمال مظهر)ە و لەوێیە و لەگەڵ تەلەبەیەکی کورد یارمەتی ئەدا، هیوادارم ئێستا ئەو بەڵگەنامەی کە لەوێ دەریهێنا چەند شتێکی تری بۆ ڕوون ئەبێتەوە دەربارەی بیستەکان، کە لەکتێبەکەی کە پێویستی بە چاوپیاخشاندنەوە هەیە.

- دکتۆر سەبارەت بە ژمارەی کتێبی مێژوونووسان، جەنابت ووتت کتێبێکم چاپ کردووە و سێیەم ئامادەیە بۆ چاپ، ئێستا بۆچوونێك هەیە لە ناو نووسەرانی ئاسایی، ئەوانەی ئەکادیمی نین، لە دەرەوەی زانکۆن، ژمارەی کتێب دەکەن بە پێوەر بۆئەوەی کە ئایا ئەو مێژوونووسە مێژوونووسێکی باشە، یان نا، بەڵام (دکتۆر أحمد عوسمان أبوبکر)، کە مامۆستای من بووە، جەنابت دەیناسی، ئەویش مێژوونووسێکی دیارە، دەڵێ: "من پێم وایە هەر مێژوونووسێکی کورد لە سێ کتێب زیاتر نەنوسێ"، لەوانەیە ئەویش ڕای تایبەتی خۆی بێت، جەنابت لە ئەوروپا ئایا مەرجە مێژوونووسێك لە هەمان کاتدا کتێبی زۆر بێ، یان لە وانە ووتنەوەی لە زانکۆدا و پێگەیاندنی قوتابی و مامۆستای نوێ دەبنە پێوەر؟ کامیان پێوەرە؟ داوای لێبوردن دەکەم خۆ ی جارێك (دکتۆر شێرکۆ بابان) کە ئەو پسۆری لە زمانی کوردی هەیە،

هەرچەندە مێژوو نیە، بەڵام لە کۆڕێکدا کە یەکێتی نووسەران بۆی ساز کردبوو، ئەو ڕای وابوو ووتی: "هەر مامۆستای زانکۆ ئەرکی سەرەکی ئەوە نیە کە کتێب دابنێ، ئەرکی سەرەك پێگەیاندنی قو تابییە، ئەگەر کتێبیشی دانا ئەوە کۆششی کردووە، جێگای سوپاسە، بەڵام ئەگەر داینەنا ئەمە نا بێ گلەیی لێ بکەین. یەعنی گووتی ئەگەر لە بیست مامۆستای زانکۆ دوو مامۆستا ژمارەی کتێبیان زۆر بوو شتێکی باشە، بەڵام مەرج نیە هەموویان ژمارەیەکی زۆریان هەبێ، بەڵام لە هەمان کاتیشدا ئێمە ئەگەر تەماشا بکەین (دکتۆر کمال مظهر) لەوانەیە لە زۆربەی مێژوونووسەکانی ئەوانەی بە کوردی و عەرەبی دەنووسن، ئێمە زیاتر شارەزاییمان لێی هەیە کتێبی زۆرتربێ کە لەوانەیە هەر بگاتە (٢٥) کتێب، ئێمە ئەگەر بەراووردیان بکەین لەگەڵ هەندێك لە مێژوونووسە عەرەبەکان دەبینین ئەو ژمارەیەش زۆر کەمە، هەتا ئەوەی کە (دکتۆر کمال مظهر) نووسیتی وەکو گووتمان وئەگەر دەوروبەری (٢٥) کتێبێك هەندێك زیاتر بێت، ژمارەکە یەکجار زۆ ر نیە؟

+ بەڵێ، من شتێك ڕاست ئەکەمەوە، یەکەم یەك کتێبم دەرچووە، ئەو کتێبەش (١٦) ساڵ ئیشم کردووە ئەویش لە بازاڕە بەناوی (دراسات في الحركة الكردية المعاصرة) کە ئەبێتە زمانی کوردیش چەند بەشێکی، ئەوە دوای (١٦) ساڵ تەقریبەن نووسیوومە و بەشێکی زۆریشی (أطروحة)ی دکتۆراکەمە، یەعنی تەقریبەن (٢٠) ساڵ ئەکا بە هەمووی. ئەو دوو کتێبەکەی تریشم تەرجومەی وەسائیقە کە ئێستا ئامادەن بۆ چاپ، یەعنی هەر یەك کتێبم هەیە.

– من گووتم کتێبێکت چاپ کردووە و سێت ئامادەیە، دوو ئامادەیە؟

+ ئەو دووانەش تەرجەمەیە، ئینجا بابگەڕێینەوە سەر مەسەلەکە.. کاکە گیان بە ڕاستی باشترین مامۆستا لە ئەمریکا کە زۆر زۆر ئەتکی هەبووە (تەئسیر)ی هەبووە، لەسەر تەڵەبەکانی خۆی، ئەوانەی لە (دیراساتی شەرق ئەوسەتی)

ئەنووسن، ئەمریکا ئێستا گەورەترین مەرکەزی (استشراق)ی عالەمە، جاران ئەوروپا بوو، یەکەمجار ڕووسیا بوو، دوایی ئەڵمانیا ئەبێ، ودوایی بریتانیا، ئێستا ئەمریکایە، ئینجا ئەو شێخەی، وەکو بڵێیت (ئایەتوللای).. با بەز مانی ئەو مەنتیقەیە قسە بکەین، (دیراساتی شەرق ئەوسەتی)، (دکتۆر وادی جویدە)یە، کە باشترین تێزی دکتۆرای نووسیووە لەسەر مەسەلەی کورد، بەناوی (وادی جویدە) دیراسەکەیشی بەناوی (مێژووی بزووتنەوەی کورد)ە.. (وادی جویدە) ئەمەی لە ئەمەریکا نووسیووە (٨٠٠) لاپەڕەیە، تازە بووە بە کتێب، ناردیان بۆ گۆڤارێکی ئەمریکی بۆ هەڵسەنگاندنی، ئێستا ٣، ٤ دەزگا بەناوی ئەم دکتۆرە بەڕێزەوەیە.. (وادی جویدە) کتێبەکەی هەتا مردیش، ٤٠ ساڵ دەرسی ئەووتەوە، ئەتوانم بڵێم، ٣٠، ٤٠ دکتۆر، بەس دکتۆر، یەکێك لەوانە کە لەسەر (شێخ سەعید) ی نووسیووە (ڕۆبەرت ئۆڵسۆن) کە مامۆستای منیشە، ( ڕۆبەرت ئۆڵسۆن) هەر کتەڵەبەی ئەو (وادی جویدە)یە، کە (ڕۆبەرت ئۆڵسۆن) (٢٠، ٣٠) کتێبی لە بازاڕە، یانی چەندەهای وەك (ڕۆبەرت ئۆڵسۆن) لەژێر دەستی (وادی جویدە) دەرچوونە، سەرلەنوێ ئەڵێم ٤٠ ساڵ دەسی داوە یەك کتێبێکی بڵاو نەکردەوە، دوای مردنی ژنەکەی دکتۆراکەی وەرگرت (تێزەکەی)، ووتی بابە ئەو خ ەڵکە زۆر داوای ئەکات لێم، ئەو ئەڵێ فەسلێکم بدەرێ، بابیکەمە کتێب و دایە یەکێك کردیانە کتێب بۆی، دوی مردنی، ئەمە نموونەیەکە.. سەرلەنوێ ئەڵێم دکتۆر (وادی جویدە) یەکێکە لە (أعمدە)، یەکێکە لە (قطب)ە بارزەکانی (دیراساتی شەرق ئەوسەتی) لە ئەمریکا، چەندەها مامۆستای بەرز ئەڵێن (دکتۆر وادی جویدە) کتێب و مەقالاتیشی نیە، لە گۆڤارەکانیش تەنها ئەو (أطروحة)ی دکتۆراکەی هەیە، لەسەر کوردە، ئەمە بە نیسبەتی ئەو. ئینجا با بگەڕێینەوە (عرف)ی ئەکادیمی غەربی.. بەشێوەیەکی گشتی وا نییە، ئەوەی (وادی جویدە) کردی حاڵەتێکی تایبەتمەندی خۆی هەیە، ئەمما بە نیسبەتی ئەو مامۆستایانەی من، کە من ٣ زانکۆم کردووە بۆ دوو

ماستەرەکەم و دکتۆراکەم، بەشێوەیەکی گشتی مامۆستا دوای دکتۆراکەی ئەنووسێ لە ٣ بۆ ٥ کتێبی هەیە ئەمە وەك ئەڤریج (معدل) بە عەرەبی، ئەمە بە نیسبەتی مامۆستایە لە بریتانیا و کەنەدا کە من ئاگادارم، ئەویش لەبەرئەوەی یەکێك لە پێویستییەکانی تەرقیەکردنی لە دەرەجەیەك بۆ دەرەجەیەك، دیراساتی تازە بێ، بەڵام نەك (اجترار)* بێ بە عەرەبی، نا، جارێ جگە لە تێزی دکتۆراکەی یان (أگروحە)ی دکتۆراکەی ئەبێ دیراسەیەکی ئەسڵیتری تازەی هەبێت هەتا قبوڵ بکرێت بۆی بۆ دکتۆرا یان بۆ تەرقیە، لەبەرئەوە دکتۆر لەوێ بەشێوەیەکی گشتی ٣ بۆ ٥ کتێبی ئەبێ..لەبەرئەوە ئێمە ئەڵێین ئەبێ موازەنە بکەین، ئەگەر ڕاستیت ئەوێ من ئەڵێم یەکێ وەك (دکتۆر کمال مظهر) چەندەها تەڵەبەی کورد لەژێر دەستی دەرچوونە بوونەتە دکتۆر، یەکێك لەوانە (دکتۆر جبار قادر)ی بەڕێز کە ئێستا مامۆستایە لە کۆیە، عەمیدی کولیەی زانستە مرۆڤایەتییەکانە، ئەوە یەکێکە لەو تەڵەبانەی کە مامۆستا (کمال مظهر) مامۆستای بووە، و چەندەها تەڵەبە و مێژوونووس، ئەوانەیشی ئامادە کردووە و کتێبی باشی تر، ئەوەش ئەگەر مامۆستای زانکۆ بتوانێ هەر بەهرەکەی هەبێ ئەوە شتێکی باشە، بەڵام ئەگەر تۆ بەس ژیان بۆت تەرخانکرا بێ بەس کتێب بنووسی، ئەوەش بەهرەیەکی با شە ئەگەر بەس تەرکیز بکەیتە سەر ئەمانە.. بەڵام ژیانی لای ئێمە بەداخەوە دکتۆر ناتوانێ ئەوە بکات ئەبێ دەرس بڵێتەوە.. بەڵام بەکورتی بگەڕێینەوە سەر پرسیاری جەنابت، مامۆستا ئەبێ ئەو باڵانسەی هەبێ چونکە وانە ووتنەوە و (اهتمام)کردن بە تەڵەبە، تەڵەبەی ماستەر و دکتۆرا، هەتا تەڵەبەی سەفی یەك بۆ چوار بەکارلۆریۆس زۆر زۆر گرنگە، و ئەوەش خزمەتێکی گەورەیە بۆ میللەت، دکتۆر نابێ کەمتەرخەمی بکات بۆ تەڵەبەکانی و نا بێ کەمتەرخەمیش بکات لە لێ کۆڵینەوە ئەگەر توانای هەبێ و ئەگەر کاتی هەبێ، بەڵام هەردووکی گرنگە، بەڵام

---

* کاویژکردن.

بەشـێوەی گـشتی ئـەوەی مـن ئاگـادارم لێـی زۆربـەی پـسپۆڕانی زانکـۆ لـە لێکۆڵینەوەکانیان لەگەڵ قوتابیەکانیاندا شت فێر ئەبن، یـان شـتێك هەیـە (إلفـات نظر)یان ئەکا ئەڵێ: (با مـن خـۆم سـەیری ئـەو مەسـەلەیە بکـەم) کـە تەڵەبەکـەی سەرنجی ڕائەکێشێ بۆ ئەو مەسەلەیە، ئینجا خـۆی هەڵئەسـێ دیراسـەیەکی تـازە لەوە ئەکا، یان سوود وەرئەگرێ لەو لێکۆڵینەوەیەی کـە تەڵەبەکـەی کردوویـەتی، بەڵام کە ئەڵێم سوود وەرئـەگرێ نـەك هەڵبـستێ لێکۆڵینـەوەی تەڵەبەکـەی خـۆی بدزێ..

– حاڵەتی واش هەبووە..

+ هەیە، لە غەربیش هەیە، و لـە وڵاتـی خۆمـانیش هەیـە، ئـەم شـتانە ڕووئـەدا.. مێژوونووس...

– باشە دکتۆر لە غەرب چۆن مامەڵەی لەگەڵ دەکەن؟

+ ئەوە نابێ، لەبەرئەوەی ئەمە شتێکە بەڕاسـتی بەداخـەوە، ئـەڵێم ئـەم شـتە لـە غەربا زۆر زۆر کەمە، مامۆستا ئەوە ناکات بە هـیچ جـۆر، زۆر کـەم، حاڵـەتی کـەم هەیە، بەڵام هەیە، زۆر کەم، حاڵاتی کەم هەیـە، بـەڵام ئەمـە لـە (مالیزیـا) مـن کـە مامۆسـتا بـووم ئـەم حاڵەتـەم بینیـوە، تەڵەبـەی پاکـستانی و ئەمانـە لەکەنـەدا بینیانمە وتویانە مامۆستاکانیان ئەو شتانەیان کردووە.

– لە (مسلسەلە)یەکی میسری باسی ئەو زاهیرەیە دەکرا..

+ من ئاگاداری ئەو( مسلسلە)یە نـیم، بـەڵام ئەمـە لـە عێراقـدا لـە جامعـەی بەغـدا کراوە، ئەمە ئەکرێ لە دوەلی سێیەم ..خۆی بەراستی شتێکی زۆر زۆر ناشـیرینە، بەڵام ئەوانە هەرچەندە مسوڵمانیش نین بـەس ئـەو ڕەوشـتەیان هەیـە کـە زۆر زۆر بەرزە کە ئیسلام زۆر زۆر بایەخی پێ ئەدا..ئایەتێك هەیە باسی ئەمانەت ئەکا خوا (سبحانە و تعالی) لە قورئانا ئەڵێ: (شتی یەکێ مەخۆن، حەقی یەکێ تـر مـەخۆن، یان شتی یەکێ تر مەیکەنە هی خۆتان)، بەڵام بە خیلافـی ئـەم ئایەتـە قورئانییـە،

ئێمە بەعزێ لە دکتۆرەکانمان، مامۆستای زانکۆ، شەرت نییە دکتۆر بێ، ئەم شتانەیان کردووە لەگەڵ تەڵەبە، کردوویانەتە هی خۆیان، بەس من ئەڵێم ئەوەی من ووتم قوتابیەکە ئەبێتە هۆی ئەوەی مامۆستاکە لەو بوارە زیاتر بایەخ بدا ودوایی خۆی بچێ لێکۆڵینەوەیەکی تازە بکات، یان هەر خۆی فێر ئەبێ نەتیجەی دەرس ووتنەوە و (نمو) ئەکات و کتێب ئەنووسێت.

– دکتۆر پێت وانییە لە کوردستان نەبوونی سەنتەرێك بۆ پاراستنی دیکۆمێنتەکان، ئەوە یەك لە کەم و کورییەکانی بواری نووسینی مێژووە لێرە؟

+ بەڵێ وابزانم لەو مەقالەی بە جەنابتانم دا شتێ وام باس کرد، پار کە ئەو مەقالەم دا، ئەمە زۆر زۆر گرنگە، میللەتێ ساحێبی دیکۆمێنتی خۆی نەبێ ساحێبی دوا ڕۆژی خۆی نابێ، داهاتووی خۆی نابێ، میللەتێ (اس)ی خۆی نەبێ.. دۆکیومێنت (اس)ە.. توراسێکی زۆر دەوڵەمەندە، بەڕاستی ئەوە جێگای مەترسییە بۆ پێناسەی ئەو میللەتە، پێنارسەی میللەت ئەمڕۆی نییە، پێناسەی دوێنێیەتی و پێرێیەتی، ئەمانە هەموو جورئێکە لەم پێناسە نەتەوەییە، ئەوە زۆر زۆر پێویستە مەرکەزێکی دۆکیومێنیتیمان هەبێ، ئەو مەرکەزەش ئەبێ دەزگایەکی بێلایەن بێ، قەسدم حیزبی نەبێت، بەڵام هی میللەت بێ، ئەوانەش کە لە سەری ئیش ئەکەن.. ئەمەش زۆر زۆر گرنگە، ئەوانەش کە لەو دەزگایە ئیش ئەکەن ئەبێ پسپۆڕی ئەو مەجالە بن کە بزانن چۆن ئاگاداری ئەو دۆکیومێنت و چۆن ئەو دۆکیومێنەتانە بپارێزن هەتا نەفەوتێ، مەسەلەن لە لەندەن کە ئەچم بۆ دائیرەی (ئەرشیفی مەلەکی بریتانی) کە ئەڕۆی جارێ دات ئەنێن نیو سە عاتێك فێرت ئەکەن ئەڵێن کە ئەچی تکایە وەرەقە وا لێ مەکە، تکایە قەڵەمی حیبر مەبە یان جاف تەنها قەڵەم ڕەساس ئەبەی کە دائەنیشی، مەسەلەن من فایلێك ئەدۆزمەوە باسی ئەوە ئەکات کە چۆن شێخ مەحمود لە فلان شەڕ دا، کە گیرا

چی ئەوت، ئینجا تۆزێ (انفعال) ئەتگرێت و هەڵئەستی فایلەکە تۆزێ بە توندی ئەگریتەوە، حالەن بە کامێرا موراقەبەت ئەکەن، بەشێوەیەکی موئەدەبانە ئەڵێ: (جەنابی دکتۆر دەستت تخوا تۆزێ داگرە) تۆش هەر لەخۆتەوە شەرم ئەکەی داتئەگری.. دۆکیومێنتەکان کە ئەدرێت، هەموو خوێندەوارێك، هەموو (باحث)ێك موراقەبە ئەکرێت لەلایەن چەند موەزەفێکەوە، هەتا ئەو دۆکیومێنتە...، یان سەیری دەستت ئەکات ئایا تەڕ تەڕ نیە، یان ئەڵێ دۆکیۆمێنتەکە شۆن داومە پێت ئەبێ ئاوا بیبەستیتەوە، مەلەفەکە بەووردی بە ناسکی...، ئێمە لەبەرئەوە بەڵێ پێویستمان بەو دۆکیومێنتانەیە، ئەو دۆکیومێنتە ئەبێ سەر بە حیزبیەت نەبێ، ئەبێ سەر بە میللەتی کورد بێ، دەزگایەکی حکومی بێ ئەبێ ئەوانە هەموو دۆکیومێنتی میللەتی کورد کۆکەنەوە، ئەوانەی لە دەرەوەی وڵاتیشە.

– دکتۆر ئەوانەی دەرەوە هێنانەوەی ئاسانە یان نا؟

+ بەڵی هێنانەوەی ئەوە ئەکەوێتە سەر حکومەتی هەرێمی کوردستان، ئەبێ چەند تەڵەبەیەك ئامادە بکات یان چەند موەزەفێك لێرە کە توانای لێکۆڵینەوەی ئەرشیفیان هەیە، بیاننێرێ بۆ دەرەوەی وڵات، بچن ئەو تەڵەبانە فەترەیەك بمێنن، شەشە مانگێك کە بتوانن ئەو دۆکیومێنتانە بهێننەوە، فۆتۆکۆپیان بکەن، (طبعاً) ئەوە ئەبێ هەموو شتێکیان بۆ تەرخان بکرێت، پارە، چونکە کە بچی من لە حکومەتی کوردستانەوە هاتوومە هەموو ئەرشیفی کوردم ئەوێ، شتی وانییە، موەزەفەکە ئەڵێ من ئەوە تێناگەم کاکە، ئەگەر تۆ هەرچیت لای من موهیم نیە، موهیم بڕۆ، بۆ من ڕەقەمی وەسیقەکەم بدەرێ، ئێمە لێرە هەموو شتێکمان تەسنیف کردووە، ئەبێ بچی لە تەبویبەکە ناوەکە بدۆزیتەوە، ئەیدەیتێ، یەك یەك بۆتی دێنێ، مەلەف مەلەف، وەسیقە وەسیقە بۆتی دێنێ.. لەبەرئەوە ئەبێ حکومەتی هەرێمی کوردستان یان زانکۆکانمان خەڵك ئامادە بکەن بۆ ئەو شتەو بایەخێکی زۆریان پێبدەن بۆئەوەی بچن ئەو شتانە بێننەوە، ئەمە بە یەك باحس

دوو باحس، یەك کولیە دوو کولیە، حیزب ئیشی ئەمانە نیە، ئیشی چەند کەسێکە پێکەوە، بەس ئەگەر دەزگایەك هەبێت ئەم ئیشە بکت بەبەردەوامی بەچەند ساڵێك چەند تەڵەبەیەکمان لە پارس بێ، چەند تەڵەبەیەك مان لە ڕووسیا بێ، چەند تەڵەبەیەکمان لە بریتانیا بێ، چەند تەڵەبەیەکمان لە واشنتن بێ، بۆ ئەو وەسائیقانە، یان لە تورکیا.. من لەوێ بووم ئەتوانم بڵێم بە (أطنان)، بێ هیچ موبالەغەیەك، بە (أطنان) وەسائیقی پەیوەندی بە میللەتی کوردە ڕاستەوخۆ، من لەوێ بووم نامەکانی بە دەستنووسی (بەدرخان)م دۆزییەوە، لەوەبوو بگریم لە کەیفان، ئەمە دەستنووسی (بەدرخان)ە..!!

- ئەوانەت هێناوەتەوە دکتۆر؟

+ قسمێکی تەرجەمە ئەکەم، حالیەن، بە زمانی عەرەبی.

- بەدرخان بە چ زمانێك نووسیوویەتی؟

+ بە زمانی عوسمانی نووسیوویەتی، قسمێکیشی بە عەرەبی نووسیووە، شتێکی سەرنج ڕاکێش بوو، ئەو نامانە کە هی خۆیەتی (٢)ی بە زمانی عەرەبی نووسیووە، یەکێکی بە تورکی عوسمانی نووسراوە، هەست ئەکەم ئەوەش هەر بە عەرەبی نووسراوە تەرجەمە کرابێ، چونکە دیارە بەدرخان هەر بە عەرەبی ئەیزانێ بنووسێ ئەوەش لەبەرئەوەی خەلفییەتێکی دینی هەبووە، لە حوجرە بووە، ئینجا من ئەوە شتێکە کە ئێستا بە خوێندەواری ئێوەی ئەڵێم.. بەدرخان عیلمی شەرعی زۆر زۆر بەقوەت بووە، و تەریقەی (نەقشبەندی)یش بووە، تەریقەی سوفیش بووە، نامەیەك کە ئیحتماله ئێستا بتاندەمێ، ئەو کە شۆڕش ئەکا دژی سوڵتانی عوسمانی، سوڵتانی عوسمانی تەقەللا بۆ شێخی تەریقەت ئەبا، ئەڵێ: (تۆپێی بڵێ ئەو کابرایە موریدی خۆتانە، نامەیەکی بۆ بنووسە با واز بێنێ لەم شۆڕشە..) هیوادارم دوای ئەم چاوپێکەوتنە ئەوەت بدەمێ.

- زۆر مەمنون دەبین ئەگەر ئەم دۆکیومێنتە گرنگەمان بدەیتێ، دەتوانین لە

کۆڤارەکەش بڵاوی بکەینەوە. دکتۆر لێرە هەندێك خەڵك جیاوازی دەکەن لەو نووسەرانەی خۆیان دەڵێن عیلمانینە و هەندێکیان دەڵێن ئیسلامینە، بۆ نموونە جەنابت، هەندێك بە مێژوونووسێکی ئیسلامویت دائەنێن و لەوانەیە بەرهەمەکانیشت نەخوێننەوە، یان لەوانەیە هەر هەتا هانی خەڵکیش بدەن بڵێن ئەو کتێبە مەخوێننەوە، ئەوە حەقیقەتێکەو وجودی هەیە، ئێمە ناڵێین ئەوە ڕاستە بەڵام خەڵکەك هەیە وا بیردەکاتەوە، لەلایەکی تر دەبینین خەڵك لێرە بەشێوەیەکی گشتی ناڵێین هەموو خەڵك بەڵام تێڕوانینێکی زۆر خراپیان هەیە بۆ (صلاح الدين ئەیوبی) پێت وانییە کە ئەوە.. مەسەلەن من فیلمێکی عەرەبی هەیە لەسەر صلاح الدين ئەیوبی کە میسرییەکان دەریان هێناوە (أحمد مظهر) دەوری پاڵەوانێتی دەبینێ لەو فیلمە، من تاوەکو ئەم دواییە فیلمەکەم بە تەواوی نەبینیبوو، بە (CD) تەماشام کرد، من پێم وایە لەوانەیە زۆربەی ئەو تێڕوانینەی خەڵکی هەیانە بۆ (صلاح الدين) لەڕێگی بینینی ئەو فیلمەوەیە، چونکە لەو فیلمەدا چەندین جار، بەبێ هۆ باس لەوە دەکرێ کە (صلاح الدين) خزمەتکاری عەرەبە، لە فیلمەکەدا دەووترێت (خادم العرب).. یان ووشەی عەرەب و عروبە و (وطن عربي) و ئەوانە بەکاردەهێنرێ، پێت وانییە کە ئەو جۆرە فیلمانە کە پێویستیش نیە وابێ ئەو جۆرە (رد فعل)ەی دروست کردووە، لەلایەن کورد یان لەلایەن هەندێك لە کوردەکان؟

+ پرسیارەکەت دوو لایەنی لێك جیاوازە..

– خۆی تارادەیەکیش لەیە نزیکن..

+ پەیوەندییانیش بەیەکەوە هەیە.. بەنیسبەتی یەکەم، من وەکو عوسمان عەلی، من ئەڵێم کە عوسمان و هەموو ئینسانێك بێ لایەن نیە، من کە بە تەڵەبەکانی خۆم لە کەنەدا ئەڵێم ئەم دەرسەتان لەگەڵ من وەرگرتووە، من وانەیەك ئەڵێمەوە (تأريخ الشرق الأوسط المعاصر Counterpart Mideast politics) ئەڵێم

(I am not natural) من موحاید نیم، بەڵام.. بەڵام .. محاوەلە ئەکەم لەو بابەتانەی کە پێتان ئەڵێمەوە کە بڵێم ئەمە ڕەئی منە، ئینجا خەڵکی تریش وائەڵێ ئینجا ئەی قوتابیان خۆتان قەرار بدەن ئایا ڕەئیەکەی من وایە.. بەڵام (حدپ)ە تاریخییەکە ئەوە لەوێ مێژوونووس ئەمە ئامانەتێکی عیلمییە، (حدپ)ەکە وەکو خۆی بڵێ چی ڕوویداوە، ئینجا خوێندنەوە، ئەبێ مێژوونووس نەیشارێتەوە، هەویەی خۆی نەشارێتەوە، من لە مقدمەکەی خۆم، پێشەکییەکەی خۆم لە کتێبەکەم ئەڵێم من لە بۆچوونێکی ئیسلامییەوە، بۆ مێژووی کودی هاوچەرخ، ئەوە بۆچوونێکی ئیسلامیم هەیە،بەڵام لە هەمان کاتیشدا بەڵێن ئەدەمە خوێندەوارم ئەڵێم من محاوەلە ناکەم (مسبق) (قوالبی جاهیزی ئیسلامی) بچەسپێنمەوە سەر ئەو (أحداث)انە، نەء بەڵکو بۆ هەموو (حدث)ێك ئەڕۆم، بەگوێرەی حدیسی پێغەمبەر (ص.ع) ئەڵێ: (الحكمة ضالة المؤمن فأينما وجدها فهو أهل بها) .. یەعنی ئەڵێ حیکمە یەعنی حەقیقەت، بیدۆزەرەوە، مەسەلەن من باسی صلاح الدینم نەکردووە، بەڵام گەر بچم بۆ مێژووی (صلاح الدین) نە کوڕی مامەمە نە تەمسیلی پێغەمبەر ئەکا نە تەمسیلی ئیسلام ئەکا، نە تەمسیلی میللەتی کورد ئەکا، یەعنی من بە هیچ جۆرێك (رقبط)ێکی عاتیفیم نیە بە (صلاح الدین) تەنها ئەوەی ئەیزانم کە ئەڵێن بە ئەسڵ کوردە، هەر ئەوە ئەزانم، لەبەر ئەوە ئەمەوێ بزانم (صلاح الدين) خۆی چۆن بووە، چی بووە، ئینجا دوایی شت کە وەکو خۆی ئەڵێمەوە ئینجا، هەڵئەستم بە شی کردنەوە (تەحلیلەکان) لەو تەحلیلانە خەلفیەتی فیکرییەکەی وەکو ئیسلامییەك ڕەنگدەداتەوە، بەڵام مێژوونووس ئەبێ ئەو ئامانەتەی خۆی هەبێ بڵێ: (ئەمە من وەکو موسوڵمانێك ئەمە وا ئەخوێنمەوە، من وەکو مارکسییەك، وا ئەخوێنمەوە)، نەك ئەو بۆچوونە مارکسییەکەی ئەخوێنێتەوە بەڵام ئەڵێ ئەمە تەنها خوێندنەوەیەکە بۆ ئەو ڕوودواوە، نا، من ئەوە ئەڵێم، من ئەڵێم گەر (دکتۆری بەڕێز) ئەگەر سەیری

کتێبەکەی من بکەیت هەموو ئەو بۆچوونانەی ترم باس کردووە، ئینجا هاتوومەتە سەر بۆچوونە ئیسلامییەکە، ئەڵێم: بەڵام ئەمەش خوێندنەوەیەکی ترە، کە بە ڕاستی زۆربەی مێژوونووسانی کورد ئەم شتەیان نەکردووە، من ئەمە ئەکەم، ئەڵێم: وەکو موسوڵمانێك وەکو ئیسلامییەك ئەم بۆچوونەش هەیە بۆ ئەم (حدث)ە، ئەم خوێندنەوەیە هەیە بۆ ئەم (حدث)ە.. یەکێك لەوانە ژیانی (شێخ ئەحمەد)، عەبدوسەلام بارزانی ژیانی شێخ مەحمود یان یەکێك وەکو (سمکۆ)، (سمکۆ) مەسەلن ئەیهێنم ئەڵێم (مام جەلال) لە کتێبەکەی فلان شت وا ئەڵێت.. (دکتۆر عەبدولڕەحمان قاسملو)ی شەهید وا ئەڵێت لەسەر (سمکۆ)، بەڵام من ئەڵێم (سمکۆ) ئەمەیشی کردووە، بەڵام ئێمە بۆ ئەمانەی عیلمی ئەبێ ئەمەیشمان بووتایە، ئەم شتانەش ئەبێ بووترایە، بەڵام نەووتراوە، لەبەرئەوەی ئەو مێژوونووسەبەڕێزانە لە ڕوانگەیەکی چەپەوە نووسیوویانە.. (سمکۆ) بە کابرایەکی (إقطاعي) کۆنە پەرست و خوێنمژ ئەم شتەی کردووە و هەر سەیری ئەوە ئەکەن.

من بۆچوونەکانی ترم هێناوە لەبەرئەوەی ئەو چەپییە نەبوومە.. ئەوەش ئەڵێم.. تا ڕادەیەکیش بەڕاستی ئەزانم..

بەڵێ مێژوونووس وەك هەموو ئینسانێك هەستی هەیە و خوێندنەوەی هەیە و بیروباوەڕی (مسبق)ی هەیە کە تەئسیر ئەکا لێی لە نووسینی مێژوو، بەڵام چەندێك مێژوونووس ئاگاداری ئەو شتەی بێت ئەوەندە نزیکتر ئەبێت لە حەقیقەت کە بە ئەمانەتیش بە خوێندەوار ئەڵێت.. ئەڵێت من وای ئەبینم بەڵام خەڵکی تریش بەشێوەیەکی تر ئەیبینێ.. خوێندەواری بەڕێز خۆت ئاگاداری ئەم شتانە بە..

بە نیسبەتی.. بێینە سەر (صلاح الدين) .. ئەمە.. بە نیسبەتی (صلاح الدين) .. ئوەلەن هەڵەیەك هەیە ئەمە زۆربەی مێژوونووسە هاوییەکان یان ئەوانەی کە ئەخوێنن لە مێژوو نازانن، گرنگی هاوچەرخ نازانن بە عەرەبی ئەڵێن (سیاقی

تأریخی) بە ئینگلیزی ئەڵێن (historical context ) ئەوە نازانن چی ئەکەن، وەڵا صلاح الدین هیچی بۆ میللەتی کورد نەکردووە، ئەوەلەن ئەمە طبعاً خوێندنەوەیەکی هاوچەرخی ئەمڕۆیە بۆ (حدث)ێك کە لەسەدەی یازدەم و دوازدەم..

– خۆی عەرەبەکان وایانویستووە بۆ بەرژەوەندی خۆیان کوردەکەش..

+ بەڵێ من دێمە سەر ئەوە.. ئەمە جارێ ئەوەلەن ئەوەی کە کورد ئەیخوێنێت، کە من باسی ئەو نموونەیە ئەکەم، ئەڵێم: کورد ئەڵێ بزانە ئەوە (صلاح الدین) هیچی نەکردووە لە خزمەتی عەرەب بووە.. ئەم کوردە بۆچی ئەگاتە ئەم حەقیقەتە:

یەکەم، هەڵەیەك هەیە کە ئێمە لە مێژوو نازانین و لە سیاقی (صلاح الدین) نازانین لە چ سەدەیەك بووە..

– داوای لێبووردن دەکەم دکتۆر ئەگەر قسەکەشت دەبڕم.. بەڵام پێت وانییە ئەوە جۆرە تەمبەڵییەکی خوێنەری کوردیشە، یەعنی ناچێتە سەر (مصادر)ە ڕەسەنەکان بیخوێنێتەوە، سەیری فیلمێك دەکات یان مقالەیەك یان کتێبێکی کە هاوییەك دەینوسێ، جارێك ڕۆشنبیرێکی میسری لە یەکێك لە کەناڵە ئاسمانییەکان دەیگووت خەڵك لە وڵاتە عەرەبییەکان بۆیە دەبووە مارکسی لەبەرئەوەی ئاسان بوو، مەسەلەن ئەو بەبیروبۆچوونی خۆی دەیگۆ.. کەسێك لەماڵی خۆی دانیشتبوو کە جیرانەکەیان بەشەڕ دەهاتن ژنەکە و پیاوەکە، ئەو دەیگووت من دەزانم سەبەبەکەی چییە، .......... کاتێك سەیارەیەك لە شەخسێکی دەدا لە شەقامێکی دەیگووت.. من دەزانم سەبەبەکە .......... ، یەعنی ئەو پێی وابوو بە زانینی یەك ووشە دەتوانێ هەموو جیهان لێکبداتەوە.. لەوانەیە هەر لە مارکسییەتەکەش نەگەیشتبێ، بەڵام پێی ئاسان بوو، ئەوجا لەلای ئێمەش خەڵك ناچێ لەدوای سەرچاوە ڕەسەنەکان

مێژوونووسە ئەکادیمییەکان بگەڕێ.. مەسەلەن لە ووتارێکەوە ئەو (صلاح الدین) دەناسیێ، یان لەڕێگەی فیلمێکەوە.. بەڵێ..

+ ئەوەی جەنابیشت ئەیڵێی زۆر ڕاستە، بەڵام کە من ویستم.. هەر (حدث)ێك، هەر ڕووداوێك سەیری سیاقە تاریخییەکەی بکەیت لە فەراغێکدا نییە، لە بۆشاییەکا نیە، لە شتێکا مەوجود نیە، مەسەلەن کە سەدەی (صلاح الدین) یازدەهەم و دوازدەهەمە سەیر ئەکەم.. سەدەی یازدەهەم.. لەو کاتەدا ململانێ ئاینییەکان هەبووە.. ئیمپراتۆرییەی ئیسلام بەرامبەر (صلیب)ی غەربی، وانییە لەو کاتەیا دەولەی مەمالیك هەبووە، (صلاح الدین)، مامەی صلاح الدین لای نوردەین زەنکی بوونە، کابرایەکی تورك بووە، ئەویش وەك تورکێ خۆی تەعریف نەکردووە، وەکو سەلجوقی وەکو بەتەڵێکی ئیسلام خۆی تەعریف کردووە، هەر کەس نازانێت تورکن، لەناو کورد باوە کە (نورەدین زەنکی)یش کوردە، خۆی وانییە تورکە، نورەدین زەنکیش خەڵکی سوریایە، زۆربەی سورییەکان ئەڵێن ئەمە قیادەی عروبە و سیفەتی عروبەی ئەدەنێ، کابرایەکی تورکە نە عەرەبە و نە کوردە، ئەو حەقائیقانە هەیە، ئینجا دوایی یەك نوقتەیەك، سیفەتی جاش، ئەوەیە ئەبێ بە بیروباوەڕ، ئیمانی ئەگۆڕێت یانیش بە پارە ئەبێتە نۆکەری یەکێ تر، (صلاح الدین) بە بیروباوەڕ موسڵمان بووە، فیکری عروبی نەبووە، (کلمە)ی عروبەی نەزانیووە چی یە، عەرەب نەیزانیووە، مەسەلەی عەرەب، صلاح الدین لە خزمەتی بیروباوەڕێك بووە کە خۆی قەناعەتی پێی بووە، موسڵمان بووە، موجاهید بووە لە شاخەکان بووە، لە خەیمەکان بووە، تەقریبەن زۆربەی ژیانی نەیتوانییوە بچێت بۆ حەج، هەموو ساڵێك کە موسڵمانەکان چوونە بۆ حەج ئەو دانیشتووە گریاوە لەگەڵ حاجییەکان ووتویەتی هیوادارم بتوانم بچم، بەڵام ناتوانم بڕۆم لەبەرئەوەی

خەریکی ئەم خەباتە پیرۆزەم بۆ ڕزگارکردنی (بیت المقدس) کە (بیت المقدس)یش ماڵێك بووە هەموو کوردێکی موسوڵمان بە قیبلـەی سـێیەمی خـۆی دانـاوە، ئەمـە بەنیـسبەتی ئـەم، دوایـی کابرایـەك هەیـە، کـە سـیرەی زاتـی (صـلاح الـدین)ی نووسیووە، کابرایەکی سورییە و لەگەڵ صلاح الـدین بـووە، ئـەڵێ: (حـدث)ێـك لـە کیتابەکەی باس ئەکا (سیرة یوسف صلاح الدین) ئەو کتێبە لە بـازاڕە و کڕیوومـە، ئەڵێ: جارێك صلاح الدین دانیشتبوو برازاکـەی هاتـە ژوورەوە ووتـی: وەرە وەرە، گووتی ئەوە بۆ ئەم زوڵفەت وا درێژ کردووە؟ نازانی ئەمە عـادەتی ئێمـە نیـە، تـۆ ئەزانی ئێمـە کـێین، ئێمـە کـوردین، ئەمـە عـادەتی تورکەکانـە، بـڕۆ بتراشـە، ئـەو کابرایە کە عەرەبە ئەم شەهادەیە لە صلاح الدین لە سیرەکەی نقل ئەکات، صلاح الدین ئیعتیزازی بەوە کردووە زۆربەی (ولاّة)ی تـورك و فـورس لـە سـەدەی یـازدە هەتا نۆزدە سیلسیلەی شەجەرەی دوایان بـۆ خۆیـان دانـاوە کـە عـەرەبن، صـلاح الدین ئەوەی دانەناوە، صلاح الدین هەر خۆی بە کورد زانیووە هەتا ئـەخیری ڕۆژ، ئەمـە یـەك صـلاح الـدین، نـەك تـەنیا جـاش نـەبووە، هـەتا ئەگـەر مەنـصەبی سوڵتانیشی هەبوو، نا، صلاح الدین و خزمـەکانی و براکـانی قیـاداتی جـەیش نـەك بەس لە مەنـصەب، زۆربـەی ئـەو دەوڵەتانـە لـەژێر حـوکمی ئـەو عائیلەیـە بـووە، لەبەرئەوە صلاح الدین نۆکەری کەس نـەبووە، وەجەیـشەکەی (صـلاح الـدین)یـش عەرەب نەبووە، جەیشەکەی بەشێکی کوردە، بەشێکی تورکە، بەشـێکی عەرەبـە، یەعنی عەرەب هەر لەو کاتەیا وجودی نیە وەکو قوەیەك هـەتا لـە جـەیش یـان لـە قیادە، قیادەکەش عەینی شت، تەوزیعە، زۆربەی بڕۆ مەعرەکـەی (حطـین) وەکـو شەڕێك بڕۆ بیخوێنە زۆربەی سەرکردەکانی ئەو شەڕە کـوردن، لەبەرئەوەسـیفەتی نۆکەری بە هەموو موعایری مـەنتیق و ئەمانـە لێـی دوور ئـەکا، ئینجـا بێینـە سـەر

ئەوەی بۆچی وای لێهاتووە؟ یەکەم سەبەبی ئەوەیە عروبیەکان کە ئەمانەش بەڕاستی زاهیرەیەکی تازەن، لەدوای حەربی عالەمی یەکەم، تەقریبەن لە سەدەی تۆزدەیەم، فیکری عروبی هات، دوای حەربی یەکەمی جیهانی دەستیان کرد بە دەستنان بەسەر هەموو مێژووی ئیسلام کە بیکەنە موڵکی خۆیان، ئیتر هەموو موسڵمان و هەتا ناو (تراث)ەکەیان نا (الحضارة العربية الأسلامية) ئەوەلەن موسڵمانان برۆ کە ئەچنە دوو شەڕی زۆر زۆر گرنگ یەکێك لەوانە شەڕی قادسیە، کە ئەچنە پێش خۆیان وەکو موسڵمان تەعریف ئەکەن، وەکو عەرەب، لە هەمان کات شەڕی (یەرموك) هاتوون ئەڵێن ئێمە دینی ئیسلاممان هێناوە، ئەمەیە ئیسلام، باسی عروبە ناکەن وە شەڕیانیش لەزۆر شوێن لەگەڵ عەشایەری عەرەبییە، عەشایەری عەرەبی لەگەڵ دەولەی.. بەعزە عەشایەرێکی هەبووە لەگەڵ دەولەی ڕۆمی بێزەنتیان بووە، بەعزە عەشایەری عەرەبی مەسیحیش هەبوون.. لەبەرئەمە ئەوە هیچ عەلاقەی نیە بە عروبەوە وەزۆربەی عەشایرە عەرەبەکانی مەدینەش و مەککەش دژی ئیسلام ئەبن لەبەرئەوە مەسەلەکە وەکو فیکرێکی عروبی نییە، بەڵێ ئەوە تەئسیری جەزیرەی عەرەبی لەسەرە و تەئسیری ئەدیانەکانی تریشی لەسەرە، کە عەلاقەی بە عروبەوە نیە، بەڵام فیکری عروبی تازە کە زۆربەی هەڵگرەکەیشی موسوڵمانیش نین مەسیحی و یەهودین، ئەم (تراث)ەیان دەستهێنایە سەر بە ناهەق، کردیانە (تراث)ی خۆیان، ئینجا (من ضمنه) صلاح الدين، صلاح الدينيان کردە قائیدی عروبە، ئەمە شتێکە ئەساسی مێژوویی نیە، بەڵام من بە تەجروبە چوومەتە چەند دەوڵەتێکی عەرەبی، لە کەنەدا ، لە ئەمریکا، لە ئەورووپا، چوومەتە هەرچی وڵاتێك لە عەرەبەکان، ووتوومە کورد، ووتوویانە نا.. صلاح الدين لە ئێوەیە، لەبەرئەوە ئەم حەقیقەتە لە عالەمی

عەرەبیش تەواو بووە کە هەموو کەسێك ئەزانێت (صلاح الدین) کوردە، بەڵام کتێبیش هەیە عەرەبییە ڕەگەز پەرستەکان ئێستاش ئەڵێن عەرەبە، تورکەکان کتێبیان دەرکردووە ئەڵێن صلاح الدین تورکە، بە تورکی خوێندوومەتەوە، چونکە بەداخەوە ئەوان مێژوونووسە عەرەبە ڕەگەز پەرستەکان، تورکە ڕەگەز پەرستەکان ئەوەندە دژایەتیان بەرامبەر میللەتی کورد نەشر کردووە، کە شتێکی باش هەبێت کورد بیکا ئەبێ کورد نەبێت ئینجا ئەمە (فهمی الهویدی) باسی ئەکات لە کیتابی (الأکراد یتامی المسلمین) کە ئەڵێت (کورد یان خائینە یان بێ عەقڵە یان دواکەوتووە، یان شتێکە) دواتر ئەڵێ (بەڵام کە دێینە سەر صلاح الدین، ئەبینن ئەمە کابرایەکی عەبقەرییە و نە خائینە و خزمەتی ئیسلامی کردووە، ئەڵێ هیچ چارەیەکیان نامێنێ، ئەڵێ ئەبێ لەبەرئەوە لە کوردایەتی دەریکەن بیکەنە عەرەب) ئەمە جوانترین تەحلیلی برایەکی میسرییە کە ئەویش عەرەبە، ئەڵێ ئەمەیە مەسەلە ئەمە بە نیسبەتی ئەو فیلمەش، هەتا کە هەر فیلمێك دەرئەچێ جانبە تیجارییەکەی هەیە، ئەبێ موراعاتی حەقائیقی ئەمڕۆ بکەن، ئسلوبی خیتابی ئەم زەمانە بکەن، ئەیەوێت فیلمەکە ڕەواجی هەبێت، عروبە هەیە لە ساحە، ئەبێ باسی عروبە بکات، ئەبێ (صلاح الدین)یش بکاتە، بەخوا (شکسپیر)یشت بوێ ئەیکاتە (شێخ زوبێر)، ئەمانەش ئەکا و بە (صلاح الدین) ئەو (تعدی)یە ئەکرێ.

(صلاح الدین) ئاخر ووشەم ئەوەیە ئێمەی کورد ئەگەر بزانین ئا ئەو حەقیقەتەش هەیە، زۆربەی ڕۆژهەڵاتناسەکان کە باسی زۆر قائید و سوڵتانی دوەلی ئیسلامی ئەکەن ئەڵێن ئەمە خوێنمژ بووە، ئەمە کابرایەکی خراو بووە کە دێینە سەر صلاح الدین (من ضمنهم) (مینۆرسکی) کە زۆر دۆستی کوردە کە باسی ئەکا، نەك بەس هەر مینۆرسکی ، زۆربەی ڕۆژهەڵاتناسەکان کە باسی صلاح الدین

ئەکەن، باسی ئەکەن کە کابرایەکە ئەخلاقێکی زۆر زۆر بەرزی هەبووە، ئەڵێن: کابرایەك بوو عادل بوو، ڕاستگۆ بوو، زیرەك بوو، عەبقەری بوو، عەسکەری، ئیداری، طبعاً (کُتابی) عەرەبی ئەوانەی کە وا بیری تەسکی عروبیان نیە کە باسی ئەکەن ئەڵێن لە مستەوای خولەفای ڕاشیدین بووە، لە تەقوا و لە زیرەکی و لە خوا پەرستی، بەس ئەمانە نەبوونە (صلاح الدین)یان تەشویش کردووە، چەند موفەکرێکی زۆر گەورەی کوردیش عەینی قسەکانی ئەهلی عروبەیان تیکرار کردۆتەوە، هەستاون ئەم قسانەی کە عروبییەکان ئەیلێن بەسەر صلاح الدین ئەوانیش بەشێوەی گشتی عەینی قسەیان کردۆتەوە، چی ئەڵێن، لە جیاتی ئەوەی بلێن نا (صلاح الدین) وانەبوو ووتوویانە بەڵێ صلاح الدین جاش بووە، چی کردووە بۆ میللەتی کورد، هەستاوە (ڕەقیب)ی کوشتووە، (ڕەقیب)یش برازای (صلاح الدین)ە، ئەوە نە حەقیقەتە، (صلاح الدین) هیچ برازایەکی ناوی (ڕەقیب) نیە، (صلاح الدین) پیاو کوژ نەبووە و (ڕەقیب)یشی نەکوشتووە، بەڵام ئەم قسانە ئەکرێت هەتا خوێندەوارێکی یان بینەرێکی کورد ئەو فیلمە ببینێ یان ئەو قسانە بژنەوێ لە نووسینەکانا (رد فعل)ی ئەبێ بەرامبەر بە کەسایەتییەك کە زۆر زۆر ئەبێ ئیعتیزازی پێ بکات، ئێمە میللەتی کورد، پێنج وەك (صلاح الدین)مان نییە بلێین ئەمە بابڕوا، میللەتانی تر ئەچن خەڵکی تر ئەدزن ئەیکەنە هی خۆیان، ئێمە یەکێکمان هەیە بێوێنە لە زیرەکی لە قیادەی عەسکەری لە زیرەکی، حوکی هەموو جیهانی عەرەبی و ئیسلامی کردووە و ئێمە دێین ئەڵێین نا ئەمە لە ئێمە نییە، لەبەرئەوەی بۆ ئێمە دەوڵەتی نەکردووە..

کاکە دەوڵەتی تورك ئەم دەوڵەتە عوسمانییەی کە هەتا ١٩٢٤ ئەمە (کلمە)ی تورك، بەرلەوەی (ئیتیحاد و تەرەقی) بێتە حوکم (کلمە)ی تورك یەعنی (ڤەحشی)

بە عوسمانی بە یەکێکت بگوتبایە (تورك) یەعنی ئیهانەت ئەکرد، یەعنی وەحشی یەعنی (متخلف)، ئینجا (مستەفا کمال) کە دێتە حوکم ئەڵێ: (ئێمە لەبیرمان ناچێت لەوەختی عوسمانییەکان بە تورکەکانیان ئەووت فەحشی) یەعنی (وەحشی) بە عەرەبی.. بە تورکی پێی ئەڵێن (فەحشی)، یەعنی دواکەوتووە، چۆن لە قورئاندا بەو عەرەبە دواکەوتووانە ئەڵێ (أعراب).. کەلیمەی تورکی لە دەولەی عوسمانی یەعنی دواکەوتوو.. ئەمە بوو تورك، دەولەی عوسمانی دەولەی تورکی نەبوو، زۆربەی قیادیەکانیان ئینکشاری بوون، بەس عائیلەی حاکم بە ئەسڵ تورك بوون، ئەوانیش داکیان زۆربەیان تورك نەبوو.. ئینجا وەرە بە نیسبەتی دەولەی سەفەوی.. ئەڵێن، زۆربەی کورد مێژوونووسانی .................. ، ئەڵێن فارس دەوڵەتی بۆخۆی دانا، تورك بۆ خۆی دانا، کورد بۆ خۆی دانەنا.

ئاخر واش نیە دەوڵەتی ئێران کێ دایناوە؟ سەفەوییەکان دایاننناوە، سەفەوییەکان بە گوێرەی ئەوانەی کەوا زۆر زۆر (متخصص)ن یەکێك لەوانە ناوی (ڕۆجەرز سەیفەری)یە، کە مێژوونووسێکی ڕۆژهەلاتناسی گەورەی (سەفەوی)یە، کە وەکو بلێیت (ئایەتوڵا)ی مێژووی سەفەوییەکانە، هەموو عولەمای مێژووی سەفەوی ئەچن بۆ لای ئەو کابرا ئینگلیزە کە لە ئێران دانیشتووە، (١٠) ساڵ چی وەسائیقی دەولەی سەفەوی هەمووی دەرکردووە، ئەڵێ: (ئەمە کوردن و دوانزە عائیلەی دەوروپشتی ئیسماعیل سەفەوی بوونە، ئەمانە تورکن، قزلباش عەشایەری تورکی شیعەن، ئەو دەوڵەتەت کە ئێستا ئێرانە عائیلەیەکی کوردی دایناوە، وەکو دامەزرێنەر، وەکو عائیلە و دوانزە عەشیرەتی تورکی، لەو کاتەیا سەرلەنوێ ئەگەڕێنەوە، کەس فیکری دەولەی قەومی نەبووە، مەسەلەی دین

بووە، ئەوان شیعە بوونە، عائیلەی سەفەوی، باپیرەی گەورەیان بۆتە شیعە، چوونەتە (ئەردەبیل)، کوردستانیان جێهێشتووە و چوونەتە (ئەردەبیل)، بەداخەوە (دکتۆر ڕۆجەر سەیڤەری) ناڵێت لە چ شارێکەوە هاتوون بەس ئەڵێت لە غەر بی ئێرانەوە هاتوون، کوردن.. موهیم بۆتە شیعە، لە ئەردەبیل بووە ئەو دەوڵەتەی داناوە بۆ ئێران کە دوای سەفەوی هەموو ئەساسی ئێران دائەنرێ، دوایی (نادرشا) دێ بەشێوەیەکی کورت، دوایی (محمود ئەفشاری) دێ، دوایی (قاجارییەکان) دێن، دوایی (محمد ڕەزا شا) محاوەلە ئەکا بیکاتە دەوڵەتێکی (پارس) زمان فارس، ئینجا (محمد ڕەزا شا) و (ئەنکیشارییەکان) و (قاجارییەکان) ئەوانیش تورکن، عائیلەی (محمد ڕەزا شا) لە عائیلەی (پەهلەوی)یان پێ ئەڵێن، تورکن خۆ من ناڵێم نابێ دەولەی هەبێ، ئێستا من یەکێکم لەوانەی ئەڵێم بۆچی لە دەوروپشتمان مادام دەولەی نەتەوە هەیە و مادام میللەتی کورد ئەچەوسێننەوە و کورد ناتوانێ سەربەست بژی، کوردیش هەقی هەیە ئێستا دەولەی نەتەوەیی خۆی هەبێ، ئەمە شتێکە کە ئەمڕۆ باس ئەکەین، ئەمە شتێکە ئەمما صلاح الدین ئیتیهام بکەین، یان یەکێ وەك (کەریم خان)، (کەریمخانی زەند) دەولەی ئێرانی نەکردە دەولەی کودی، (کەریمخانی زەند) لە وەختێ هاتووە، مەسەلەی بیری نەتەوەیی کوردی نەبووە، جا ئەویش (کەریمخانی زەند) شاهی هەموو ئێران بووە، ئیتر لەبەرئەوە، ئەمە مەسەلەی (صلاح الدین)ە، کورد زوڵمی لێ کردووە، عەرەبیش زوڵمی لێ کردووە، بەڵام (صلاح الدین) لەوە گەورەترە چەواشەی لێ بکرێت.

- بەڵێ دکتۆر سوپاست دەکەین، ئێمە سودێکی زۆرمان بینی لەم قسانە بێگومانین کە خوێندەوارانیش سوودێکی زۆر دەبینن، ئێمە هیچ پرسیارمان

نەماوە ئەگەر جەنابت شتێکت هەبێت؟

+ مـن هـەر ئەوەنـدە ئـەڵێم داوای سـەرکەوتنتان بـۆ دەکـەم لـە گۆڤارەکـەتان، کۆڵمـەدەن، ئێـوە پێـشەنگی ئـەو نیـشەن، دائیمـەن بـەدوای ڕاسـتیدا بگـەڕێن، ڕاسـتیش ئـەبێ هـەموو مێژوونووسـێك ئـەبێ وا بینوسـێ، ڕاسـتیش مەسـەلەیەکی (نسبی)یە.. بەڵام زۆر بایەخ بە بەڵگەنامە بدەن، ئەوە ئاخیر قسەی منە.. مێـژوو بێ بەڵگەنامە زەحمەتە.

" تێبینی : ئەم چاوپێکەوتنە پێش چوار ساڵ لەلایەن دکتـۆر محمـد عبداللـە کاکە سوور و نەرۆ زەندی لەگەڵ د. عوسمان عەلی، لـە ڕێگـەی ڕیکـۆردەر کرابـوو، لەلایەن رفیـق رحمـان مـام خولـەوە نووسـراوەتەوە. هـەموو ووشـە عەرەبییـەکان وەکو خۆی دانراونەتەوە."

# پ.د. کەمال مەزهەر ئەحمەد- باوکی مێژوویی نەتەوەی کورد "کورتەیەك لەژیان وبەرهەمەکانی مێژوونووسێك"

ن: ئامانج نازم بیجان

## پێشکووتن

ڕاستی لێرەدا ناتوانین بەئاسانی قسەوباس لەمەڕ ئەم نێونیشانەدا بکەین،بە تایبەتی لەووتارێکی وەها کوورت وپوخت دا کەزیاترخۆی لەگەشتێك دەبینێتەوە بە نێو ژیان وبەرهەمەکانی مێژوونووسی گەورەی کورد(پ.د.کەمال مەزهەرئەحمەد)، بەلأم لەگەڵ بوونی ئەمەش بابەتێکی زۆرگرنك وپێویستە وە لەهەمان کات داجێگە ی بایەخ وئاوڕدانەوەشە،چونکی ئەم جۆرە کەسایەتیانە لەهەربوارێك داکاربکەن، دەستەبژێرن وخەڵکی ئاسایی نین،ئەم جۆرە مرۆڤانە تەواوی تەمەنی خۆیان بۆ زانست وخزمەتی مرۆڤایەتی ونەتەوەکەیان تەرخان دەکەن، جا نەتەوەی کوردیش وەکو باقی نەتەوەکانی تری دونیادەبێ شانازی بەوەوە بکات کەسایەتییەکی وەها ی تێداهەڵکەوتووە،وەهەروەهانرخ وبەهای بزانێت وبەباشی ودروستی مامەڵەی لە گەڵ دابکرێت چ لەگەڵ خودی خۆی چ لەگەڵ نووسین وبەرهەمەکانی،بشێ زۆردیدا ری هەمەجۆری لەگەڵ داکرابێت،بەلأم دەکرێ بڵێین جگە لە کەسانی شارەزا لە مێژوو،بەدەگمەن نەبێت کەسی تر ناتوانێت بەباشی ئەم پیاوەبدوێنێ!سەیرلەوەدا یە ئەم مێژوونووسە گەورەیەی کورد چ خۆی و چ بەرهەمەکانی هێندە لەدەرەوەی کوردستان و وولأتانی دەرەوە نیوّوناوبانگی هەیە وبەرزنرخیندراوە، ئەوەندەلە کوردستانداگرنگی وبایەخی

پێوستی پێنەدراوە !هیچ لەخوێنەرناشارمەوەکەوادە مێکە بەنیازم بابەتێکی وەها لەبارەی ئەم مێژوونووسەی سەرەوەدا بنووسم،بەتایبە تی پاش ئاشنابوونمان بە بەرهەمەکانییەوە،جابۆیـــە لێرەدابـــەم شـــێوەیە ناونیـــشانەکە مـــان هەڵبژاردووە،((پ.د.کەمال مەزهەرئەحمەد-باوکی مێژوویی نەتەوەی کورد))-(کورتەیەك لەژیان وبەرهەمەکانی مێژوونووسێك)،کەلەسێ کورتەباس پێکهاتووە کە تێیدا سەرەتا کورتەباسێکی ژیانی نێوبراوومان کردووە،وەپاشان هاتووین خوێنەرمان بەبەرهەمەکانییەوە ئاشناکردووە،وەدوا باسیش تەرخان کراوە بۆ چەند سەرەنجێك لەمەڕ ژیان وبەرهەمەکانییەوە.لەنووسینەوەی ئەم بابەتەش داپشتمان بە چەندین سەرچاوەبەستووە،کە گرنگترینیان کتێبی(مێژوو) وەهەروەها(بستێکی خاکی کوردستان بەهەموودونیاناگۆڕمەوە)کەهەردووکیان بەرهەمی(پ.د.کەمال مەزهەرئەحمەد)ە،وەئەوبەرهەمانەش کەواخراونەتە ڕوو زۆرینەی زۆریان لەبەردەست دابووە وتەماشاکراوە.ئامانجی ئێمە لێرەدا تەنها ئەوە بووە کەوا چەند تیشکێك بخرێتە سەر ژیان وبەرهەمەکانی نێوبراوو،نەك خوێندنەوە وهەڵسەنگاندنییان ، جابۆیە لەکوتایی دائومێدەوارین توانیبێتمان لەکارەکەماندا سەرکەوتوو بووبین،وە دەبێت خوێنەریش بەچاوی لووتفەوە بڕوانێتە ئەم بابەتە،وەلەهەمووشی گرنگتر بە لامانەوە خودی (پ.د. کەمال مەزهەرئەحمەد)ە،کە هیوامان وایە لەهەڵە وکەم وکو رتییەکانمان ببورێ و لێرەش دا دیسانەوە وەك و باوك تەماشای بکات.

## پ.د.کەمال مەزهەرئەحمەد- باوکی مێژوویی نەتەوەی کورد

### کورتەیەك لەژیان وبەرهەمەکانی مێژوونووسێك

أ- پوختەیەك لەژیانی:

لەڕۆژی (١٤) ی شوباتی ساڵی(١٩٣٧)دا،لەبنەماڵەیەکی خەڵکی سلێمانی،لە ئاغجەلەری سەر بەلیوای کەرکوك،کەسایەتییەك دێتە دونیاوە بەنێوی (کەمال مەزهەر ئەحمەدحاجی ڕەسول)، نێوبراوو وەك و زۆرینەی منداڵە کوردەکانی تری ئەوسەردەمە،دەخرێتە قوتابخانە وخەریکی خوێندن وزانست وپەروەردەی باش ودروست دەبێت،تەواوی قۆناغەکانی خوێندنی لەشاری سلێمانی تەواوکردووە،بەلاّم ساڵی (١٩٥٣) کەئەوکات دەردەچوو بۆپۆلی چوارەمی ئامادەیی،باوکی کۆچی دوایی دەکات، کەبێ گومان ئەمەش کاریگەری خۆی هەیە ورەنگدانەوەی دیاروبەرچاووی دەبێت،بەلاّم دیارە نێوبراوو تاڕادەیەکی باش توانیوویەتی بەسەر ناخۆشی ونەهامە تییەکانی ژیان دازاڵ بێت،یاخود زانیوویەتی بەباشی وڕێکی مامەڵە لەگەڵ ڕووداوە کا نی ژیانی دابکات،هەربۆیە بەردەوام دەبێت لەسەرخوێندن ودرێژە بەگەشتی زانستی خۆی دەدات و بێ وچان خۆی تەرخان دەکات بۆ کاری زانستی،وەشایانی باسە یەکەمین ووتاری لەنەشرەیەکی قوتابخانەدا بلاّوکردۆتەوە کەوا بەدیواردا هەڵدەواسرا،وەنێوی لێ نابوو(بمخوێننەوە) کەتێیدا باسی ماموستاوئەرکەکانی کردووە کەواچۆن ڕێکابە قوتابیان نیشان دەدەن،کەئەرکی پەروەردە و فێرکردنییان گردۆتە ئەستۆ،(کەمال مەزهەرئەحمەد) لەساڵی (١٩٥٥) دا لە (بەشی مێژوو)ی زانکۆی بەغدا لە(دارالمعلمين العالی)دا وەردەگیرێت،وە بۆ ماوەی چوارساڵان لەم زانکۆیە دا دەباتە سەر و بەباشی و سەرکەوتوویی کارەکانی خۆی ڕادەپەڕێنێت، هەر بۆیە لە ساڵی(١٩٥٩)دا بە پلەی شەرەف لە کۆلێجی ئادابی هەمان زانکۆدا بڕوانامەی بەکالۆریۆس لە زانستی مێژوو وەردەگرێت،وە پاشان ڕەوانەی یەکێتی

سۆڤییەت دەکرێت کە لەگەڵ گروپێکدا بووە، بۆبەدەست هێنانی بڕوانامەی دکتۆرا،جابۆیە لە یەکێتی سۆڤییەتیش ماوەیەك ژیان دەگوزەرێنێ،وە لە ساڵی (١٩٦٣) دا بڕوانامەی دکتۆرای لەمێژووی هاوچەرخی کورد وەردەگرێت،وە تێزی دکتۆراکەشی بەم ناو نیشانە بووە، ((بزافی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی لە کوردستانی (باشوور)عێراق لە ساڵانی ١٩١٨-١٩٣٢))، سەرپەرەشتی کردنی ئەم نامەیە کەوتبووە ئەستۆی (د.ڕەحیمی قازی)،ئەم بەرهەمەی نێوبراوو کاریگەری و ڕەنگدانەوەیەکی باشی هەبووە بۆ ئەو کاتە،وە دەنگدانەوەیەکی وەهای دایەوە کەوابوو بەجێی مشتومڕو باس و خواسی زۆرێك لە مێژوونووسان، وەهەروەها زۆریشی لەبارەوە نووسراوە، هەرئەمەش وایکرد کەوا لەساڵی (١٩٦٧) لە (باکۆ) وەکو کتێب بەزمانی ڕووسی چاپ و بڵاوبکرێتەوە،واپێدەچێت ئەمە یەکەم بەرهەمی بێت کە بەشێوەی کتێب بڵاوبکرێتەوە، کە بەزمانی ڕووسیش چاپکراوە،وە لەپاش ئەم کارەیشیدا (د.کەمال مەزهەر) هەر بەردەوام بووە لەو گەشتەی کە دەیەوێت زیاتر قووڵ بێتەوە لەدونیا ی زانستی مێژوودا،جابۆیە هەر ئەم حەزوئارەزووەی وایلێکرد کەپاڵی پێوەبنێت کەوا بۆ ماوەی (٦)ساڵ بە تێزی دکتۆرای دووەمی خەریك بێت، کە بڕوانامەی دکتورای دووەمییەتی کە بریتی یە لە (ناووك)- ( سی ێس دی))،ئەوەندە بەندە ئاگادار بێت ئەم بڕوانامەیە هەموو کەسێك ناتوانێت بە سووك و ئاسانی بەدەستی بهێنێت،جابۆیە بەدەگمەن نەبێت گوێ بیستی جۆرە بڕوانامەیەکی وەك و(ناووك)نا بین،بەلاّم دیارە (د.کەمال مەزهەر) یش کەسایەتییەکی ئاسان نی یە،یاخود کەسێك نییە کە نموونەی زۆربێت،جێ ی خۆیەتی بگوترێ هەردووکیان شایانی یەکترن بۆیە وا ئاوێتەی یەکتربوون،وە ئەو ناونیشانەش کە بۆ دکتۆرای دووەمی دەست نیشان کردبوو بەم ناونیشانە بووە ، ((بزافی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی لە کوردستانی عێراق لە ساڵی ١٩١٨-١٩٥٨ ))، وە لە ساڵی(١٩٦٩) دا بەسەرکەوتوویی وەك و

کاره زانستییەکانی تری، لە مۆسکۆ بەرگری لێکردووە،شایانی باسە (د٠کەمال مەزهەر) یەکەمین کوردی دەرەوەی یەکێتی سۆڤییەت بووە کەوا ئەو بڕوانامەیەی وەرگرتووە،تێزی دکتۆرای دووەمی (ناووك) لە (٣) بە رگ پێك دێت و بەسەر یەکەوە (٧٣٥) لاپەڕەیە، کەبێ گوومان ئەم کارو بەرهەمەشی شوێنی دیا ری هەبووە چ لە وێندەر چ لە عێراق و شوێنەکانی تر، لەبەر ڕوشنایی ئەو باسانەی سەرەوەدا،بۆمان بە دیاردەکەوێت کەوا نێوبراو بۆ ماوەی (١٠) سالاّن لە یەکێتی سۆڤییەت بووە وە لەوێندەر ژیانی زانستی خۆی دەگوزەرینیّ، بەلاّم لە سالّی(١٩٧٠) دە گەرێتەوە بۆ عێراق وە لەبەشی مێژووی کۆلێجی ئادابی سەر بە زانکۆی بەغدا، وەك و مامۆستا دادەمەزرێت وە لەم ماوەیەدا بووە بە مامۆستا لە( بە شی مێژوو)و(زما نی کوردی ) ، (د٠کەمال مەزهەر) یەکێك بووە لەو مامۆستا و نووسەرە کوردانەی کەوا لەوماوەیە دا کە لە بەغدا بووە، نەك هەر نەکەوتۆتە ژێر کاریگەری سیاسەتی حیزبی بەعس،بەلّکو تاڕادەیەکی زۆرباشیش خزمەتی زانست و کوردوکوردستانی کردووە ، ئەویش لەڕێگەی هزروخامە جوانەکەی،وەئەو کاتەی کەوا مامۆستاش بووە لەزانکۆ،خەریکی ئیش و کاری تریش بووە، لەوانە سکرتێری کۆڕی زانیاری کورد بووە،وە لەسالاّنی(١٩٧١-١٩٧٥) ئەندام وجێگیری سەرۆك و سکرتێری گشتی کۆڕی زانیاری کورد بووە لە عێراق,دیارە وێڕای ئەوەی ویستوویەتی لەڕێگەی زا نستەوە خزمەت و خەبات بۆ میللەتەکەی خۆی بکات،بەلّکو حەزی کردووە ماوەیەکیش ڕوو لە چیاکانی کوردستان بکات، ئەوەتا لەسالاّنی(١٩٧٤-١٩٧٥) لە چیا وشاخەکانی کوردستان بووە و ئارەزووی ئەوەی کردووە لەگەلّ خەباتگێڕانی نەتەوەکەی دابێت،جابۆیە لەو ماوەیە دا لەدەزگاکانی ڕاگەیاندنی شۆڕش دا بە ڕپرسیارێتی گرنگی هەبووە،وەهەروەها چالاکانە کارەکانی لەم بوارەدا هەلّدەسوڕا ند، وە بۆخۆیشی دەلّێت ((چۆ ن شانازی بە کتێبخانە و کتێبەکانمەوە دەکەم،بەهەمان شێوەش

شانازی بەوەوە دەکەم کە لەساڵی (١٩٧٤-١٩٧٥) دا لە ڕیزەکانی شۆڕش دا بووم))، وە هەر بە هۆی نووسین و بەرهەم و کاری زانستییەوە،لەساڵی (١٩٨١) ئەگەر بە هەڵەدا نەچین دەبێت بە (پرۆفیسور)، وە بە هۆی کاری زانستییە وە جگە لەوەی تەمەنێکی زۆری لە زانکۆدا بردۆتەسەر، بەڵکو زۆر شوێنیشی تەی کردووە،هەر بۆیە زمانی (کوردی -عە رە بی - ئینگلیزی -ڕووسی - هە ندێ فا رسی )دەزانێ، کە ئەمەش گەورەترین کەرەستەیە بۆ مێژوونووس وە زۆرترین یا رمەتییە بۆ ئەوەی نووسینەکانی ئاسایی نەبن و دەگمەن و دانسقەبن !! (پ.د. کە مال مەزهەر) هەروەك و چۆن بۆخۆی سامانێك و گەنجینەیەکە و پێویستە هەموو کوردێك شانازی پێوە بکات،ئاوەهاش گرنگە خۆیشی شانازی بەوەوە بکات کەوا جگە لە بەرهەمەکانی خۆی،بەڵکو خاوەنی کتێبخانەیەکی ئێجگار گەورە و دەوڵەمەندە،هەروەك و خۆی باسی لێوە کردووە بە لایەنی کەمەوە(٣٥) هەزار کتێب لە پەرتووخانەکەی دایە، بە زمانەکانی(ئینگلیزی -فەرەنسی- تورکی- فارسی- ئەرمەنی) کە بێگوومان زۆرینەی (کوردی-عە رەبی) یین، یاخود دەتوانیین بڵێین لێوان لێوە لەم دوو زمانە،ئەم کتێبخانەیە وێڕای ئەوەی کەوا ژمارەی کتێبەکان زۆر و فرەیە،بەڵکو خودی پەرتووکەکانیش دانسقە و دەگمەنن و بەهای زانستییان گەلێك زۆرە،وە دەبێت لەیادیشمان نەچێت ئەم کتێبخانە یە هەر کتێبی تێدانی یە،بەڵکو بریشە لە ڕۆژنامە و گۆڤار و بەڵگەنامەی نهێنی بەزمانە جیاجیاکان وە شوێنی خۆیان گرتووە لەو کتێبخانەیە، ئەم شوێنە زۆر کات بووە بەماڵ وحەوانە وەی زۆر لەقوتابیان .(پ.د.کەمال) تەواوی ژیانی بۆ خوێندن و زانست ومێژوو تەرخان کردووە،وە هەتاوەك و هەنووکەش لە خزمەتی مێژووی کوردە،هەر بۆیە بە دەیان کتێب و سەدان لێکۆڵینەوەی زانستی و باس و ووتاری هەیە بە زمانەکانی (کوردی- عەرەبی- ڕووسی)، ئەمە جگە لەوەی کەوا بەشداری چەندین کۆڕ وسیمیناری زانستی و

کۆنگرەی کردووە چ لەنێوخۆ وە چ لە دەرەوە،وە هەروەك و ئاشکراشە بە شداری چەندەها نامەی ماجستێر و دکتۆرای کردووە،کە تێیان دا یان ئەندام بووە یاخود زۆرینەی جار سەرۆکی لیژنە بووە،جابۆیە لەم بوارەش دا سەدەها قوتابی پێگەیاندووە و ڕێگەی زانستی پێ نیشان داوون، (پ.د.کەمال ) پسپۆڕییەکەی لە بوای مێژووی نوێ و هاوچەرخی کوردە،هەرچەندە سەرەتا حەزی لە مێژووی کۆن کردووە،هەروەك و خۆی بۆمان دەگێڕێتەوە ئەم حەز و خولیایەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی منداڵی وهەرزەکاری،بەڵام وادیارە دواجار ئەم قۆناغە مێژووییە نەبوو بە قیسمەتی، وە ئەوە بوو بووبە مێژوونووسێکی گەورە و کاریگەری مێژووی نوێ و هاوچەرخی کورد،جگە لەوەی کەوا نووسین و بەرهەمی لەبارەی ئەم قۆناغە مێژووییەوە هەیە،بەڵکو نووسین و بەرهەمی تریشی هەیە لە دەرەوەی چوارچێوەکەی ئەم قۆناغە،ڕەنگبێ زێدەڕەوی نەکەین ئەگەر بێت و بڵێین جارێکی تر وابەئاسانی کەسێکی تر وەك و (پ.د.کەمال مەزهەر) بەئاسانی بۆکوردوکوردستان نایەتە بەرهەم،هەروەك و چۆن کۆمەڵناسێکی تری وەك و(د.علی الوردی )بۆ عێراقییەکان دروست نابێتەوە،کە ئێمە دەمێکە بە نووسینەکانییەوە سەرسامین،وە زۆرینەی بەرهەمەکانی هەر لە قۆناغی زانکۆدا خوێندومانەتەوە،وە بۆماوەیەکیش یەکێك بووین لە دەروێشە توندڕەوەکانی وە بەرگرییەکی باشمان لێدەکرد،هەر کەسێك ئەگەر بە ووردی بەرهەمەکانی نەخوێنێتەوە هەرگیز تێناگا ئەم کابرایە کێ یە !!! جا بۆیە دوور ناکەوینەوە لە ڕاستی ئەگەر بڵێین(پ.د.کەمال مەزهەر) بە زیندووکەرەوە و زەنگلێدەری مێژوونووسی کورد و بەباوکی ڕۆحی و جەستەیی مێژوویی نەتەوەی کورد دابنرێت،چونکی تەواوی تەمەنی خۆی تەرخان کردووە بۆ مێژووی نەتەوەکەی ،سەیر لەوەدایە نێوبراوو هێندە لای میللەتانی غەیرە کورد نا سراو و نرخێندراوە،کورد بۆخۆی هێندە یاخود وەك و پێویست هەقی ئەم مرۆڤە یان

نەداوە !ئەو نەك هەر باوکی ڕاستەقینەیی مێژووی کوردە،بەڵکو لە مێژوونووسە ناوازە و دەستبژێرەکانی عێراق و بگرەلەدەرەوەش نێوی وبەرهەمەکانی نامۆ نییە بە لای خوێنەرانەوە،ئێمە کاتێك دەڵێین خۆی تەرخان کردووە بۆکاری مێژوو نووسی کوردوکوردستان دیارە هەر لە خۆمانەوە ئەم ووتەیە دەرنابڕین،چونکی ئەم پیاوە چەندین جار هەلی بۆ دەڕەخسێت و بۆیشی دەلوێت کە پلە وپایە وەربگرێت، وە چەند جارێکیش داوای لێکراوە کە لە پلەوپایە نزیك بێتەوە، کەچی ئەم بە لووتفێکی زۆر جوانەوە ڕەتی دەکاتەوە، وە دەڵێت من خەریکی کاری خۆمم، جیی خۆیەتی(پ٠د٠کەمال مەزهەر) ببێت بە چرایەکی ڕووناکی نێو ژوورە تاریکەکانی مێژوو و مێژوونووسی کوردوکوردستان ،چونکە جگە لە کارەکانی خۆی چەندین کاری مێژوونووسی تری کوردی پێ نیشان داوین،نێوبراوو جگە لەوەی کە ناتوانرێت بە ئاسانی مافی خۆی بدرێتێ لە بواری مێژوونووسی دا، بەڵکو بەسانایش ناکرێت لە هەڵسوکەوتی دا بەها و نرخ و هەڵسەنگاندنی دا پاداشتی خۆی بدرێتێ،ئەو چۆن ئەرکی ئەو ناو و ناوبانگییەی خۆی داوە کە بەڕاستی شیاوی زیاترە،ئاوەهاش نرخی مرۆڤبوونی خۆی داوە،وە سەلماندوویەتی کە بەڕا ستی لە ژیان دا وەك و مرۆڤێك بە واتای ووشە بژێت،جا هەقی خۆیشیەتی پەیکەریك لە زێڕی بۆ دروست بکرێت٠

ب– خستنەڕووی نووسین و بەرهەمەکانی:

لەڕاستی دا ناکرێ لێرەدا تەواوی نووسین ولێکۆڵینەوەو بەرهەمەکانی نێوبراوو هەرهەمووی بخرێتە ڕوو و گفتوگۆی لەبارەوە بکرێ،بەڵام دەشێ زۆرینەیان بە خوێنەر بناسرێت و ئاماژە و پێناسەیەکی کورتی بۆ بکرێت٠(پ٠د٠کەمال مەزهەر) هەر وەك و لەمەوپێش ئاماژەمان پێکرد، یەکەم ووتاری لە نەشرەیەکی قوتابخانەدا بلاوکردۆتەوە لەژێر ناونیشانی (بمخوێننە وە)، ئەگەر بە هەڵەدا

نەچین ساڵی(١٩٥٣) بووە،کە باسی مامۆستای تێداکردووە،واتە دەکرێت بڵێین لەو ساڵەدا یەکەم ووتاری نێوبراوو دەخوێدرێتەوە،وە هەروەها یەکەمین ووتارە مێژووییەکانی هەروەك و تێبینی دەکرێت لە گۆڤاری (بڵێسە)دا بووە لە ساڵی(١٩٥٩)، لەوانەش وەك و(ڕۆڵی کوردلەمێژووی شارستانێتیدا) هەروەها (سەرەنجێکی مێژوویی لەسەر زمانەکەمان)، وە لەپاش ئەم ساڵەش دا کە ڕوو دەکاتە یەکێتی سۆڤییەت لەوێندەریش خۆی بە نووسین و لێکۆڵینەوەی مێژوویی سەرقاڵ دەکات و تا پێی کرابا خزمەتی زانست و کوردی کردووە،وە بابەتەکانی خۆی لەوێ بە زمانی ڕووسی بڵاودەکاتەوە، جا بۆیە کۆمەڵێ ووتار و لێکۆڵینەوەی زانستی لەسەر بزوتنەوە و دۆزی کورد لە گۆڤاری (گەلانی ئاسیا و ئەفریقا) دا بڵاوکردۆتەوە، یان لە گۆڤاری (هەواڵەکانی کۆڕی زانیاری ئازەربایجانی سۆڤێتی)دا، وە ئەوکاتەش کە دەگەڕێتەوە بۆ عێراق و لەبەغدا وەك وماموستا لە زانکۆدا وانە دەڵێتەوە، دەست دەکات بە بڵاوکردنەوەی نووسینەکانی خۆی لە ڕۆژنامە و گۆڤارە عەرەبی و کوردییەکان، بۆ نموونە ساڵانی حەفتا زۆربەی بابەتەکانی لە ڕۆژنامەی(التاخی)بڵاودەکردەوە،وە ئەو ووتار و باسانەی کەوا لە ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکان بڵاوی دەکردەوە، بریتی بوون لە (برایەتی)، (ڕۆژی کوردستان)، (بەیان)، (هاوکاری) وەهەروەها ژمارەکانی گۆڤار (کۆڕی زانیاری کورد)یش بە بەردەوامی بێ لێکۆڵینەوەی ئەو نەبوونە،کەباس و لێکۆڵینەوەکانی لەمەڕ کوردستان و کورد بووە، وە هەروەها لە (ڕۆشنبیری نوێ) ،(کاروان)، (الثقافة)، (افاق العربیة)، (مجلە المجمع العلمی الکردی) بابەتەکانی جێگەیان دیار و بەهاداربووە.لەبەر ڕۆشنایی ئەم باسەوە بۆمان بە دیاردەکەوێت (پ.د.کە مال مەزهەر) لە مێژەوە جەریکی نووسین و لێکۆڵینەوە و تێڕامان و تێفکرینی تا یبەتی خۆیە، کە هەرهەمووشی لە خزمەتی مێژوو و مێژووی کورد بووە، بەکوورتی دەکرێ بڵێین نێوبراوو هەر لە پەنجاکانی

ســەدەی ڕابــردووە وە بابەتــەکانی بڵاوکراوەتــەوە،وە نووســینەکانی بــە زمــانی(کــوردی–عــە رە بــی–ڕووســـی ) لــە ڕۆژنامــە وگۆڤارەکــان دا بڵاوکراوەتەوە،بابەتەکانیش زیاتر ووتار و لێکۆڵینەوەی زانستی بوونەوە زۆرینەی زۆریشی لە بارەی مێـژووی کوردوکوردسـتان وبزافـی ڕزگـار یخـوازی نەتـەوەیی بووە،وێڕای هەموو ئەمانەش (پ.د.کەمال مەزهەر)، بەشێك لە ووتارەکانی بـەبێ ناوی خۆی، وە بەشێکیشیان بە نێوی (ك) بڵاوکردۆتە وە، وا پێدەچێت ئەمـەش هۆکاری تایبەتی خۆی هەبوبێت، جگە لەمانەش نێـوبراوو بـە شـداری چـەندین کۆڕ و سیمینار و کۆنگرە و گفتوگـۆی ماجـستێر و دکتـۆرای کـردووە،وە چـەندین چاوپێکەوتن و دیدەنی لەگەڵ کراوە،ئەمە جیا لـەوەی کـەوا چـەندین لاپـەڕە لـە ڕۆژنامە و گۆڤارە(کوردی و عە رە بی )ییـەکان بـە قـسەکردن و هـە ڵسەنگاندن و نرخاندنی نووسینەکانییەوە بڕکراوەتەوە،واتە ڕوونتر بڵـێین ئـەو نووسـینانەش کــە لــەبارەی قەڵەمەکــەی نێــوبراوەوە تۆمــارکراوە شــایانی باســکردن و گفتوگۆکردنە،چـونکە ئـەو نووسـینانە جگـە لـەوەی بەشـێکیان بریتـی بـووە لەنرخاندن و هەڵسەنگاندنی نووسینی بالا،بەڵکو بەشێکیـشیان بریتـی بـووە لـە سەرقاڵکردنی نووسەران و سەرسامکردنییان بەو جۆرە نووسینانە،ڕاستە هەندێ نووسینیش بریتی بووە لە ڕەخنە و توانج لە نووسـینەکانی، بـەڵام بـە تێڕوانینـی ئێمە زۆرینەی زۆری تەنانەت بە دووریشن لە چوار چێوەی ڕەخنە!شایانی باسە لـەم سـاڵانەی دواییـدا لـە کوردسـتان،ئەگەر بـە هەڵـە دا نەچـین ژمـارە (٣)ی "ڕۆڤار"بۆ(پ.د.کەمال مەزهەر)تـەرخان کرابوو،کـە بڵاوکراوەیـەکی ڕۆشـنبیرییە و هەر ژمارەی تایبەتە بە دا هێنەرێك،دەزگای چاپ و پەخشی سـەردەم دوومـانگ جارێك دەریدەکات،وابزانم نێونیشانی((کەمال مەزهەر و ناخی مێژوو))بوو! دەکرێ بڵـێین ئـەم باسـە کـە خرایـە ڕوو گەشـتێك بـوو بـە نێـو ئـەو ووتـار و بـاس و لێکۆڵینەوانــەی نێــوبراوو کــە لــە ڕۆژنامــە و گۆڤــارە(کــوردی–عــە رە بــی–

ڕووسی)یەکان بڵاویکردۆتەوە،یاخود دەتوانین بڵێین چاوپێداخشاندنێك بوو بۆ پشك داری (پ.د.کەمال مەزهەر) بە دونیای ڕۆژنامەگەرییەوە.حەز دەکەین لێرە بە دواوە ئیدی خوێنەر پەلکێش بکرێت بۆ ئاشنابوون بە بەرهەمەکانی و ئەو کتێبانەی کە لەماوەی ژیانی دا بە چاپ گەیشتووە،لەهەندێ شوێن و جێگادا وا باس کراوە کەوا ژمارەی کتێبەکانی هەتا وەك و ئێستا خۆی لە (٣٠)بۆ(٥٠) کتێب بدات،جا لێرەدا هەوڵ دەدەین زۆرینەی ئەو بەرهەمانە بخەینە ڕوو.(پ.د.کەمال مەزهەر)یەکەم بەرهەمی کە بەشێوەی کتێب چاپ کرابێت، دکتۆرای یەکەمییەتی کە بەزمانی ڕووسی لە ساڵی (١٩٦٧) دا چاپ کرا،جگە لەوەی کە یەکەمین کتێبییەتی بەڵکو ئەم بەرهەمە هەرایەکی باشی نا یەوە لە نێوان مێژوونووسانی ئەو دەمە، وە لەساڵی (١٩٧٥)دا لە بەغدا کتێبێکی بە زمانی کوردی چاپ کرد، بە نێوی (کوردستان لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهانیدا)،ئەم بەرهەمە زۆری لە بارەوە ووتراوە،وە لە ڕاستی دا کتێبێکی گرنگ و پێویستە وە گەورەترین کەلێنی پڕکردەوە، هەربۆیە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی (عە رەبی و تورکی و ئینگلیزی)،وە هەروەها ئەو بەشەشی کە لەسەر کوشتاری ئەرمەن بووە،کراوە بە زمانی (فەڕەنسی و ئەرمەنی)،لە وەرگێڕانە عەرەبییەکەی دا ئەم بەشە ،بەشی پێنجەمە و بەنێوی (الكرد والدم الارمني المراق)ە، ئەم بەرهەمە لەلایەن (محمدالملاعبدالكريم) کراوە بە عەرەبی، جگە لە کەسایەتی نووسەر وبەرهەمەکەی، لەم کتێبە دا ڕۆڵی بەڕێز(مەحەمەدی مەلا عەبدولکەریم)یش دیارە،چونکە نووسە رە کەشی بۆخۆی دەڵێ گیانی کردووە بە بەری!! وە لەساڵی(١٩٧٧) دا کتێبێك بە ناونیشانی(الثورة العشرين في الاستشراق السوفيتي) لە بەغدا چاپ دەکات، وە هە روەها لە هەمان ساڵ دا کتێبێکی (أ.شامیلوف) ی وەرگێڕایە سەر زمانی عەرەبی، کە لە بەغدا چاپ کرا و ئەم کتێبە لەژێر ناونیشانی (حول مسألة الا قطاع بين الكرد)بوو، وە هەروەها کتێبی

(دور الکــورد في ثــورة العــشرين)ی لــە ســاڵی (١٩٧٨)دا لــە بەغــدا چــاپ و بڵاوکردەوە،وە هەر لەهەمان ساڵ دا لە بەغدا دوو کتێبی تری بە چاپ گەیاند،کە بەنێونیشانی (أضواء على قضايا دولية في الشرق الاوسط) وە(دور الشعب الكردي في ثورة العشرين العراقية)دابوو،وە هەر لەساڵی(١٩٧٨)دا بـوو کـەوا (پ.د.کـەمال مەزهەر) بیری بەلای ئەوەدا چوو کەوا چۆن ئاوڕێکیش لە مێـژووی ڕۆژنامەگـەری کـوردیش بداتەوە،هـەر بۆیـە لـەم بارەیەشـەوە بەرهـەمێکی تـری پێـشکە شـی خوێنەرانی کورد کرد کـە ناونیـشانەکەی (تێگەیـشتنی ڕاسـتی وشـوێنی لـە ڕۆژنـا مەنووسی کوردیدا)بوو کە لەبەغدا چاپ کـرا،وە هـەروەها لـە سـاڵی(١٩٧٩)دا لـە بەغدا بەرهەمێکی تـری بـەزمانی عـەرەبی خستەبەر دیـدی خوێنـەران، کـە نێـوی (النهـضة)بـوو، وە ئـەم بەرهەمـە لەلایـەن بـەڕێز(فوئادمەجیدمیـسری) بییـەوە وەرگێڕدراوەتە سەر زمـانی کـوردی و چـەند جـارێکیش چـاپکراوەتە وە، ڕەنگبـێ زێدەڕەوی نەکەین ئەگەر بڵێین زیاترلـە (١٠) جـاران ئـەم کتێبـەمان خوێندبێتـەوە بەهەردوو زمـانی کـوردی وعـە رەبـی، هەرچـەندە ئێـرە جێگـەی ئـەوە نـی یـە لەسەری بدوێین، بەڵام ئێمـە سـەیرمان بـەوە دەهـات ئـاخۆ نووسـەر چـۆن بـەم بوختییە توانیوویەتی زۆر باس بوروژێنێ!! یان چۆن هەتاوەکو هەنووکەش نـرخ و بەهای خۆی لە دەست نەداوە، وە نووسینێك نی یە شـان لـە شـانی بدات،ئێمـە زۆرجاران بە راوردمان دەکرد،لەگەڵ سەرچاوەکانی تردا، کەچی لەزەتی لـەلامان هەر زیاتر و بەنرخ تر و زانستی تر دەبوو.ئەم جارە یان ڕوومان بەرەو هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو دەچـەرخێنین و ئـاوڕێکی خێـرا لـە بـە رهەمـەکانی مێژوونووسـی گەورەی کورد (پ.د.کەمال مەزهەر) دەدەینەوە،ودەبینین لە ساڵی(١٩٨١)دا هـەر لــە بەغــدا کتێبێکــی تــر بــەزمانی کــوردی دەخاتــە بــەر دیــدی خوێنــەرانی کوردودۆستانی،ئەم بەرهەمەش (ئافرەت لەمێژوودا) بووە،دیارە نووسـەر ئارەزووی ئەوەی کردووە کەوا ئاوڕێك لە پرسی ئـافرەت بـە گشتی و بەتایبـەتی ئـافرە تـی

کورد بداتەوە،ئەم بەرهەمە کورتە باسێکی مێژوویی و کۆمەڵایەتی یە،کە تێیدا باسی ڕۆڵ و گرنگی ئافرەت دەکات لە مێژوودا، وە پێشکەشی کردووە بە ئافرەتی سەربەرزی کورد-بەو دایك و خوشك و کیژە دڵسۆزانە،سەرمان پێیان گەیشتۆتە کە شکەڵانی فەلەك، وە هەر لەهەمان ساڵ دا کتێبێکی تری بەنێوی (الطبقة العاملة العراقية- التكوين و بدايات التحرك) لە بەیروت چاپ کرد، کە باس لە چینی کرێکارانی عێراقی بەگشتی دەکات، بێ گومان ئەم بەرهەمەش یەکێکە لەو بەرهەمانەی کەواجێگەی دیار و بەرچاوی هەیە،وە لەلایەن بەڕێز (فوئادمەجید میسری)ییەوە کراوە بە کوردی،وە هەروەها کتێبی(کوردلای کەردلێفسکی) دا لە ساڵی (١٩٨٣) لە بەغدا چاپ کردووە،وە هەر لە ساڵی(١٩٨٣)دا بوو کەوا بەرهەمی (مێژوو) هاتەبەر و کەوتە بەردیدی خوێنەرانی کورد، ئەم کتێبە (کورتە باسێکی زانستی مێژوو و کورد و مێژوو)ە، کەوا نووسەر لە بەغدا چاپی کردووە، ئەم بەرهە مە هەر ئەو وێنەیەی کە لە بەرگەکەی دایە بۆخۆی قسەوباسێکە و پێویستی بە باسکردن هەیە، کە وێنەی (دارەبەڕووە)،پێشکەش کراوە بە یادی پیرۆزی - شەرەفخانی بیدلیسی، مەلا مەحموودی بایەزیدی،موحەممەدئەمین زەکی، ئەم بەرهەمەهەر چەندە بە زمانێکی سادە و ساکار و پاراو نووسراوە، بەڵام دەشێ بڵێین خوێندنەوەی یەکەم جاری هەر یەکترناسینمان بێت و پێویست بکات زۆر گفتوگۆی لەگەڵ دا بکەین،زۆربەی زۆری ئەو باسانەی کە لەم بەرهەمەدا دەخوێندرێتەوە هەتاوەکو هە نووکەش باسی لێوەنەکراوە و نەخراوەتە بەر تیشکی لێکۆڵینەوە و گفتوگۆ ومشتو مڕکردن! ئەم بەرهەمە لە (٣) بەش پێك هاتووە، کە بەشی یەکەم و دووەمی بە شێوە یەکی گشتی بۆ مێژوو تەرخان کراوە بە قۆناغە جیاجیاکانییەوە،بەڵام بەشی سێیە می تەرخان کراوە، بۆ (کوردومێژوو)، وە لە کۆتا یش دا ، کورتەی بیبلیۆگرافیای مێژوونووسی کوردی بەرچاو دەکەوێت،بەڕاستی کارێکی زۆر پێویستە، ئەم بەهەرهەمە زۆر هەڵدەگرێت

بەلام ئێرە جێ ی زۆر ووتنی نی یە. وە هەروەها لە ساڵی(١٩٨٤)دا کتێبی (میکافیلی والمیکافیلیە)ی لە بەغدا بەچاپ گەیاند، کە ئەم بەرهەمەش جێگەی سەرسامی زۆر لە بیرمەندان و نووسەرانی ئەو کاتە بوو. وە لە ساڵی(١٩٨٥)دا هەر لە شاری بەغدا دوو کتێبی تری بلاوکردەوە، کە یەکێکیان بە زمانی عەرەبی بوو، وە ئەوی تریشیان بە زمانی کوردی بوو، ئە وەی یەکەمییان (دراسات في تاریخ إیران الحدیث و المعا صر) بوو،وە ئەوەی دووەمیشیان (چەندلاپە ڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد)بوو کە بەشی یەکەمی بووە،وە هەر لە ساڵی (١٩٨٧)دا کتێبی (صفحات من تأریخ العراق المعاصر) لە بەغدا بلاوکردەوە، کە کۆمەڵێك لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی شیکارییە، وە لەساڵی(٢٠٠١)دا بوو کەوا کتێبی (انتفاضة ١٩٢٥في کردستان ترکیا)ی لە بەیروت چاپ کرد،کە ئەمەشیان دیسان چە ند لێکۆڵینەوەیەکی شیکارییە. وەهەر لەهەمان ساڵ دا بەرگی دووەمی بەرهەمی (چە ند لاپەڕەیەك لەمێژووی گەلی کورد) لەلایەن بەڕێز(عەبدوڵلا زەنگەنە) وە ئامادەکراو لە هەولێر بەچاپ گەینرا و کەوتە بەردیدی خوێنەرانەوە، وە هەروەها کتێبێکی تریشی لەلایەن بەڕێز (ئازادعوبێد ساڵح) ەوە ،وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی کوردییە وە،بە نێوی (خەباتی ڕزکاریخوازی کورد و ئازەر لە ئێران).وە لەم ساڵانەی دواییدا بوو(پ.د.کەمال مەزهەرئەحمەد) بەرهەمێکی تری بەچاپ گەیاند لە چاپخانەی (مطبعة رینوین) بووە بەلام وا پێدەچی ساڵی چاپی دیار نەبێت، ئەم بەرهەمە نێوی (کرکوك وتوابعها، حکم التاریخ والضمیر–دراسة وثائقیة عن القضیة الکردیة فی العراق)کە بەشی یەکەمی بوو، وابزانم دەمێکە سەرقاڵی نووسینی بەرهەمێکە لەبارە ی کەرکوکەوە،هەروەك و باسدەکرێت لەساڵانی(١٩٩١–١٩٩٢)وەپێیەوە خەریکە، ئەم کتێبە جوانترین و بەهادارترین دیارییە کەوا نووسەرەکەی خستویەتێتە بەر دیدی خوێنەران،وەباشترین دیاریشە بۆ میللەتی عێراق بەگشتی و بەتایبەتی کورد، چونکی پێشکەش کراوە بەو

عەرەبانەی کە نایانەویٚ زۆرداربن،بەو ئەندازەی نایانە ویٚ زۆر لێکراوبن، ئەم بەرهەمە نرخ و بەهای لە گووتندا نایە،هەرچەندە زۆریشی لە بارەوەگوترابێت،بەلاٚم هێشتا هەقی خۆی پێنەدراوە،ئەم بەرهەمە تەرجەمەی سەر زمانی(تورکی)کراوە،لە ڕاستی دا خودی بەرهەمەکە لە چوار بەرگ پێکدێت، هەتاوەکو ئێستا بەرگی یەکەمی بلاٚوبۆتەوە،بەلاٚم بەرگەکانی تریشی لە تەواو بوون دایە، بە رگی دووەمیشی هەر لەبارەی کەرکوکەوە دەبێت، بەرگی سێیەمیش لەسەر خانەقین دەبێت و دوا بەرگیش کە بەرگی چوارەمە،لە مەڕ ئێزیدییەکانی شنکالەوە دەبێت. وە هەروەها لە ساڵی(٢٠٠٤)دا کتێبێکی تری لەلایەن بەڕێز(فوئادمەجیدمیسری)ییە وە وەرگێڕدرابوو،دووبارە لە سلێمانی چاپکرایەوە، جگە لەم چاپەی ،چاپی تریش کراوە، کە بەناونیشانی(ڕێنیسانس–لەگەڵ باسێکی تر بەناونیشانی ئەدیب و ئەرکەکانی قۆناغ)بوو،وەهەروەها لەساڵی(٢٠٠٩)،(پ.د.کەمال مەزهەر) دوو کتێبی تری کردە دیاری بۆخوێنەران و دۆستانی کوردوکوردستان،یەکێکیان بەناونیشانی (بستێکی خاکی کوردستان بە هەموو دونیا ناگۆڕمەوە) بوو، کە بریتی یە لەکۆمەڵێك دیمانە و گفتوگۆ لەگەڵ نێوبراوودا،وە لەلایەن بەڕێز(عەبدوڵلاٚ زەنگەنە)وە ئامادە کراوە و لەهەولێر چاپ کراوە، وە ئەو یتریشیان بەنێوی (کوردوکوردستان لەبەڵگە نامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانیادا)یە، کە بەرگی یەکەمیەتی وە بەهەمان شێوە لەلایەن بەڕێزانەوە(عە بدولاٚ زەنگەنە) و هاوسەری بەڕێزی (شەهلا تاهیر حەیدەری)ییەوە ئامادەکراوە، کە ئەمەیان لە لوبنان بە چاپ گەیەنراوە، ئەم بەرهەمە باسە کانی زۆرینەی زۆری نوێین واتا بابەتگەلێکن هەتاوەکو ئەم ساتە بەلای خوینەران و مێژوونووسانەوە نامۆیە ! چونکە نووسەر هەوڵی داوە بەڵگە نامەنهێنییەکانی حکومەتی بەریتانیا بە خوێنەر ئاشنا بکات، هەرچەندە زۆری لە بارەوە ووتراوە و زۆریشی لەسەر نووسراوە، بەلاٚم هێشتا بە تەواوی نرخی خۆی نەدراوەتیٚ و بەبا

شی هەڵنەسەنگێراوە.ئەم بەرهەمە هەروەك و نووسەر خۆی دەڵێت (خودا) تەمەن بدات بەرگی(٢-٣-٤-٥)یشی بەدوادا دەردەچێت،چونکە لەگەڵ هاوسەرە بەڕێزوما ندوونەناسەکەی بە هەزارەها بەڵگەنامەی نهێنی حوکومەتی بەریتانیایان هێناوە،لەو ئەرشیفخانەیە کە هەر دوایی نایەت.(پ.کەمال مەزهەر) وێڕای ئەوەی کەوا خەریکی تەواوکردن و کارکردنی بەرگەکانی تری ئەم بەرهەمەیە،بەڵکو سەرقاڵی مشورخواردنی بەرگی دوو و سێ و چواری بەرهەمی کەرکوکیشە،وە بە تەمایە بیرە وەرییەکانی خۆی بنوسێتەوە و ئێستا کاری لەسەر دەکات و ناویشی لێناوە (لەبە راوێـزی کوردایەتیدا-لە بیرەوەرییەکانی کەمال مەزهەر)، کە پێشکەشی بەڕێز و بەئە مەك(شە هلا)ی هاوسەری کردووە.

نێوبراوو لەگەڵ هەموو ئەمانەش بە شداری زۆر لە کتێبی تری کردووە، کە تێیدا یان پێشەکی بۆ نووسیووە یاخود پێداچوونەوەی بۆکردووە یان هەر کارێکی تر لەم شێوەیە، بۆ نموونە کتێبی (هە ندێك بیر و باوەڕی هەڵە لە بارەی زمان ومێژووی کوردەوە) کە برۆفیسۆر (قەناتی کورد-کوردۆیێف) نووسیوویەتی و خوالێخۆشبوو(د.ئەورحمانی حاجی مارف) کردوویە بە کوردی و پێشەکی بۆ نووسیووە،وە (پ.د.کەمال مەزهەر)یش پێداچوونەوەی بۆ کردووە وە لەبەغدا ساڵی(١٩٧٣-١٩٧٤) چا پ کراوە، یان کتێبەکەی (نوری السعیدودورة في السیاسة العراقیةحتی عام ١٩٣٢-١٩٤٥), کە (سعادرۆوف شیر محمد) نووسیوویەتی و نێوبراوو پێداچوونەوەی بۆکردووە و ساڵی (١٩٨٨) لە بەغدا بەچاپ گەیشتووە، ئەم کتێبە لە بنەرەت دا نامەی ماجستێرە وپێشکەش بەبەشی مێژووی کولێجی ئادابی زانکۆی بەغداکراوە، وە لەساڵی(١٩٨٥) پلەی نایابی بە دەست هێناوە لە مێژووی نوێ، کە (پ.د.کەمال مەزهەر) سەرپەرشتی کردووە، یاخود کتێبی(مذکرات فؤاد عارف)، کە نێوبراوو(تقدیم وتعلیق)ی بۆ نووسیووە، ئەم بەرهەمە بەشی یەکەمییەتی لەساڵی (١٩٩٩) لە دهۆك چاپ کراوە،وەنێوبراوو

ئێستا خەریکی بەرگی دووە میشییە تی‌یان کتێبەکەی (د.راهی مزهر العامری) کە ناونیشانی (مسعود محمد و دورة السیاسي في العراق ١٩١٩-١٩٦٨)ە، کە لێکۆڵینەوەیەکی مێژووییە و نێوبراوو پێداچوونەوەوپێشەکی بۆ نووسیووە لەساڵی(٢٠٠٨) چاپ کراوە، ئەمانەچەند نموونەیەکی زۆر کەم بوون، دەنا بەشداری لەچەندین کتێبی ناوازەی تری کردووە.

ج- چەند تێبینییەك لەمەڕ ژیان وبەرهەم و نووسینەکانی:

ئەم مێژوونووسە گەورەیەی کورد، هەر لە قۆناغی منداڵییەوە دەست و پەنجەی لەگەڵ خوێندن و زانست نەرم کردووە، وە تەمەنی منداڵی لە شاری سلێمانی بردۆتە سەر،پاشان بەهۆی تەواوکردنی خوێندن و بەردەوامی ڕوودەکاتە شاری بە غدا وە بۆ ماوەی چوارساڵان بە ئەوپەڕی سەرکەوتوویی ژیانی زانستی خۆی دەباتە سەر،وە هەر ئەم سەرکەوتنە وای لێدەکات ڕەوانەی یەکێتی سۆڤییەت بکرێت بۆ درێژەدان بەخوێندنی باڵا، وە لەوێندەریش بۆ ماوەی نزیکەی (١٠) ساڵ دەمێنێتەوە،وە لەو ماوەیەش دا توانی بەوپەڕی لێهاتوویی دووبڕوانامەی دکتۆرا بەدەست بهێنێت،ئەگەر تێبینی بکەن دەبینین (پ.د.کەمال مەزهەر) بە هۆی خوێندنەوە بۆ ما وەی چەند ساڵێکی درێژ لە بەغدا و مۆسکۆ ژیان دەگوزەرێنێ،بێ گوومان لەم ماوە یەدا بەباشی و دروستی فێری زمانی عەرەبی و ڕووسی دەبێت، ئەمە جیا لەوەی کەوا ئاشنای کەلتوور ومێژوو و زمان و داب و نەریتییان دەبێت،وە تاڕادەیەکی باشیش ئاگاداری ئەو نووسینانە دەبێت کە بەم دوو سێ زمانە نووسراون، وەهە روەها شوێنێکی وەك وسلێمانی یاخود بەغدا یاخود یەکێتی سۆڤییەت،جێگایەکی ئاسایی نی یە و وا لەمرۆڤ دەکاتن بەشێوەیەکی تر بڕوانێتە ژیان ئەگەر بەراورد بکرێت لەگەڵ شوێن و جێگاکانی تر،چونکی تەنانەت مرۆڤ لە ڕووی کۆمەڵایەتیشە وە بەتەواوی گۆڕانی بەسەردا دێت،جائەم گەشتانە وای لە نێوبراوو کردووە کەوا مرۆڤێکی ئاسایی

نەبێت، ئێمە وایدەبینین کەوا (قەدەر) گەورەترین و کاریگەرترین ڕۆڵی گێڕاوە لە ژیانی دا، کەوا بەم قۆناغانە دا تێپەڕێت،بەلاّم لەگەڵ بوونی یاخود پە یدابوونی ئەم قەدەرە بۆی بە تەنها بەس نەبووە، بەڵکو پێویستی بەوە دەکرد کەوا هەوڵدانیشی لەگەڵ دابێت و ئاوێتەی یەکتر بکرێت، ئەوجا دەرئەنجامێکی پۆزەتیفی لێدەکەوێتەوە یان داهێنان دێنێتە بەرهەم.چونکە زۆر جار مرۆڤ هەلی بۆ دەڕەخسێ بۆ کاروکردارێك بەلاّم کۆششی خۆی لەگەڵ دا نەبووە،یان زۆر جار وا هەڵکەوتووە مرۆڤێك بە هەموو تەمەنییەوە خەونی بە قەدەرێك و هەلێك دیبێ کەچی هەر بۆی نە لواوە،جا لەبەر ڕۆشنایی ئەم باسەوە بۆمان بەدیار دەکەوێت کەوا (پ.د.کەمال مە زهەر ئەحمەد) لەگەڵ بوونی ئەو قەدەر و هەلەدا،جوانترین و باشترین و لێهاتووترین ڕەفتاری لەگەڵ داکردووە،وە دەشتوانین بڵێین ڕۆڵی خۆی هیچ کەمتر نەبووە ئەگەر زیاتر نەبووبێت لەو قەدەرە، چونکی ژمارەی ئەو کەسانە کەم نەبوون کە وەك و نێوبراوو هەلیان بۆ ڕەخسا و کەچی بە گوێرەی پێویست نەچوون بە پیرییەوە،وەك و ئەوەی نێوبراوو باوەشی بۆی کردبوەوە ! !

بە تێڕوانینی ئێمە ئەگەر (پ.د.کەمال مەزهەرئەحمەد) نەبوایە کەسێکی تر وەك و ئەو بەئاسانی دروست نە دەبوو!وە واشی دەبینین ئەگەر ئەم گەشتانەشی نەدیبایە هەر لەکاری زانستی خۆی بەردەوام دەبوو، نێوبراوو هەر لە سەرەتای هەفتاکانەوە کە دەگەڕێتەوە دەبێت بە مامۆستای زانکو و وانە بەقوتابییەکان دەڵێتەوە، وێرای ئەمەش کارەکانی کۆڕی زانیاری پشتگوێ نەخستبوو،وە گەلێك کاری باشی هێنابووە بەرهەم.بەلاّم زۆری پێناچێ لە سالأنی(١٩٧٤-١٩٧٥) ڕوو دەکاتە چیاکانی کوردستان و لەوێندەر خەریکی کاری ڕاگەیاندن دەبێت، لەمەوە بۆمان ساغ دەبێتەوە کەوا نێوبراوو هەر بەناو یاخود هەر بە نووسین و کاری زانستی کوردی ڕەسەن نەبووە،بەڵکو بە لاشەوگیانیش کوردێکی بێگەردبووە،وە لەمەشەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کەوا نێوبراوو پێشینەیە کی ڕۆجی و زانستی

هـــەبووە بـــۆ زانـــستی مێـــژوو و مێـــژووی کوردوکوردســـتان و لـــەنا خـــی دا چێندراوە.بەڵام لەگەڵ هەمووئەمانەش ڕەنگبێ خەڵکانێکی زۆر بپرسن ئاخۆ بۆچی زۆرینەی تەمەنی لە دەرەوەی کوردستان یان لە تاراوگەدا بردۆتەسە ر!!! لە ڕاستی دا ئەم پرسیارە بەشێوەیەك لەشێوەکان جیێ ی خۆی دەگرێتەوە،چونکە ڕاستە وئێمە گوومانمان لەوەدانی یە کەوا نێوبراوو لە هەرشوێن و جێگایەکی ئەم جیهانە بێت هەر خزمەتی مللەتەکەی خۆی دەکات، بەڵام دیارە ئەم پرسیارە لە خۆشویستنی ڕۆڵەکانی ئەم میللەتەیە بۆ نێوبراوو دەکرێ و،پێیان حەیفە لێ یان دوور کەوێتەوە،چونکی ئێمە کەسی هاوشێوەی نێوبراوومان کەمە، وە ژیاننامە و بەرهــە مەکانیـشی گەواهیـدەری ئـەم ووتانەن،بـەڵام ئەگـەر بهاتبایـە و لـەپاش گەڕانەوەی لەیە کێتی سۆڤییەت یان لەپاش ساڵی سەرەتای هەشتاکانەوە کە بووبوو بە پرۆفیسۆر، لە نێو کوردوکوردستان بووایە،وابزانم کاریگەری زیاتری دەبوو چ بۆلایەنی زانستی وە چ بۆ کۆمەڵانی خەڵك.بەڵام ئەگەر لە گۆشەنیگایەکی ترەوە بڕوانینە ئەم پرسیارە، قارەمانی ولێهاتوویی ئەم پیاوەمان زیاتر بۆ بەدیاردەکەوێت، چونکی ئەو هە تاوەکو هەنووکەش نەکەوتۆتە ژێر کاریگەری حیزب و ئایدۆلۆجیا و دەسەڵات و هزری عەشیرەتگەری و ناوبانگی دا، وە لە کات وشوێن و جێگای وادا کار و خزمەتی زانستی مێژوو وە هەروەها میللەتەکەی کردووە، کە کارکردن تێیدا ئاسان نەبووە! جگە لەمەش (پ.د.کەمال مەزهەرئەحمەد) لە ماوەی ژیانی دا توانی و سەلماندیشی کە وەکو مرۆڤ ، دواجار وەك و کوردێکی پاك و ڕەسەن خۆی نیشان بدات، وەدەیزانی بۆچی دەژێت وەخۆیشی دۆزیبویەوە کە کێ یە و بۆچی دەشێ!! خەباتی ئەم پیاوە گەورەیە لەخەباتی هیچ کوردێکی تر کەمتر نی یە، کە خەباتی قە ڵەمە، نێوبراوو جگە لەکارە زانستییەکانی، ئەگەر وەك و مرۆڤێکی نەخوێندەواریش تەماشا بکرێت و مامەڵەی لەگەڵ دابکرێت، واتا واسەیر بکرێ نەخوێندەوار و مێژوونووس نی یە،

کەچی دەبینین لەم دۆخەش دا نموونەی مرۆڤی ناوازە ودەگمەنە، بەتایبەتی لەم سەردەمەدا وە بەو تەمەنەوە،ئێمە ئێستاشی لەگەڵ دابێت سەرمان لەوە سورِدەمێنیّ ئاخۆ بەم تەمەنەوە هێندە بە لووتفەوە مامەڵە لەگەڵ بەرامبەر دا د ەکات! ! نووسین و بەرهەمەکانی (پ.د.کەمال مەزهەر ئەحمەد) قەڵەمێکی زانستی مێژوویی کوردە و زۆرجار چووە بەچاوی ناحەزانی نەتەوەکەی و ناحەزانی زانست دا، بەلاّم بەبەردەوامی لە دلّ و دەرونی زانست پەروەر و مرۆڤ دۆست بووە، نێوبراوو چ ووتار و باس بێت، چ لێکۆڵینەوە و کۆڕ و کۆنگرە وە چ کتێب بێت بە سیّ زمان (کوردی–عەرەبی–ڕووسی) بەرهەمی هەبووە،ئەمە جیا لەوەی کەوا زۆر لە بەرهەمەکانی وەرگێڕدراوەتە سەر زمانەکانی تر، نووسینەکانی بە شێوەیەکی گشتی زۆری لەبارەوە نووسراوە و گە لێك قسەشی لەسەر ووتراوە، زۆر جار لەگەڵ چاپکردنی بەرهەمێکی دا لە چەندین ڕۆژنامە و گۆڤارەوە نووسەران قسەوباسیان لە سەری کردووە، یان بووە بە مایەی مشت و مڕوباس و لێکۆڵینەوە لەگەلێك شوێن دا لەلایەن کەسانی شارەزاوە بەرز نرخێنراوە، بەلاّم لەگەڵ بوونی هەموو ئەمانەش کە سانێك هەبوونە ڕەخنەی بیّ سەر و بەریان لیّ گرتووە، ڕاستە نێوبراویش وەك وهەر مرۆڤێکی تر بەدەرنی یە لە ڕەخنە و کەم و کورتی و تەنانەت هەڵەشی کردووە، چونکی ئەم کاری کردووە و لەمیانەی ئەم کارەی دا سەرکەوتووە و دەریش کە وتووە لە نێو مێژوونووسان دا، جابۆیە دەبێت هەڵە و کەم و کورتیشی هەبێت، هەر خودی (پ.د.کەمال مەزهەر ئەحمەد) ووتەیەکی ((لینین)) دەهێنێتەوەودەڵێت (ئەو کەسەی کەهیچ ناکات، هەڵە ناکات)، وێڕای ئەمەش هەتا وەك و ئێستا کەسێك نەها تووە بەشێوەیەکی زانستی و ئەکادیمییەوە هەڵە و کەم و کورتییەکانی ئەم مێژوو نووسەمان بۆ بەدیار بخات،بیّ گوومان بۆ خۆیشی پیّ ی خۆشە. تازە بمانەوێت و نەمانەوێت نووسین و بەرهەمەکانی ئەوەی ئێمە تێبینیمان کردبێت، ئەگەر پڕکردنەوەی کەلێنێك

نەبووبێت لە بواری مێژووی نوێ وهاوچەرخی کوردا،ئەوەبێ گومان داهێنانێك بووە لە نووسین وە هەروەها تازەگەریشی پێوە دیاربووە، وە دەتوانین بڵێین هەروەکو چۆن خۆی لە ((مێژوو))دا دەڵێ"مێژوو وەك خوێی چێشت وایە"، ئێمەش وای دە بینین بەرهەمەکانی بۆ مێژووی نوێ و هاوچەرخی کوردبووە بەگەورەترین کەرەستەی خاووی مێژوونووس،چونکی بەڕاستی بەرهەمەکانی لێوان لێوە لە ڕاستگۆیی زانستی، وەهەروەها لە نووسینەکانی دا بەحوکمی شارەزا بوونی لە زمانەکان،چەندین کتێب و بەڵگەنامەی نهێنی بەکار دەهێنێ کە دەگمەنن وهە ندێکیشیان دانسقەن،وە تاڕادەیەکی زۆرباش بێ لایەنانە بابەتەکانی دەنووسێت و بە دوورە لە ژێر کاریگەری و فشارەکان دا نی یە ، ئەمە جیا لەوەی کەوا بەزمانێکی سادە و ئاسان دەنووسێ و دوورە لە ئاڵۆزی ، یەکێك لە خەسڵەتەکانی ئەم مێژوونووسە گەورەیە ئەوەیە کە (پێڕستی ناوەکان) لە نووسینەکانی دا پەیڕەو دە کات، ئیدی ناوی کەسایەتی بێت یاخود ناوی شوێن وبابە تی تر بێت، کە ئەمە زۆر گرنگە و زۆر بە دەگمەن لە بەرهەم و نووسنەکانی ئەمڕۆدا بەدی دەکرێت، وابزانم هەتاوەکو هەنووکەش نەك هەر خوێندنەوەی تەواو بۆ بەرهەمەکانی نەکراوە، بەڵکو بە تەواویش مافی خۆیان وەرنە گرتووە، گومان لەوەدا نی یە کە دەبێ لەدواڕۆژدا چەندین لێکۆڵینەوە و نامەی ماجستێر و دکتۆرا لەبارەی نووسین و بەرهەمەکانییە وەبکرێ، نەك هەر ئەوە بەڵکو دەشێ لێکۆڵینەوەی قووڵ و تێروتەسەل لەسەر تەنها بەرهەمێکی وەك و(کەرکوك) یاخود (کوردوکوردستان ...)ی بکرێت.ڕاستە (پ.د.کەمال مەزهەر ئەحمەد) بە نووسین و بەرهەمەکانی دا زۆر کەلێنی پڕکردۆتەوە، بەڵام ئێستاشی لەگەڵ دابێت زۆر مەسەلەی مێژوویی ماوە و تاڕادەکیش نە خراوە بە لایەك دا، یاخود دەتوانین بڵێین چەند پرسێ هەیە پێویستی بە قەڵەمی نێوبراوو هەیە نەك کەسانی تر کە ئامانجییانە ئەو پرسە بشێوێنن، لەوانە(مەسەلەی کورد و پەیوەندیکردنی بە

ئـاینی ئیـسلامەوە)، بـشیّ هۆکـاری خۆیـشی هـەبێت بـەڵام هـەر پێویـستە. وەپێویـستە لـە ئێـستاوە دەسـت بکرێـت بـە گردکردنـەوەی بەرهەمـەکانی. و بەزووترین کات چاپ بکرێت، وەهەروەها گرنگیشە کتێبێك ئامادەبکرێت یاخود بۆ نووسین و بەرهەمەکانی خۆی وە ژمارەی ئەو کتێبانەی کەوا لە کتێبخانەکەی دایە تەرخان بکرێت، چونکە ئەم کارە ئەگەر ئێستا زۆر گرنگ نەبێت لـە پاشـەڕۆژدا دە بێت ئاخ وداخی بۆ بخورێ، بەڵام بەهەڵسوڕانی ئەم کارە نێـوی بـاوکی مێـژوویی نەتەوەی کورد زیاتر گەشاوەتر و شەکاوەتردەبێت.

# گەشتی زانستی

قادر عمر علی

چەند ساڵێکە بەشەکانی مێژوو لە زانکۆکانی کوردستان دا لە ساڵی چوارەمدا گەشتێك بە ناوی گەشتی زانستی بۆ یەکێك لە شارەکانی کوردستان دەکەن، بۆ نموونە بەشی مێژووی کۆلێجی ئاداب زانکۆی سەلاحەدین بۆ دەڤەری بادینان و پتر بۆ شاری دهۆك دەچن بۆ ماوەی سێ ڕۆژ و دووشەو و گەشتەکە بە چوون و هاتنەوە بەردەوام دەبێت. بەشی مێژووی زانکۆکانی تری کوردستانیش هەریەکە بۆ شارێکی تری کوردستان یان هەولێر یان سلێمانی دەچن. دیارە پارەیەکی زۆر لەم گەشتە زانستیانە خەرج دەکرێت کە تیایدا قوتابیان و مامۆستایانی یاوەریان نووستن و خواردنیان لەسەر حیسابی حکومەت بۆ دابین دەکرێت.

بۆچوونێك هەیە کە ئەم گەشتانەی کە بەشە جیاوازەکانی زانکۆکانی کوردستان لە ساڵی چوارەمدا بەبەشەکانی مێژووشەوە پێی هەڵدەستن بەگەشتی زانستی ناخوێنێتەوە بەڵکو بەکات بەسەربردن و پارە بەفیڕۆدانی دەزانێت. بەڵام من وەکو دەرچوویەکی بەشی مێژوو لە ساڵی خوێندنی ١٩٩٣-١٩٩٤ سوودو چێژێکی زۆرم لەم گەشتە زانستییە بینیوە بەهەمان شێوە زۆربەی هاوڕێکانی هاوخولی دەرچوونم بۆچوونی باشیان لەسەر ئەم گەشتە هەبووەو بەزانستییان زانیوەو هیواخوازبوون کە ساڵانی تریش بەردەوام بێت. بۆ ئەوەی قوتابیانی تر سوودی لێ وەربگرن، هەروەها خۆزگەی ئەوەش هەبووە کە ئەگەر بکرێت گەشتی زانستی بۆ قوتابیانی مێژوو بۆ پارچەکانی تری کوردستان کوردستانی سوریا، ئێران، تورکیا

ڕێك بخرێت یان بۆ وڵاتانی دوور تاکو قوتابیان بە شێوەیەکی پراکتیکی ئەو ناوچانە ببینن کە لە کتێبەکان و وانەکان دا زانیاریان دەربارەی وەرگرتوون .

ئەگەر ڕێکخستنی گەشتی زانستی بۆ پارچەکانی تری کوردستان یان وڵاتانی دوور لە عێراق ئاسان نەبێت بە پاساوی زۆری تێچوونی دارایی، ئەوا پێشنیار دەکەم کە بەشەکانی مێژوو لە زانکۆکانی کوردستان لە هەولێر و سلێمانی و دهۆك و کۆیە گەشتی زانستی بەرەو شاری کەرکوك ئەنجام بدەن ، چونکە بەراستی هەست بەوە دەکرێت کە زۆربەی قوتابیانی بەشی مێژوو بێجگە لە کەرکوکیەکان شارەزاییان لەسەر شاری کەرکوك نییە لە کاتێکدا کە زۆر گرنگە بۆ قوتابی بەشی مێژوو و دەرچووی بەشی مێژوو ئاگاداری ڕەوشی مێژوو ئێستای شاری کەرکوك بێت، جا ئێستا لە داوی سالّی ٢٠٠٣ دەکرێت ئەم جۆرە گەشتە زانستیانە لە شارەکانی تری کوردستانی عێراقەوە بۆ شاری کەرکوك ڕێك بخرێت.

ئەمەش لەلایەك دەبێتە هۆی پتر بەستنەوەی مێژوونوسان بەکەرکوکەوە لەلایەکی تریشەوە پەیامێکیش دەبێت بۆ دۆستان و دوژمنان کە کورد چەند پەیوەستە بەکەرکوکەوە.

# پادشا نەڕام سین "٢٢٦٠-٢٢٢٣"پ•ز
# نرام سين-ملك جهات العالم الاربعه

ن: فەوزی ڕەشید
و: ئامانج نازم بیجان

ئەو زانیارییانەی لەسەر پادشا نەڕام سین و،پاشا ئەکەدییەکان لەبەردەست دایە، بە شێوەیەکی گشتی جەخت لەسەرئەوە دەکاتەوە، کە پادشا نەڕام سین شکۆ مەندترین پاشای نەوەی ئەکەدییەکان بووە بەهەر هەموویانەوە، لە ناوبانگی و گرنگیشدا، بێجگە لەباپیرەی (سەرجۆن) ی ئەکەدی، دامەزرێنەری ئیمپراتۆرییەتی ئەکەدی، کەس هاوسەنگی ناکات•وە لە یەکەمین ئەو کارانەی کە ئەوەی سەلماند بێت، شکستە خێراییەکەی بوو، بۆ تەماحی پیلانگێڕان، کەوا (مانشتوسو) ی باوکیان کوشت، ئەویش بۆ تەماحی بەدەستەوەدانی بەڕێوەبەرێتی کاروباری فەرمانڕەوایی و، دوورخستنەوەی خێزانی پاشا سەرجۆن لەتەختی پادشایەتی دابوو•ئەگەر پاشا نەڕام سین خاوەنی بەهرەی سەرکردایەتی و زیرەکییەکی تیژ و، ئازایەتی بێ سنووری نەبووایە، نەیدەتوانی بەسەر ئەو کۆمەڵە پیلانگێڕانە دا زاڵ بێت، کەوا باوکیان کوشت، جا پادشاش دەسەلاتی لە نێو خێزانەکەی دا پاراست• ناوی پادشا نەڕام سین بەزمانی ئەکەدی ، واتای (خۆشەویستی خوداوەندی سین)دەگەیەنێت، ماوەی فەرمانڕەواییکردنیشی، لە ماوەی فەرمانڕەوایی مامی پاشا (ریموش)و، (مانشتوسو) ی باوکی زۆرتربووە، ماوەی فەرمانڕەواییکردنی پادشا نەڕام سین گەیشتۆتە سی وحەوت (٣٧)ساڵ• لە

میانەی یەکێك لەو دەقە مێخییانەی کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای هەزارەی دووەمی پێش زایین· بۆمان بە دیار دەکەوێت کە پادشا نەرام سین لە سەرەتای فەرمانڕەوایی دا، ڕوو بەڕووی چەندین ڕاپەڕین بۆتەوە، کە هەموو دەوروبەری ئیمپراتۆری ئەکەدی گرتۆتەوە·لە ناوچەی (بابل)، واتا لە بەشی ناوەڕاست وباشووری عێراق دا، زۆربەی شارە بابلی و سۆمەرییەکان، دژی پادشا شۆڕش یان کردووە، وەك و(کیش)، (کوپا–گردی ئیبراهیم)، (کازالو)، (مرد–ونەوالصدوم) ، (اوما) ، (نفر) ، (الورکاو و سپار)·وە لە ناوچەی کەنداوی عەرەبیش دا، شاری (مگان–عومانی ئێستا) ڕاپەڕینی دژی پادشا کردووە·وەلێ لەلای ڕۆژهەلاتیشەوە، دیسان هەر یەك لە ناوچەی (عیلام)و هاوپەیمانەکەی (ورخشی) و، شاری (مردمان) و (سیروم)یش شۆڕشیان کردووە، لەلای باکووری ڕۆژهەلاتیشەوە دیسانەوە، شاری (نمار) کە دەکەوێتە سەر زێ ی خواروو، وە شاری (ابیشال)یش شۆڕشیان کردووە، لە لای ڕۆژئاواشدا شاری (ماری–گردی ئەلحەریری نزیکی ئەلبوکمال) دیسان شۆڕشی دژی پادشا کردووە· جا هەندێك کەس پرسیار دەکات و، دەڵێت هۆکاری ئەم ڕاپەڕینە زۆرانە چی یە ؟ کە ڕووبەڕووی پادشا نەرام سین بۆتەوە، لە سەرەتای وەرگرتنی فەرمانڕەوایدا ! ئایە هۆکارەکەی لاوازی کەسایەتی بووە، یاخود لێرەدا هۆکارێکی ترهەیە ؟ بۆ بەرسڤدانەوەی ئەو پرسیارە دەڵێین : کارەکانی پادشا و ئەنجامدانە گەورەکانی کەپێشکەشی کردووە، ڕاستگۆترین بەڵگەیە لەسەر پادشا، کە دەرکەوتووترین پادشاکانی ئیمپراتۆری ئەکەدی بووەو، هاوسەنگی دەکات لە گرنگی دا·وە گرنگی باپیرەی، پادشا (سەرجۆن) دامەزرێنەری ئیمپراتورییەت؛ لە هەندێك شت دا، لە پادشا نەرام سین لەپێشترە، بەمەش ناتوانین باوەڕمان بەوە هەبێت، کەوا کەسایەتی پادشا پەیوەندییەکی ڕاستەوەخۆی بەو ڕاپەڕینانەوە هەبێت، بەڵکو هۆکاری ڕاستەقینە ئەوەیە ، کە دەگەڕێتەوە بۆ باوەڕی عێراقییە کۆنەکان بە

بەهرەی سەرکردایەتییەوە، ئەویش جگە لەچالاکێتی دابڕو لەمرۆڤ دا هیچی ترنی یە، جا ئەگەر ئەم چالا کییە لە پیاوێکدا توایەوە، ئەوە ئەو پیاوە بە پێویست دەگۆڕدرێت بۆ سەرکردەیەکی پالەوان، وێڕای ئەمەش باوەڕییان وابووە وولاتی چالاکی بەهرەی سەرکردایەتیش ئاسمانە، وەئەوەی جەخت لەسەر باوەڕی عێراقییە کانیش دەکاتەوە، کە وولاتی ئەم چالاکییە ئاسمانە، ئەو نەخشە مێخییانەیە کە تایبەتە بە یەك لەدوای یەکی نەوەی پادشاکان، کە بە درێژایی مێژووی عێراقی کۆندا تێپەڕبوونە، وە بە نێوی (نەخشە سەلمێنراوەکانی پادشاکان)ەوە ناسراوە، هەر ئەم نەخشانەش ئامارەی بەوە کردووە، کە پادشایەتی لەئاسمانەوە هاتۆتە خوارێ ودابەزیووە، ئەویش پاش نەمانی ئەو لافاوەی لەسەر زەوی دابووە ، وە لەشاری (کیش) دا توایەوە و، بەمەش (کا··ور) بوو بە پادشا لەسەر (کیش)·

وە لە بەڵگەکانی تریشدا جەخت لەسەر بیروباوەڕی عێراقییەکان دەکاتەوە، کەوا بەهرەی سەرکردایەتی و بەهرەکانی تری مرۆیی، جگە لە چالاکییە دابڕاوەکان لە مرۆڤ دا هیچی تر نی یە، جا ئەگەر یەکێکیان لە کەسێك دا توایەوە، ئەوە ئەو کەسە دەگۆڕدرێت بۆ مرۆڤێکی بەهرەدار، بەو جۆرە چالاکییەی کەتێیدا تواوەتەوە· کە ئەویش لە ئەفسانەیەکی ناسراودایە، بە ناوی ((گەشتی خوداوەندی "ئینانا" بۆ شاری "اریدو"))، ئەم ئەفسانەیە جەختی لەسەر ئەوە کردۆتەوە، ئەو چالاکییانەی کە دەبێتە هۆی بەهرەو کارامەییە مرۆییەکان ، لە حەوزەی خوداوەندی "اینکی"دا بوونی هەیە، خوداوەندی (ئاو) و(زەوی) و(دانایی)، لەبەر ئەمەش کاتێك خوداوەندی "ئینانا"بڕیاری پێشکەوتنی شارەکەی دا و، بەرزبوونەوەی کاروبارەکەی لەنێو شارەکان دا، یەکسەر رووی کردە شاری"اریدو"، ئەو شارە بوو کەوا باوکی خوداوەندی (اینکی) پیرۆزی تێدا دەکرد و، خاوەن چالاکی بەهرە و کارامەییەکان بووە·ئەمەش کە لەدوایی دا دێت،

پوختەی ئەو ئەفسانەیەیە: — ((خوداوەندی "اینانا" لە سەرەتا ودەستپێکردنیدا تاج لەسەر دەکات ، کە بە تاجی دەشت ناو دەبرا، پاشان بە تەنها دەست دەکات بە گەشتەکەی بۆ شاری "اریدو"، خوداوەندی "اینکی"یش بیستنی هەواڵی ئەوەی لەلابوو، کەوا خوداوەندی "اینانا"ڕوو دەکاتە شاری "اریدو"، خوداوەندی "اینکی"یش داوای لە وەزیری خۆی کرد، کە بە "اسیمو" ناودەبرا، پێشوازی لە خوداوەندی "اینانا"دا بکات لە کاتی گەیشتنی دا بۆ سنووری شاری"اریدو"، وەهەروەها ئاوی ساردیشی پێشکەش بکات و، داواشی لێکرد ئاوی جۆی"امام الاسد"یش پێشکەشی بکات، کە لە پەرستگای شاری "اریدو" دا دەردەچێت، پاش ئەوەی وەزیری خوداوەندی "اینکی" ئەم ئەنجامدانانەی جێ بەجێ دەکات، هەڵدەستێت بە ئاهەنگی شەو بۆ خوداوەندی "اینانا"، لەسەر سفرەیەك كە بەسفرەی ئاسمان ناونرابوو، پاشان ووشەی پێشوازی پێشکەش دەکات بەهۆی هاتنییەوە، دوای ئەوەش لە پەرستگای"ابو" پەرستگای خوداوەندی "اینکی"دا کۆبوونەتەوە، هەستاوون ئاوجۆیەکی باشیان خواردۆتەوە، جا لە میانەی ئەمەشدا، خوداوەندی(اینکی) زۆرتێك چووە، کەچی یەکسەر ڕازی بووە بە دانی هەموو ئەوانەی کە هەیە، بیدات بە خوداوەندی(اینانا)، لەو هێزە— "چالاکییەکان"، کە هۆکارێکە بۆ بەهرە و ئەو کارامەییە پیشەسازییانەی کە لەلای ئادەمیزاد دایە·پاش ئەوەی خوداوەندی (اینکی) بە کاریگەری ئاوجۆیەکە هاواری لێ هەستاو، بینی ئەو هێزەی کەوا هۆکارێکە بۆ بەهرە و کارزانی وکارامەییە پیشەسازی و کشتوکاڵییەکان، لە توانای تایبەتمەندێتی خۆی دا نەماوەتەوە· خوداوەندی (اینکی)یش بە باشی دەیزانی کەوا خوداوەندی (اینانا)، ئەو دۆخەی کە تێیدابووە، بۆخۆی بە کاری هێناوە و،هێز—"چالاکییە"باسکراوەکانی لێ بردووە،جا کاتێك خوداوەندی (اینکی) لە وەزیرەکەی خۆی پرسیاری لە بارەوە کرد، ئەویش ئاوەها وەڵامی دایەوە: پادشایەکەم واتە خوداوەندی (اینکی)، بۆ

خۆی دای بە کوڕەکەی، ئەویش لەسەر پشتی کەشتییەکەی دا هەڵیگرت، کە بە کەشتی ئاسمان ناودەبرا، ئێستاش لەڕێگادایە بەرەو شاری(الورکاء)٠

کاتێك خوداوەندی(اینکی) فەرمانی گرتنی خوداوەندی (اینانا)ی دا، وەزیرەکەی بە پەلە بەدووی خوداوەندی(اینانا) دا کەوت، هەتاوەکو پێ ی گەیشت و داوای گەڕانەوەی هێز-"چالاکییەکان"ی لێکرد کە باسکرا، ئەویش بەرپەرچی دایەوە وگووتی: چۆن دەبێت خوداوەندی (اینکی) لە قسەکەی خۆی پاش گەزبێتەوە و، داوای ئەوەم لێبکات، ئەوەی پێی داووم بیگەڕێنمەوە ! من وەلامی داواکارییەکەی نادەمەوە٠کاتێك وەزیری خوداوەندی (اینکی) هەوڵی گرتنی کەشتییەکەی دا، وەزیری خوداوەندی (اینانا) توانی لەو هەوڵەیدا ڕا بکات، وەکاتێکیش هەواڵ گەیشتە خوداوەندی (اینکی)، فەرمانی دا بە ناردنی دروستکراوە دەریاییە جۆر بەجۆرە جیاوازەکان، بۆ ئەو حەوت شوێنەی کە نەفەرەکان لەکاتی گەشتی دەریایی نێوان شاری(اریدو) و (الورکاء) دا دەوەستن، ئەویش لە پێناوی دەست بەسەراگرتنی بەلەمی خوداوەندی (اینانا)دا بوو٠سەرەڕای ئەو دژوارییانەش، خوداوەندی (اینانا) توانی بە کەشتییەکەی دا ، بگاتە شارە خۆشەویستەکەی خۆی (الورکاء)، جا ڕۆڵەکانی شاری نێوبراویش، بە چەندین ئاهەنگی خۆشی وداوەتی دلخۆشی وشادومانییەوە پێشوازییان لێکرد، بۆ ئەوەی کە توانیوویەتی هێز-"چالاکییەکان" بە دەست بهێنێت، کە هۆکارە بۆ بەهرە و، کارزانی وکارامەییە پیشەسازی و کشتوکاڵییەکان، ئەو هێزەی کە توانای ئەوەی هەیە، شاری (الورکاء) پێشبخات و، کاروباری بەرز بکاتەوە لە نێوشارەکان دا٠ لە ئەوەی پێشکەش کرا، بە ڕوونی دەردەکەوێ، کە دانیشتوانی (بلاد وادی الرافدین)- وولاتی دۆڵی ئەلرافیدەین ، هەر هەمووی باوەڕییان وابووە بەهرە و کارامییەکان بە گشتی و تێیدا بەهرەی سەرکردایەتی، جگە لەبەهرەکانی تر، شۆێنەکەی ئاسمانە، وە لە هەموو مرۆڤێك دانی یە، بەلکو لە ژمارەیەکی خەلکی

دیاریکراودا هەیە وبەدی دەکرێت ، لەبەر ئەوەش هەرێمەکان یاخود دەوڵەتە بچووکەکان، کە نیاز وبڕیاری دابڕان دەدات لە یەکێتی دەوڵەتەکەیدا، شۆڕش و یاخی بوونەکەی دەست پێناکات، مەگەر کاتێك کە فەرمانڕەوایی دەگواسترێتەوە، لەپادشایەکەوە بۆ یەکێکی تر، ئەویش لە ڕێگەی بۆماوەییەوە بێت، چونکە بیریان لەوە دەکردەوە کەپاش ئەم ماوە ودیاریکردنە ، پاشای نوێ بەهرەی سەرکردایەتی لەلانی یە، وێڕای ئەوەش لە فەرمانڕوایکردنیدا نوێ یە و، شارەزایی وئەزموونی تەواویشی لەم بوارەدا وەدەست نەهێناوە، ئەگەر پادشای نوێ بەڕاستی وکردارەکی بەهرەی سەرکردایەتی نەبووایە، ئەوە زۆر جار شۆڕشگێڕان دەیانتوانی ئامانجەکانیان جێ بەجێ بکەن، ئەگەریش پادشایەکی ڕاستگۆ و، بەهرەی سەرکردایەتی ڕاستەقینەی هەبووایە، ئەوە لە زۆرینەی کاتدا شکست بەشی شۆڕ گێڕان و دەوڵەتە بچووکەکەشیان دەبێت·جا لەبەر ئەوەی پادشا نەڕام سین لە ڕێگەی بۆ ماوەییەوە، جڵەوەی ئیمپراتۆرییەتی ئەکەدی وەرگرتووە، وە لەدوای هەردوو پادشایەکەش، لە سەرکردایەتی دا بەهرەیەکی باشتر بەدیارنەکەوت ·بۆیە بە هاتنی پاشا (نەڕام سین) یش بۆ فەرمانڕەواییکردن، هیوای ئەوانەی زیادکرد، کە ئارەزوویان دابڕان بووە لە جەستەی ئیمپراتۆرییەتی ئەکەدیدا، پێشیان وا بووە پادشای نێوبراوو لێهاتوویی وبەهرەی، لەباوکی پاشا (مانشتوسو) و لە مامی پادشا (ریموش) کەمتر دەبێت، وەهەر لەبەر ئەمەش بووە، کە تەواوی بەشەکانی ئیمپراتۆری ئەکەدی شۆڕشیان کردۆتە سەری·ئەو هۆکارەش کە وایکرد، تەواوی بەشەکانی ئیمپراتۆرییەتی ئەکەدی، ئارەزووی دابڕانی هەبێت لە جەستەی دەوڵەتێکی یەکگرتوو، بە ڕەهایی ناگەڕێتەوە بۆخراپی هەڵسوکەوتی پادشا ئەکەدییەکان، بەڵکو لەبەر ئەوەی، لەپاش سیستەمی دەوڵەتێکی گەورەی یەکگرتوو وەك وئیمپراتۆرییەتی ئەکەدی، ئەم بەشانە هێشتا دروست نەبوو بوون، چونکی شێوازی فەرمانڕەوایی پێش

دامەزراندنی دەوڵەتی ئەکەدی ، بەسیستەمی دەوڵەتۆکەی شارەکان ناو دەبرا، واتە هەموو شارێك یاخود هەندێك لەشارەکان ، دەوڵەتێکی سەربەخۆ بووە و، خۆیشی پێی هەڵدەستا، وە لەبەر ئەمەش کرداری کۆکردنەوەی ئەم دەوڵەتۆکانە لە تاکە دەوڵەتێك دا، ئەزموونێکی نوێ بووە بۆیان و، لەهەمان کات دا بێ هاوتا بووە لەجۆریدا ، وە لەبەر ئەوەش کارێکی ئاسان نەبوو بۆ نەتەوەکانی ناوچەکە، کە ئەم شێوازە نوێ یە بە خێرایی پێك بهێنن، بەڵکو پێویستی بە بابەتی ڕەزامەندی هەیە، وەك و ئەم سیستەمە کە کاتێکی درێژی دەوێ · وەئەوەی جەخت لەسەر ئەم ڕاستی یە دا دەکاتەوە، ئەوەیە کە لە دۆڵی نیل دا ڕووی داوە، کاتێك پادشا(منا) دامەزرێنەری بنەماڵە ونەوەی یەکەم، هەستا بە یەکگرتنی وولات لە مەملەکەتێکی یەکگرتوودا لە دەوروبەری(٣٠٠٠)ی پێش زایین دا ، دیسان ڕاپەرینێکی زۆر دژی ڕووی دا، وە ئەم ڕاپەرینانەش بەردەوام بووە بۆ ماوەی سالأنی (٣٠٠٠-٢٧٧٨) ی پێش زایین، هەتاوەکو هاتنی پادشا (خع سخموی)ی باوکی پادشا (زوس) ، دامەزرێنەری بنەماڵەی سێیەم، کە بە کردار توانی دەست بەسەر ئەو ڕاپەرینانەدا بگرێت و، یەکێتی مەملەکەتی باکوور و باشووریشی کرد بە یەك مەملەکەت· ئەمە وێڕای ئەوەی سیستەمی دەوڵەتێکی یەکگرتوو لای دانیشتوانی ناوچەکە پێك نەهاتبوو، عیلامیییەکان لەڕۆژهەلأت و کوتییەکانیش لەلای باکووری ڕۆژهەلأت و، سۆبارییەکانیش لەلای باکوورەوە، فاکتەرێکی تربوون بۆ وورووژاندنی ئەو بزوتنەوە دابڕاوانەی کەڕووی دابوو· بەلأم بەهرەی سەرکردایەتی پادشا نەرام سین توانی بەسەر هەموو ئەو بزوتنەوانەدا زاڵ بێت و، پایەکانی ئیمپراتۆرییەت جێگیربکات، وە توانی لە فەرمانڕەوایی دا بمێنێتەوە، هەتاوەکو تەمەنی گەیشتە، نزیکەی(٨٠) هەشتاساڵ ، چونکی ئەو زانیارییانەی کە هەن، جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە پادشا نەرام سین کاروباری فەرمانڕەوایی لە دەوروبەری (٤٠)چل ساڵی تەمەنی دا وەرگرتووە، چونکە باوکی (مانشتوسو)،

کاتێك لەسەر تەختی پادشایەتی دانیشت، گەنج نەبووە، وە بەڵگەش لەسەرئەمە، (مانشتوسو)و برایەکەی (ریموش)، هەردووکیان کوڕی پاشا سەرجۆن بوونە ، کە ماوەی شەست وپێنج ساڵ لە فەرمانڕەوایی دابەردەوام بووە، ئەمەش واتای ئەوە دەگەیەنێت، کوڕە گەورەکانی وئەوانەی پاڵێوراوبوونە بۆ وەرگرتنی فەرمانڕەوایی لە دوای خۆی، تەمەنیان لە (٣٠) سی یاخود(٤٠) چل ساڵ تێپەڕیوە، جا پادشا (سەرجۆن) یش هەتاوەکو ئەوکات لەسەر تەختی فەرمانڕەوایدا بووە، وێڕای ئەمەش (مانشتوسو) دوای براکەی (ریموش) فەرمانڕەوای کردووە·جا لەبەر ئەمەش هەر چۆنێ بووبێت، تاڕادەیەك گەورەبووە، کاتێك هاتۆتە سەرتەختی ئیمپراتۆرییەتی ئەکەدی، بەگوێرەی ئەوەش بێت، کوڕە نۆبەرەکەی، نەرام سین پیاوێکی پێگەیشتوو بووە، واتا لە دەوروبەری (٤٠) چل ساڵی دابووە، کاتێك فەرمانڕەوایی وەرگرتووە، وە مانەوەشی لە دەسەڵات دا (٣٧) سی وحەوت ساڵی خایاندووە، واتە لە فەرمانڕەوایی کردنی ئیمپراتۆری ئەکەدی دا مایەوە ، هەتاوەك و بووبە پیرەمێردێکی گەورە، ئەم ڕاستییەش سەلماندنی جیاکاری لێهاتوویی وباشی وتاکی کەسێتی سەرکردایەتییەکەیەتی، بەمەش دەتوانین بڵێین پاشا نەڕام سین ، نوسخەیەکی کوتومت بووە، لەکەسایەتی باپیرەی سەرجۆن، دامەزرێنەری ئیمپراتۆری ئەکەدی·

# کەسایەتیی ناسراوی شاری هەولێر
# " عمر أمین "

د. محمد عبدالله کاکە سوور

هەولێر خاوەنی چەندین کەسایەتیی مێژوویيە کە جێ پەنجەیان لە مێژووی سیاسی و کۆمەڵایەتیی شارەکە و کوردستان دیارە. هەندێکیان وەکوو پێویست گرنگییان پێوە دراوە و هەندێکیان پتر لە پێویست ناسراون و گەورە کراون, هەندێکیشیان لە چاو ئەو رۆڵە گەورەیەی لە مێژووی شارەکەدا هەیانبووە غەدریان لێ کراوە. بەم غەدرکردنەلێشیان ناهەقی بەرامبەر هەولێر و مێژووی کورد کراوە.

یەکێك لە رۆشنبیرە هەرە دیارەکانی شاری هەولێر کە دەکرێ نازناوی (رۆشنبیری بێنازی) بدرێتێ (عمر أمین ) ـە کەدەکاتە باوکی پرۆفیسۆر (وریا عومەر ئەمین) .

(عومەر ئەمین ) یەکێکە لەو مامۆستا پێشەنگانەی کە پێش هاتنی کارەبا بۆ بۆ شاری هەولێر ئەم بە چرای زانست و رۆشنبیری و خوێندەواری شاری هەولێری رووناك کردۆتەوە.چەندین منداڵی کوردی هەولێر و کۆیە و عنکاوە و شەقڵاوە و سلێمانی و گەلێ لە شارۆچکەو دیهاتەکاندا لە ژێر دەستی ئەو فێری نووسین و خوێندن بوون. مسعود محمد و دڵداری شاعیر و دڵزاری شاعیر و دەیان کەڵە نووسەر و ئەدیب و کەسایەتیی کورد قوتابیی مامۆستا عومەر ئەمین بوون.(عومەر ئەمین) جگە لەوەی مامۆستا و پەروەردگارێکی زۆر مەزن بوو کوردێکی پاك و

تێکۆشەرێکی دڵسۆز بوو.یەکەم کەسە لە شاری هەولێر هەر لە بیستەکانی سەدەی رابردووەوە ناوی کوردی لە منداڵەکانی بنێ و ئەم نەریتە پیرۆزە لە هەولێر بڵاوبکاتەوە.مامۆستا عومەر ئەمین ناوە ناوە شیعر و نووسینی لە گۆڤاری (هەتاو) ی مامۆستا (گیوی موکریانی ) دا بڵاو دەکردەوە .

کە خەریکی ئامادەکردنی نامەی دکتۆراکەم بووم کە سەبارەت بە گەشەکردنی خوێندنی فەرمیی بوو لە لیواکانی کوردستانی عیراقدا لە ١٩٢١ تا ١٩٥٣ , لە ڕێی بەڵگەنامەکاندا رۆڵی گرنگ و پڕ لە شانازیی ئەو زاتە بەرز و پیرۆزەم بۆ دەرکەوت کە مامۆستا عمر أمین یێکێکە لە کۆنترین مامۆستاکانی شاری هەولێر. و کۆڵەگەیێکی رۆشنبیریی نەك هەر هی شاری هەولێر بەڵکو هی هەموو کوردستان بوو. بەڵام مخابن تا ئیستا هیچ شتێکی بۆ نەکراوە و فەرامۆش کراوە کە دەبوو وەك وەفادارییەك پەیکەرێکی بۆ درووست بکرابا , قوتابخانەیێك یا کتێبخانەیێك یا شەقامێکی بە ناو بنرابا .

مامۆستا عمر أمین دەورێکی باڵای هەبوو لە بڵاوکرنەوەی خوێندەواری و رۆشنبیری لە کوردستاندا لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە . بە دەیان کەڵە نووسەر و شاعیر و ناوداری کورد قوتابیی بوون و لەژێر دەستی ئەودا فێری خوێندن و نووسین بوون. (دڵدار) ی شاعیر و (مسعود محمد) ی بیرمەند و (دڵزار) ی شاعیر و زۆری تر قوتابی ئەو بوون.

مامۆستا مسعود محمد لە ئاڵقەی پێنجەمی ( گەشتی ژیانم ) دا کە لە گۆڤاری رۆشنبیری نویێ ژ ١٠٩ ساڵی ١٩٨٦ ل ٢٨٠ دا لە بارەی مامۆستا (عمر أمین) ـەوە دەڵێ :

(مامۆستا ( عمر أمین ) خەڵکی هەولێر بوو. باشترین دەرسدەری ( قراءة ) و (حیساب) بوو . دوای دەیان ساڵ بۆی دەگێڕامەوە {خۆیشم لە بیرم بوو} کە لە ماوەیێکی کورتدا فێری نووسینی بووم ، هێندشم لێ رازی بوو کە زۆر جاران لە

کاتی دەرسدا بە دوایدا دەناردم لە پۆلی خۆمەوە بۆ پۆلی لە خۆم هەورازتر، دەچووم پرسیارێکم وەڵام دەدایەوە کە قوتابییەکی ئەو پۆلە وەڵامی پێ نەدرابۆوە. تا بشلێی مەمنوونی دەکردم کە دەمبیستەوە لای باوکم رەزامەندیی خۆی بەرانبەرم دەربڕیوە .

مامۆستا ( عمر أمین ) لە پاش خۆی دیارییەکی باشی بۆ سەقافەتی کوردی بە جێ هێشتووە ، ئەویش ( د. وریا عمر أمین ) ە کە لە سەقافەتی نوێی زمانەوانیی ئەورووپا بەرخوردار بووە و خزمەتی زمانەکەمانی پێ دەکات).

مامۆستا (بەشیر حسین سعدی) لە ژمارە (٦)ی گۆڤاری (مێژوو) ی ٢٠٠٨ دا ل ٣٧٩ – ٣٨٢ لە بارەی مامۆستا عومەر ئەمینەوە دەڵێ:

(لە ساڵی خوێندنی ١٩٦٠ – ١٩٦٢ لە قوتابخانەی گۆڤەندی سەرەتایی بە یەکەوە مامۆستا بووین. ئەو بەڕێوەبەری قوتابخانە و منیش مامۆستای سەرەتایی بووم لای ئەوبەڕێزە , لەو کاتەش شۆڕشی ئەیلوول بەردەوام بوو بە سەرۆکایەتیی سەرۆکی نەمر مستەفا بارزانی.

ئەوەی شایانی بیرکردنەوەیە ئەوەیە ئەو بەڕێزە هەرچەن بە تەمەن گەورە بوو بەڵام هەستێکی نەتەوایەتیی کوردیی بەرزی هەبوو. لە یەك شانەی رێکخستن بووین. ئەو و مامۆستا محمد عزیز فتاح و من (نووسەری ئەم دێرانە) بە یەکەوە باسی ئەوەمان دەکرد کە چۆن ناوی قوتابخانەکەمان (گۆڤەندی ئێواران) بوو , کردیانە (شیبان المسائیە) ئەو جۆرە کردەوانە زیان بەوە دەگەیەنێ کە دەیانویست کوردیی قوتابخانەکان بکەنە عەرەبی ، ئەوەشیان لە زیان بەولاوە قازانجی هیچ لایەکی تری پێوە نییە.

مامۆستای خوالێخۆشبوو بۆمانی روون دەکردەوە کە گەلی کورد هەر بە ئامانجی خۆی دەگات . ئەم جۆرە کەسانەی بەربەرەکانێی کورد دەکەن بەشیان هەر لەناوچوونە نابێ ئەم جۆرە کردەوانە نائومێدمان بکات.

قسەکانی زۆر خۆش بوون هەر بە ئومێدی ئەوە بووین ئێوارە دابێ یەکتر ببینین.

لە خەسلەتە بەرزەکانی ئەوە بوو کە پیاوێکی راستگۆ بوو ، بیر و باوەڕی خاوێن و قسە خۆش بوو ، لە زانیاریدا پلەیێکی بەرزی هەبوو ، زۆر زیرەك و بلیمەت بوو، بەراستی ئەگەر خەڵك لای دانیشتایە فێری رەوشتی چاك دەبوو لای ئەو بەڕێزە. پیاوێکی دڵساف و راستگۆ بوو باسی کەسی نەدەکرد بە خراپە ، هەر گیروگرفتێك هەبایە هێمنانە جێبەجێی دەکرد بێ ئەوەی کەس لێی بڕەنجێ. هەزار رەحمەتی لێ بێ).

پرۆفیسۆر د. موحسین محەمەد حوسێن کە یێکێکە لەو قوتابییانەی لە قۆناغی سەرەتاییدا مامۆستا عومەر ئەمین دەرسی پێوتوونەتەوە لە بارەیەوە دەڵێ:

(لە ساڵی (١٩٥٢ – ١٩٥٣) لە پۆلی شەشەمی سەرەتاییدا بووم لە قوتابخانەی (ئیبن ئەلمستەوفی). مامۆستای خۆشەویست و زانا و پەروەردگار (عومەر ئەمین) وانەی (أشیا و صحە ) ی پێ دەوتینەوە. مامۆستایەکی یەکجار چاك بوو .. لە وانە وتنەوە زۆر سەرکەوتوو بوو.شێوەی وانە وتنەوەی و هەڵسوکەوتی ئاسایی نەبوو ، زۆر جیا بوو لە مامۆستاکانی تر. لەگەڵمان هەمیشەروو خۆشبوو هەرگیز لە وانەکانی بێزار نەدەبووین.. تا وای لێ هات وا تێبگەین کە ئەمە مامۆستا نییە. زانیارییەکی زۆری پێ بوو .. زۆر دڵسۆزانە بە دڵ هەوڵی دەدا بیانخاتە مێشکی قوتابییەکانی. شێوەی دەرسدانەوەی زۆر دڵگیربوو وای لە ئێمە دەکرد بەدڵ گوێڕایەڵی بین .بابەتەکانی بە شێوەیەکی کارەکی لە ئێمە دەگەیاند. ئێمەی دابەش دەکردە سەر چەن گرووپێك.. تێیگەیاندین ئەم هەورە لە کوێوە دێ ..چۆن باران دەبارێ .. بۆ چوارکەژ لە ساڵا هەیە؟..ئاوی کانییەکان لە کوێوە دێن.. ئەستێرە وهەتاو و مانگ و ئەستێرە و دیاردەکانی سروشتی چین و چۆن دەجووڵێنەوە..باسی زیندەوەر و گژوگیاو گوڵی بۆ دەکردین.. وێنە و نەخشە و ئامێری جۆراوجۆری دەسکردی

خۆی دەهێنا و بە هۆیانەوە دیاردەکانی روون دەکردەوە بە جۆری چێژێکی زۆری لێ وەرگرین و بەم جۆرە زانیارییەکی زۆری دەخستە مێشکمان و ئاسۆی بیرکردنەوەمانی فراوان دەکردەوە بە شێوەیێك هەرگیز لە بیرمان نەچێتەوە و وای لە ئێمە دەکرد خۆمان زیاتر بەدوایاندا بچینەوە و بۆ هاوڕێ و کەس و کاری خۆمانی بگێڕینەوە.هەرگیز ئەوەمان بیر ناچێتەوە کە هەمیشە ئامۆژگاریمانی دەکرد کە ( دەبێ لە دەوروبەری خۆمان فێر بین و لە بارەی هەموو شتێکەوە ئەم سێ پرسیارە ئاراستە بکەین (چۆن؟.. بۆ؟.. کەی؟..) و بڕوا نەکەین بە هەموو ئەوەی کە دەیبیستین تا خۆمان تاقیی نەکەینەوە و نەگەینە ئەنجام).ئێمە ئەوسا لەو شتانە بە ئاسانی حاڵی نەدەبووین بەڵام بەجۆری بۆی باس دەکردین ئێمەی دەوروژاند وای دەکرد بیر بکەینەوە.بەڕاستی مامۆستایەکی مامۆستا بوو.هەزار رەحمەتی لێ بێ)

پرۆفیسۆر د. موحسین
محەممەد حوسێن
یەکێ لە قوتابییەکانی
٢٠١٠/٦/٦

پرۆفیسۆر د. وریا عومەر ئەمین لە دیمانەیەکدا لە حەفتەنامەی (بەدرخان) دا لە بارەی عومەر ئەمینی باوکییەوە دەڵێ:

(..باوکم فەرمانبەر و مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی بوو. هەر چەن ساڵێ جارێ دەگوێزرایە یەکێ لە گوند و شارەکانی کوردستان. لە سییەکانەوە تا ساڵی ١٩٥٠ دوو جار , هەر جارەی بۆ پێنج شەش ساڵ لە شاری کۆیێ مامۆستا بووە. لەوێ دەرسی بە ئەحمەد دڵزار و دڵداری شاعیر و مسعود محمد زۆر لە کەڵە پیاو و ناودارانی کوردی ئەم شارەی وتۆتەوە. ) ....(باوکم خاوەن رەز و باغ

بوو لە شەقڵاوە. هەمووساڵ لە پشووی هاوینا ماڵمان دەچووە شەقڵاوە.پلەوێ لە بناری سەفین لە ناو رەز و باغە فێنکە دڵگیرەکاندا هاوینمان بەسەر دەبرد. )

...( ئەم گوێزانەوەیەمان لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێ دینامیکییەتێك و چێژێکی تایبەتیی بە ژیانی منالیم بەخشیبوو و بووە هۆی ئاشنابوونم لە گەلّ شێوە جیاوازەکانی کوردی و زمانەکانی تری کوردستان فێربم باوکم کتێبێکی زۆری هەبوو هەر لە منالییەوە چاوم بە کتێب و گۆڤارەکانی ئەو کردەوە....)

(....باوکم هاورێ و دۆستی زۆر لە رۆشنبیرە کوردەکانی سەردەمی خۆی بوو , زۆری ئەخوێندەوە. ناوە ناوەش وتار و شیعری ئەنووسی و لە گۆڤاری هەتاوی مامۆستا گیوی موکریانیی بلاو ئەکردەوە. زۆر جار منی لەگەلّ خۆی ئەبردە لای مامۆستا گیو لە چاپخانەکەیدا . باوکم پێش ئەوەی بمرێ وەسیەتی کرد ئەم چوارینەی لە سەر کێلی گۆڕەکەی بنەخشێنرێ:

به کاری چی دێ سەر و مالّ و ژیان
گەر بەختی نەکەی لە رێی نیشتمان
کوردم رواوم لە باغی ژیان
به ئاو و خاکی پاکی کوردستان) ...

....( باوکم هاورێ و هاوپۆلی گۆران بوو لە کەرکوك بەیەکەوە خوێندوویانە . منالّ بووم وەك دوێنێ بێ ئاوا بیرمە لە هاوینی سالّی ١٩٥٩ دا بوو لە شەقڵاوە گۆران هاتە لای باوکم , باوکم بە منی ناساند و ووتی ئەمە مامت گۆرانە شاعیرە. ئەویش دەستێکی بەسەری منا هێنا و ماچی کردم . بەیەکەوە گفتوگۆییێکی زۆریان لە بارەی شیعر و ئەدەبەوە کرد. یەکەم کسپەی دلّداریم لە گەلّ شیعرا و عیشقم بۆ گۆران لەوێوە دەست پێ ئەکات.)... ( باوکم فەرمانبەر و مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی بوو. هەر چەن سالّێ جارێ دەگوێزرایە یەکێ لە گوند و شارەکانی کوردستان. لە سییەکانەوە تا سالّی ١٩٤٨ دوو جار , هەر جارەی بۆ

بێنج شەش ساڵ لە شاری کۆیێ مامۆستا بووە. لەوێ دەرسی بە ئەحمەد دلزار و دلداری شاعیر و مسعود محمد و زۆر لە کەلە پیاو و ناودارانی کوردی ئەم شارەی وتۆتەوە) ..... ( لە تەمەنی دوو ساڵیدا بووم کە باوکم گوێزرایە شاری سلێمانی . لە پێنج ساڵیدا بووم گوێزرایە شاری هەولێر و لە شەش ساڵیدا بووم کە گوێزرایە گوندی عەنکاوە. لەوێ حەوت ساڵ بەڕێوەبەری قوتابخانەی سەرەتایی عەنکاوە بوو. لە ساڵی ١٩٦٠دا بە یەکجاری گەڕایەوە هەولێر تا لە ١٩٦٤/١/٤دا کۆچی دوایی کرد.)

ڕۆژنامەی بەدرخان ژ ٦٦

مامۆستا عمر امین لە بیستەکانی سەدەی رابردوودا لە پەیمانگای دارالمعلمین – لە بەغداد خوێدوویەتی لە ساڵی ١٩٢٥ بڕوانامەی وەرگرتووە. هاوپۆل و هاورێی فایق بێکەس و شێخ نوری شێخ ساڵح و مستەفا خۆشناو (ئەفسەری شەهید) و عزت عبدالعزیز ( ئەفسەری شەهید) زۆر لە کەسایەتییە کوردەکانی ئەوسا بووە . خەباتگێڕ و تێکۆشەرێکی ڕێی کوردایەتی بووە .. لەم بارەیەوە مامۆستا (نژاد عبدالله عزیز ) لە نامەیەکیا بۆ د. وریا عومەر ئەمین دەڵێ:

(لە بیستەکانی سەدەی پێشوودا.. ئەو قوتابییە کوردانەی کە لە بەغداد دەیانخوێند ڕێکخراوێکیان دامەزراند بە ناوی ( کۆمەڵەی کورد لە بەغداد) کە لەم زاتانە پێکهاتبوو:

عمر أمین – عبدالله عزیز ( عەبە هەولێری) – ئەمین ڕەواندوزی – شێخ نوری شێخ ساڵح – فائق بێکەس – مستەفا سائیب – کریم زانستی – شێخ تەییب – غنی شاڵی – کامل کاکەمین – عبدالله علی حکمت – ڕەشید عارف – عبدالله سعید – محمد بشقە فەیلی – مستەفا خۆشناو ( ئەفسەری شەهید) –

عـزت عبـدالعزیز ( ئەفـسەری شـەهید) – نـوری ئەحمـەد تاهـا ( بـرای کامـەرانی شاعیر) – تاهیر مەریوانی ( ت . ب . مەریوانی) – عبـد القـادر حـشمەت – فـائق مستەفا – شاکر سید حکیم و زۆری تر کە بەداخەوە لەم دەمەدا نایەنە بیرم.

ئەوانە لە ماڵی (ئەمین رواندوزی) یـا لـە دوکـانی وەسـتا (بەشـیر موشـیر) لـە بەرامبەر مزگەوتی حەیدەرخانە کۆ دەبوونەوە. دوو گۆڤاریشیان دەردەکرد.

لەناو ئەمانە قوتابییە هەولێرییەکان بازنەیێکیان لـە نـاو خۆیانـا رێکخـست کـە ئەمانە بوون.

عبداللە عزیز ( عەبە هەولێری ، هەر ئەوسا ئەم ناسناوەی لە خۆ نا) – عمـر أمـین – ئەمین رواندزی – سید غریب سید سلیم – عبدالمجید حسن– ابراهیم رشـید. و هی تریش.

ئەم کۆمەڵانە لە لایەن ناودارانی کوردی ئەوسا ( تۆفیق وەهبی و جمـال بابـان و جەلال بابان و معروف جیاوك ) ـەوە سەرپەرشتی دەکران. لە پاشان هـەموویان چوونە ناو حیزبی (هیوا) وە ).

عومـەر ئـەمین هونەرمەنـدێکی دەسـت رەنگـین بـوو لـە نیگارکیـشان و پەیکەرتاشـیدا. . لـەم بارەیـەوە د. وریـا دەڵـێ (بـاوکم هونەرمەنـدبوو دەسـتی نیگارکێشان و پەیکەرتاشیی هەبوو. بۆ تابلۆکانی هەرگیز بۆیەی بەکار نەدەهێنا.. بـەرد و چـەوی رەنگـاورەنگی لـە شـاخ و بەسـتەکاندا کـۆدەکردەوە و بـە هـاون دەیکوتی و لەگەڵ چـەمەنتۆی سـپی دەیکـرد بـە هـەویر و بۆیـە رەنگـەکانی پـێ دادەرِشـت.قەپێلکـە دار و و مـۆروو و زەنگیانـە و وردەجـام و ئاوێنـەی بـەکار دەهێنا..بیرمە هەموو ساڵ بەشداریی دەکرد لە پێشانگای ساڵانەی قوتابخانـەکان لە هەولێر . کارەکانی جێی سەرنج راکێشان بوون.لە ساڵی ١٩٥٧دا بوو مینـارەی ئەشبێلییای بـە تەختـە و مقـەبا و کاغـەزی چـوکلێتی رەنگـاورەنگ و زەنگیانـە و مۆری و ئاوێنە و...دروست کرد.ئەوسا ئێمە منداڵ بـووین بیرمـە هـەموو رۆژ کـە دەهاتـەوە چـوکلاتێکی زۆری دەهێنایـەوە بـۆ کاغـەزە رەنگاورەنگـەکانی

دڵمان زۆر خۆش دەبوو بەمە.بەرزیی منارەکە لە مەترێ زیاتر بوو.. دروست کردنی شەشحەوت مانگی خایاند.ئاواتمان ئەخواست ئەم کارەی قەت تەواو نەبێ تا هەمیشە ئەم هەموو چوکلاتە بخۆین. ئەمە وێنەیەکە لەو پێشانگایانە کە موتەسەریفی ئەوسای هەولێر لەگەڵ باوکما سەیری یەکێ لە کارەکانی دەکات....

باوکم زۆر حەزی لە چاندن بوو..زۆر بایەخی بە ژینگە ئەدا.. لە پۆلی چوارەمدا بووم لە عەنکاوە دەرسی (أشیا و صحەی ) پێ دەوتینەوە. زۆر جار باسی گرنگێتیی چاندنی بۆ ئەکردین و هانی ئەداین بەردەوام نەمام و گوڵ بچێنین.. ئەوەی زۆر چەختی لەسەر ئەکرد ئەوە بوو ئەیووت .. کە نەمامێ ئەچێنن ئەبێ تا خۆی ئەگرێ ئاگاداری بن و بیپارێزن. ئەگەر ئیستا بچیتە قوتابخانەی عەنکاوە لە چیمەنەکەیدا گەلێ دار و درەختی کالیتۆز و سنۆبەری بەرز ئەبینی .. ئەوە هەموو باوکم لە ساڵی ١٩٥٦ چاندوونێتی.. لە چاندنیان من یارمەتیم ئەدا و ئەچووم لە جۆگەکەی عەنکاوە بە پەقرەج ئاوم ئەهێنا و ئاوم ئەدان.باوکم سێ پارچە رەز و باغی هەبوو لە شەقڵاوە هەموو ساڵ بۆ سێ مانگ و چوار مانگ ئەچووین لەناو باغ و رەزەکانا هاوینمان بەسەر ئەبرد.. وەك سەپان و رەزەوان خزمەتی ئەکردن شینایی ئەچاند .. .لەو شتە سەیرانەی هەرگیز بیرم ناچێ ئەوەیە جارێکیان نەمامێکی سێوی بچوکی چاند نەختێ خوار بوو .. داوای لێ کردم کەدێکی راست لەو دار ئەسپیندارەی بۆ بێنم تا نەمامە خوارەکەی پێ ببەستێتەوە و راستی کات. دارەکەم بۆ ئامادە کرد و لەتەنیشت سێوەکەی چەقاند و لێی بەست.. ئەوەی سەیرە سێوەکە وشك بوو و ئەسپیندارەکە روا.. ئیستاش ماوە و پەلوپۆی گەیشتۆتە ئاسمان. جگە لەمە وەستا بوو ئەم خانووەی ئیستا تیایا ئەژین لە هەولێر لە ساڵی ١٩٦٠ دروستی کرد.. هەموو قاڵبی چەمەنتۆکان خۆی داینا و خۆی وەستایەتیی تیا ئەکرد. )

(بینینی تایبەت
٢٨/٥/٢٠١٠)

– لە وێستگەکانی ژیانی مامۆستا ( عمر أمین)

١٩٠٥ لە شاری هەولێر لە دایك بووە.

١٩٢٤/٩/١٣ مامۆستای سەرەتایی عەنکاوە

١٩٢٥/٨/١٨ بڕوانامەی ( دارالمعلمین الابتدائیە) ی لەغداد وەرگرتووە

١٩٢٥/٩/٢١ مامۆستای سەرەتایی لە کۆیە

١٩٢٧/٩/١ مامۆستای سەرەتایی لە قوتابخانەی ( اربیل الاولی )

١٩٢٨/٩/١٦ مامۆستای سەرەتایی لە شەقڵاوە

١٩٢٩/١٠/١ مامۆستای سەرەتایی لە کۆیە

١٩٣١/١٠/١ مامۆستای سەرەتایی لە قوتابخانەی ( اربیل الاولی )

١٩٣٣/١٠/١ مامۆستای سەرەتایی لە قوتابخانەی ( اربیل التانیە )

١٩٣٤/١٠/١ مامۆستای سەرەتایی لە باتاس

١٩٣٥/١٠/١ مامۆستای سەرەتایی عەنکاوە

١٩٤٦/٩/١ دەست لە کار دەکێشرێتەوە و دوور دەخرێتە مونتەفیك (ناسریە)

١٩٤٨/٢/٢٩ مامۆستای قوتابخانەی ( الفیصلیە) لە سلێمانی

١٩٤٨/١٠/٧ مامۆستای سەرەتایی مەڵکەندی لە سلێمانی

١٩٤٩/١١/٢٠ مامۆستای قوتابخانەی سورە درە لە سلێمانی

١٩٥١ مامۆستای قوتابخانەی ئیبن المستوفی لە هەولێر

١٩٥٣ – ١٩٦٠ قوتابخانەی عەنکاوە

١٩٦١ – ١٩٦٣ مامۆستای سەرەتایی گۆڤەندی ئێواران لە هەولێر(دوایێ رژێمی بەعسی ئەوسا ناوەکەی گۆڕی و کردی بە شیبان المسائیە). شایانی باسە کە مامۆستای پەروەردگار (ئاواز عومەر ئەمین) کە کچی مامۆستا عومەر ئەمینە ، ئەوە بیست و پێنج ساڵە مامۆستاو بەڕێوەبەری هەمان قوتابخانەیە (گۆڤەند).

:

مامۆستا عومەر ئەمین لە ١٩٦٤/١/٤دا کۆچی دوایی کرد و لە گۆڕستانی (ئیمام محمد) نزیک منارەی چۆڵی نێژرا





المملكة العراقية

شهادة الجنسية العراقية

رەگەزنامەی مامۆستا ( عومەر ئەمین )

لە ٨/ ١٠/ ١٩٤٠دا دەرچووە.



لە راستەوە بۆ چەپ أبراهیم رەشید ـ عبدالله عزیز – عمر أمین

بەغداد ۱۹۲۳



قوتابخانەی سەرەتایی عەنکاوە کە مامۆستا عومەر ئەمین ٧ ساڵ تیایا مامۆستا و بەڕێوەبەر بوو.

ئەم درەختانە هەموو مامۆستا عومەر ئەمین لە ساڵی ١٩٥٦دا چاندوونێتی.



لە راستەوە بو چەپ : دانیشتوان : عبد المجید حسن – غەریب سەلیم – عومەر ئەمین

وەستاوان : عبداللە عەزیز – فائق مستەفا

بەغداد ساڵی ١٩٢٤



گۆڕی بەهەشتی (عومەر ئەمین ) لە گۆڕستانی ئیمام محەممەد
د. وریا عومەر ئەمین لە نێوان گۆڕی دایك و باوکی

سەرچاوەكان

١- بەشیر حسین سعدی (٢٠٠٨) چەند بیرەوەرییەك دەربارەی مامۆستای خوالێخۆشبوو (عومەر ئەمین)
گۆڤاری (مێژوو) ژمارە ٦ , ل ٣٧٩ - ٣٨٢ .

٢- حمید ئەبوبەكر ئەحمەد. دیداری رۆژنامەی بەدرخان لەگەڵ پرۆفیسۆر د. وریا عومەر ئەمین

رۆژنامەی ( بەدرخان ) ژمارە (٦٦)ی ٢٢/٢/٢٠٠٦

٣- محمد عبدالله كاكە سوور(د.) (٢٠٠٤ ) گەشەكردنی خوێندنی فەرمیی لە لیواكانی كوردستانی عیراقدا لە ١٩٢١ تا ١٩٥٣ , نامەی دكتۆرا . زانكۆی سەلاحەددین.
٤- موحسین محەممەد حوسێن(د.) . دیمانە و لێپرسین لە ٦/٦/٢٠١٠
٥- مسعود محمد (١٩٨٦) گەشتی ژیانم. گۆڤاری رۆشنبیری نوێ ژ ١٠٩ ساڵی ١٩٨٦ ل ٢٨٠
وریا عومەر ئەمین (د.) (٢٩/٥/٢٠١٠) بینینی تایبەت.
٦- نژاد عبدالله عزیز ( ٢٠١٠ ) نامەیێك بۆ ئامۆزام د. وریا عومەر ئەمین .

سوپاسی ئەندازیار (ئازاد عومەر ئەمین) دەكەم كە فایلی باوكیی خستە ژێر دەستم.

# دهوك د سەردەمێن دیروکی دا

دیروکنفێس / کارزان محمد حسێن بامەڕنی
Karzan_bamerny@yahoo.com

دەڤەرا دهوکێ ژلایێ جوکرافی دکە ڤیتە باکورێ عیراقێ ودبیتە بارێزکە ها روژئافایا کوردستانا باشور جهە کێ سنوریێ پر مفا بخوڤە دکریتن جونکە سێ پارچێن کوردستانێ بیکڤە کرێدە تن ئە وژی (کوردستانا باشور وباکور وروژئاڤا) دیسان دە ڤە را دهوکێ یا ب کیشوە رێ ئە وروپاڤە سنوردارە وئە م شێن بێژین نێزیکی کێشوە رێ ئە فریقیایە بڤێ جە ندێ دیاردبیتن کو دهوك ژ دە ڤە رێن کرنکە ل روژهە لاتا ناڤین ودکە ڤیتە نافە راستا جیهانێ هە روە سان سروشتێ دهوکێ یا دە ولە مە ندە ب خێرو بیرێن سروشتی وە کی زنجیرێن جیایین بە رزو بلند وکوبیتکێن سە رتیژ کو خە لکێ دهوکێ مفا ژێ دیتیە وبکارئینایە وە ك جەبە ر وئاسیکە هـ دە مێ توشی هێرشێن دژوار بون ژلایێ نە یاران ڤە کو ئە ف جیا وکرێن مە زن ببونە ئاستە نك ورێکر بو دوژمنان دە مێ هە ولو و بزاڤا داکێرکرنا دە ڤە را دهوکێ دکرن دیسان دهوك کە لە کا زە نکینە ب سە رجاڤێن ئاڤێ مینا ریبارێن بوش ومە زن (دیجلە _زێێی مە زن وبجویك _خازر _ کومە ل ) ئە ڤە هە می دە ربازدبن دناڤ ئە ردێ ئاخا دهوکێ را زیدە بارێ جە ندین ریبارێن بجویك وب هزاران کانیێن زە لال وتە زی دزێتن دسە نتە رێ پارێزکە ها دهوکێ کو دبیتە ئە کە رێ هە بونا چاندنێ وشینبونا کیای بشێوە کێ زور ودارو بارێن خورستێن هە مە جور ودکە ل دارستانان کو دهە می وە رزێن سالێ دا ببە لکێن کە سك وشین دهێنە دیتن ودکە ل هە بونا کیانە وە رێن کیفی وکە هی برە نکە کێ بە ر

به لاڤ دناف سنوریَ ده ڤه ریَ دا , وئه سمانیَ دهوکیَ ب هزاران بالنده وباله فریَن بجویك ومه زن به ربه لاف بون ل هنداڤی ئه ردی دیسان ئاخا دهوکیَ زورا زه نکینه ژکه له ك جورێن کانزایی وه ك(ئاسن _گاز _قورقوشم _مس ..... وکه له کێن دی ) . بیَ گومان ئه ڤه هه می ئه گه رو هوکارێن سه ره گی بوینه گو حه زو ڤیانا مللە تێن که ڤن پالداینه قه ستا پارێزکه ها دهوکیَ بکه ن ولیَ جهواربن وشارستانیه تا خو لیَ ئاڤابکه ن وه کی (شارستانیه تا سومه ری _وئه که دی _بابلی_ میدی_ئاشوری_فارسی_رومانی) . دیسان دەوله تا راشدی و ئومه وی وعه باسی وئوسمانی وسه فه وی ومیرنشینێن کوردی بتایبه تی میرنشینا به هدینان . ویا ژهه میێ کرنتر ئه وه گو ده ڤه را دهوکیَ کورەپانا شه رو بێکدادنیَ بویه دناڤبه را ڤان ده ولت وشارستانیه تێن نافهاتی نوکه مه ئاماژه بێدای کو هه میا هه ولو بزاف کرن بهه می هێزو شیانێن خو دهوکیَ داکێربکه ن جونکه هه می سالوخه تێن ژیا نیَ لیَ هه نه (سه قایه کیَ فێنك وکونجای _ ئاڤه کا بوش _ئاخەگا ب مفا بوچاندنا ده رامه تێن خارنیَ وسروشته کیَ جان ورەنکاو رەنك ).

دهوك د دیروکا بەری زاینی دا

هه رچه نده ناڤیَ دهوکیَ دناف ژێده رێن دیروکیێن که ڤندا نه هاتیه نفێسین ئانکو لسەر لپنێن هه ریێ لیَ ئه ڤه نابیته گومنانەك لدەف دیروکڤانان وشینوارناسان بو نەبونا دهوکیَ دبه ری زاینی جونکه ب هزاران بەرمایکێن شینواری هاتینه دیتن ل دهوکیَ بشتی پشکنینێ که ڤناتیاوان دیاربوو ب کە لەك هزارسالان زڤریتن ژلاییَ سومەریا وئەکەدیا وبابلیا هاتینه دروستگرن , ل هزارا چاریَ وبینجیَ ب. ز مللە تیَ سومه ری ئاکنجیێن باکوریَ دولا دو ریباران بو (کوردستانا باشور) ئانکو ئەف دەڤەرا نوکە ئەم لیَ دژین یاخویایە گو سومه ری داهێنەرێن نفێسینیَ نه وهونه ریَ نه بده هان شینوارێن سومەریان ل

سنورێ پارێزکەها دهوکێ هاتینە دیتن گو نە خش ونیکارێن سومە ریان سەر هاتبونە نگراندن ونەخشاندن دکەل نفێسینا بزماری تێدا رونکرنەك دایە ژیانا خویا روژانە ل دەڤەرا دهوکێ ب ج شێوە رێڤەبریە , لێ سومەری هاتنە خارێ وبەرەف باشورێ میزوبوتامیا هاتن جونکە دەڤەرامە دوی دەمیدا سروسەرمایەکا دژوار وبە فرو بارنێن زور لێ دباین دیسان دەڤەرەکا جیایی بوو وزوربونا هژمارا خە لکێ سومە ری .

و ل هزارا سێ بەری زاینی دەولەتا ئەکەدی ل وەلاتێ ناڤبەرا دورییاران ئاکنجیبون تایبەتی دناڤبەرا سالێن (٢٣٧١ _ ٢٢٣٠ ب .ز ) وشیان هەمی بازێران و دەولەتکێن سومەریا داکیربکەن ب سەروکایەتیا سە رجونێ ئەکە دی وبازێرێ (ئەکەد) گرە پایتەختێ خو دکەڤیتە باشورێ عیراقێ وروژ بو روژێ دستهەلاداریا ئەکەدیا مەزن دبو تا کەهشتیە دەڤەرا دهوکێ وشیان دە ستێ خو داننە سە ر بهەمی هێزو شیانێن خوجونکە دهوك زورا کرنك بوو ج ژلایێ بازرکانی و ئستراتیژی کو دەڤەرەکا سنوریە ئەفجا ئە کە دیا ویستکەه وسەربازکەهێن سەربازی وبازرکانی دانان ل سنورێ پارێزکەها دهوکا نوکە ئەم لێ دژین , وژشینوارێن ئەکەدیا ل دهوکێ هاتینە دیتن ئەوژی پە یکە رێ برونزی یێ پاشا (نە رام سین) کو دبیتە نەڤیێ سەرجونێ ئەکەدی ل سالا ١٩٧٥ کوندێ باستکێ هاتیە دیتن ژنیشکەکێ ڤە ژلایێ کارکەران دەمێ مژیلی چێکرنا جادا سە رەکیا هاتن وچوناناڤبەرا دهوك _زاخو . دیسان ناڤەکێ ئەکەدی تانوکە ناسناڤێ تاخەکێ بازێرێ دهوکێ یە ئە وژی ناڤێ (نوهەدرا) کو رامانا وێ بزمانێ ئەکەدی ب مانا( مە زن وجانی ) دهێتن .

ولدە ستبێکا هزارا دووێ بەری زاینی ئاشوریان پێت خو ل وەلاتێ میزوبوتامیا دادان وبازێرێ (شرقات) کرەپایتەختێ خو ئەوا دکەڤیتە

سەرلێڤا ریبارێ دیجلە ل باکوری وبشتی دەمەکێ نەیێ درێژ ئاشوری شیان دەستێ خو دانەسەر دەڤەرا پارێز کە ها دهوکێ وسێ پایتە ختێن دی ئاڤاکرن دکەڤیتە نێزیك ودەوروبە رێن پارێزکەها دهوکێ وەکی (نەینەوا _نەمرود_ خورسباد) , ودەمێ بویە هزارا ئێکێ بەری زاینی ئاشوریان کەلەك پویتە وگرنکی دانە جوگرافیا دهوکێ وزالکە هەکا سەربازی ل دەرازینگا باژیرێ دهوکێ دانا ئەوا نوکە دبێژنێ تاخێ مالتایێ لێ ئاشوریان دکوتنێ (مالیاتی) راماناوێ دەرکەه یان رێکەك یان دەرازینکەك , جونکە جهێ جوکرافیا مالتایێ دکەڤیتە ناڤبەرا سێ جیایان ئەوژی جیایێ سبی زلایێ روژئاڤای وجیایێ زاوا ژلایێ روژهەلاتی وجیایێ گێلیا شەدایێ ژلایێ باکوری ودەمێ ملەتێن کەڤنێن ژباشورێ عیراقێ دهاتن تنێ ریکا مالتایێ دهاتنە ناف باژێرێ دهوکێ دا وشنیکا سێ کەلی هەلبژارتن داگو بچنە کوردستانا باکور نەتەوا ئورارتوێن کورد لێ دژیان ئەوژی ( کەلیێ بێسرێ _ گەلیێ دەرکەلا شێخ ئەحمە د _ وگەلیێ دهوکێ) , وژشینوارێن ئاشوریان تانوکە ل دهوکێ ماینە بێش چاڤان ئە وژی (گرێ مالتایێ _شکەفتا هەلامەتا _ خنس _شکەفتا ملامێرکێ) دیروکا ڤان شینواران دزڤریتن بو سە ردەمێ ئاشوریێ نێ دناڤبەرا سالێن (٩١١_٦١٢ ب .ز) حوکمداری کریە .

دەڤەرا دهوکێ تا سالا ٦١٢ ب .ز مالبن دەستێ دەولەتا ئاشوریا ودڤێ سالێ دا میدیێن کورد بسەروکاتیا (کەی خسرو) ودکەل دەولەتا کلدانیا بسەروکاتیا (نە بوبلاسەری) هێرشەکا گران ودژوار بدژی ئاشوریان رابون وپایتەختێ وان نەینەوا داکیرکر ودەولەتا ئاشوری هاتە شکاندن ودە ڤەرێن ئلشوریا هاتنە لێگفەگرن ناڤبەرا میدیا وکلدانیا ئەفجا پارێزکەها دهوکێ کەهشتە باهرا دە ولەتا میدیێن کورد وشینوارین میدیا تا نوکە ل دهوکێ ماین ئەوژی شکەفتا چارستێن ئەوا دگە ڤیتە کەلیێ دهوکێرا وتا سالا ٥٥٩ ب . ز میدیا حوکمێ خو ل دهوکێ

دکر جونکه دەولەتا ئه خمینیا فارسی بسەروکاتیا (کورشـی) هـەوەکا کـران ئینـا سەر میـدیا و هاتـه هـەلوه شـاندن ووسـه ردەمـەکێ نـی ل دهـوکێ دەستبیـچکر وکەفتـه بـن فـەرمانرەوایا فورسـێن ئـەخمینی بـو مـاوێ نێزیکـی دوسـەد سـالان بەردەوامبوو . و ژبەرمایکێن مللەتێ ئەخمینیا ل دهوکێ (سێ پەیکـەرێن دگـەڤری کولای) دکەڤنه نێزیکی دەرکەهێ ئامیدیێ , دیسان پرا دەلال دکەڤیته زاخو .

ولسالا ٤٠١ ب . ز سەرکردە ومێژونڤێسێ یونانی( زەینەفون) دەمـێ توشـی شکەسـتنێ دبیـت ل بـاژێرێ بـابلێ سـەرکردێ نـاڤبری دکـەل ١٠ هـزار شـەرگەرا دزڤریێن بو وەلاتێ یونانێ ودەمێ بێزیکی دەڤـەرا دهـوکێ بـو وتایبـەتی ل کـەلیێ زاخـو لەشـکەرێ کـوردان (کـاردوخی) هـاتن رێـك لێ کـرت وژهـەمی رەخانڤـه دورپێچکرن وهێرشەکا دژوار کرێ وشـیان کەلـەك ژلەشـکەرێ زەینـەفونی بکـوژن بتنێ ٥٠٠ جەکدارێ یونانی مانه ساخ وئەڤـەژی برەڤـاخورا نەگەهشتن ورەڤین تـا بسلامەتی گه هشتینه وەلاتێ خو یونانێ و ل وێرێ سەرکردێ یونـانی زەینـەفونی ئـەڤ رویـدانا جێبـوی ل کـەلیێ زاخـو نڤێـسینه دپـەرتوکا خویـا ب ناڤـدار (ئەناباسـیس) رامانـا وێ سـەرکەفتنا رێکـێ ژبـابلێ دا رێ و ب بێـان سـەرکەفتن تاکەهـشتینه وەلاتـێ یونـانێ , دیـسان زەینـەفونی کوتیـه کـو خـەلکێ دەڤـه را دهوکێ خودان سەربەخویەکا ئـازادبون و وان بخـو حـوکم ل خـودکر و دسـه ربـه خوبون .

وب هاتنا هەوێن شەرکەرێن ئسکەندەرێ مه قدونی بو دەڤـەرێن روژهـەلاتا نـاڤین سـالا٣٣٤ ب . ز وبـشتی جـەنکێن بـەردەوام شـیای دەڤـەرێن دەولـەتا ئـەخمینیا داکیربکـەتن ول شـەرێ کـوکمێلا ل دە شـتا هـەولێرێ سـالا ٣٣١ ب . ز شـیا سـەرکەفتنەکا مـەزن بدەسـتخوڤەبینیتن و ئـەخمینیا ژناڤبـه تـن بـسەرکردایەتیا شـاهێ فارسـی دارا یـێ ئێکـێ , وبڤـێ ئـەنجامی کەلـەك

دەڤەرێن مەزن کەفتنە بن دەستێ ئسکەندەرێ مەقدونی وبو ئمبراتوریەتەکا زورا مە زن , ودەمێ ئسکەندەر ل بازێرێ بابل دجیتەبەردلوڤانیا خودێ سالا ٣٢٣ ب . ز ج وێرس نەبون جهێ وی بکریتن وبیتە ئمبراتور , ئە ڤجا سێ سەرکردێن ئسکەندەری ئمبراتوریەتا وی دناڤبەرا خودا لێکڤەکرن دەڤەرا دهوکێ کە هشتە بەهرا سەرکردە (سلوقسی) وئەف قوناغە هاتە نیاسین ب قوناغا سلوقی بەردەوامبو تا سالا ١٤٧ ب . ز دەمێ دەولەتا فورسیا ژئیرانێ هێرش کریە کوردستانێ ودەڤەرا دهوکێ وشیان سلوقیا ژناڤببەن . و ئوشکانیا حوکم ل دهوکێ کر ئەفجا سەروکێن ئوشکانیا ئێمناهی وسە قامکێری پێشکێشی خەلکێ دهوکێ کر ئانکو حوکمێ دەڤەرێ کەفتە بن دەستێت سەروك هوزێن بنەمالێن دهوکیا . هەردیسان دەولەتا ئوشکانی وەلات کوردستانێ دابەشکرە سەرسێ بشکان بڤێ رەنکێ خارێ دیارکری

١_ هەرێما میدیا

٢_ هەرێما ئەدیابین دکەڤیتە ناڤبەرا هەردو ریباران زئێ بجویك وزئێ مەزن وبازێرێ هەولێرێ پایتەختێ ئەڤێ هەرێمێ بو .

٣_ هەرێما دهوك دوی دەمیدا دکوتنێ هەرێما کوردوئێن جو جارا ئەڤێ هەرێمێ خوشی بخونە بویە جونکە بەردەوام کەفتبو بەرهێرشێن رومانیان , دیسان شاهنشینا ئەرمینیا بسەرکردایەتیا (تیکرانی) ژ پایتەختێ خو میافارقینێ هەوێن کران ئینانە سەر هەرێما دهوکێ ، هەروەسان فارسان هەولدان هەرێما دهوکێ داکێربکەن , بڤێ جەندێ دیاردبیتن کو پارێزکەها دهوکێ دهاتە هژمارتن وەك کورەپانا شەرو بێکدادانێ وململانێ دناڤبەرا رومانیا وفارسا ژلایەکی وروماینا وئە رمەنیا ژلایەکێ دیڤە ول دوماهیێ سەرکردێ رومانی بناڤێ تراجان ٩٨ ب . ز تا ١١٧ ز حوکم کری و شیایە دەڤەرا دهوکێ داکێربکەتن .

دهوك ل ديروكا بشتی زايينی

ودەمێ بويە سالا ٢٢٦ ز دەولەتا ساسانيا ژئێرانێ هێرش كرە كوردستانێ وشيا دەڤەرا دهوكێ بێختە بن كونترولا خوڤە بەردەوامبو تا سالا ٦٣٧ ز دەمێ كەهشتنا هێزين لەشكەرێ بوسلمانان بسەروكاتيا عوتبە كورێ فورقەد هەروەكی ديروكڤان (بە لا زری ) ناڤێن هندەك دەڤەرێن دهوكێ دئينيتن دەمێ كەهشتنا لەشكەرێئيسلامێ وەكی ( معله (مالتا) وداسير _ داسن واتە دەڤەرا بە ركارەيە يان دەڤەرا ئەتريشێ يە ومەرەج (ئاكرێ) وبانهزرا .

هێزين ئسلامی رێكدا كوردان بسەربەخوبن و مێرنشينا ئاڤابكەن ئو لدەڤەرا دهوكێ مێرنشينەك هاتە دامەزراندن بناڤێ مێرنشينا داسنيا سالا ٩١٦ ز تا سالا١٢٣٦ ز وبارژێرێدهوكێ كرەپايتە ختێ خو و دەهەمان سالدا ئانكو ١٢٣٦ ز مێرنشينا شێخان لسەر بەرمايك وبنەمايێت مێرنشينا داسنيا دهوك كەفتە بن فەرمانرەوايا مێرنشينا شێخان تا سالا ١٢٦٢ ز دەمێ مێرنشينا بە هدينان هاتيە دامەزراندن ل بارژێرێ ئاميديێ حوكم ل دەڤەرێ كر تا سالا ١٨٤٢ مێرنشينا ناڤبری سەردەستێ ئوسمانيا هاتەروخاندن ودهوك بو سەنجەق سەر ويلايەتا ميسلێ ڤە ول سالا ١٨٥٠ دهوك بو ناحيە ولسالا ١٨٧٣ دهوك بويە قەزا سەر پارێزكەها ميسلێ ڤە ول رێكەفتی ٢٧ هەيڤا كولانێ سالا ١٩٦٩ دهوك بويە پارێزكەهەك لدويف داخازا سەركردێن شورەشا ئە يلولێ سالا ١٩٦١ وئێكەمێن پارێزكەهێ دهوكێ ( عەكيد سەديق ئاميدی ) بوو .

ول دوماهيێ يابێتڤی كوتنێ يە كو بو جارا ئێكێ ناڤێ دهوكێ هاتيە نڤێسين دناف بەرتوكێن ديروكيدا دزفريتن بو سالا ١٤٧٠ _١٤٧١ ز دپەرتوكا (دياربە كريە) ژلايێ ديروكنڤێس ئەبوبەكر ئەلتەهرانی بزمانێ فارسی دەمێ باسێ رودان و دەنك وباسێن سال١٤٤٦_١٤٤٩ ز ئەبوبە كر تەهرانی ديروكنڤێسێ

سولتانێ دەولەتا ئەق قوینلو یا تورکومانی بو دەمێ لەشکەرێ وی بەر ف دهوکێ هاتین وشەرەك کر ل جهێ تاخێ مالتا نوکە دژی لەشکەرێ روستەم موراد و عەلی قوجە حاجیس وسەرکە فتن بو بەهرا سولتان ئوزون حەسەنی .

ژێدەر

١_ اصدار محافظة دهوك _ دهوك بعد الحادي عشر من اذار ١٩٧٠
٢_محافظة دهوك _ دليل محافظة دهوك
٣_هاشم خضرالجنابي_ مدينة دهوك (الموصل , ١٩٨٥)
٤_مصدق توفي _ دهوك دنياسينه كا ديروكيدامجلة دهوك ,ع ٣٠
٥_ محمدصالح زيباري _دهوك عبرالعصورالتاريخية القديمة _ مجلة دهوك ع ١

## بەڵگەنامەی بڵاو نەکراوە

ئامادەکردنی : د. محمد عبداللە کاکە سور

ناو: جودت
ناو و نازناوی باوك : نافع ئاغا
گەڕەك : خانەقا
ساڵی لە دایك بوون : ١٩٣٤
شوێنی لە دایك بوون : هەولێر
ڕەگەزنامەی : کورد
سەر بە : عێراق
تێبینی جودت نافع ئاغا برای ڕەمزی نافع ئاغایە کە شۆڕشگێڕێکی گەورەی شاری هەولێر بووە.



بەکر صدقی لە نووسینگەی خۆی لە ساڵی ١٩٣٧

لە ئەرشیفی د. محمد عبداللە کاکە سور

چاپخانەی منارە - هەولێر